تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

# تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسییەکان

نووسینی

تۆماس سپراگێنز

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

فەرشید شەریفی

## تۆماس ئارتۆر سپراگێنز

# تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان

وەرگێڕانی لەفارسییەوە :

**فەرشید شەریفی**

ناوی کتێبە بەفارسی

فهم نظریەهای سیاسی، توماس سپریگنز، ترجمەء: فرهنگ رجایی،
چاپ سوم ۱۳۷۷. مؤسسەء انتشارات آطاه

Understanding Political Theory

by Thomas .A. Spragens

Translated by: Farshid Sharifi

# تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان

تۆماس ئارتۆر سپراگێنز

وەرگێڕانی : فەرشید شەریفی

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

www.roshnbiri.org

khanaywargeran@yahoo.com

- ناوی کتێب: تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان
- ناوی نووسەر: تۆماس سپراگینز
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: فەرشید شەریفی
- بابەت: فەلسەفە
- نەخشەسازی کۆمپیوتەر: نازەنین سالح
- نەخشەسازی بەرگ: سۆران عەبدوللا
- زنجیرە: ٩٠
- تیراژ: ١٢٥٠
- ژمارەی( ١٢ )ی وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی پێدراوە.
- چاپ: چاپخانەی کارۆ

ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بەو کەسەی کە ڕۆژانێکی زۆر گوێ

بیستی ئازارەکانم بوەو هاوخەمی دەردەدڵەکانم...

به شۆڕش جوانڕۆیی

# پێرست



## وتاری یەکەم

## وتاری دووهەم



## وتاری سێیەم

## وتاری چوارەم

## وتاری پێنجەم

## وتاری شەشەم

# نووسەر لەچەند دێڕێکدا

تۆماس ئارتۆر سپراگێنز، ساڵی ١٩٤٢ لە ئەمریکا لەدایك بوە. ساڵی ١٩٦٨ لە زانکۆی "دۆك"دا دۆکتۆرای وەرگرتووەو هەر لەهەمان ساڵیشەوە لەو زانکۆیەدا وانەی وتۆتەوەو ئێستاش بەردەوامە لەسەر وتنەوەی وانەکانی تیۆرە سیاسییەکان. سپراگێنز لە بواری تیۆری سیاسیدا چەندین کتێبی نووسیوە و ئێستاش سەرنووسەری گۆڤاری "سیاسەت"ە. لە نووسینەکانیدا داکۆکی لە قوتابخانەی سوننەتگەرایانی زانستی سیاسەت دەکا. لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە پێیان وایە کە بەمەبەستی خوێندنەوەی لقەکانی زانستی سیاسەت، دەبێ کەڵك لە میتۆدی مێژوویی، فەلسەفی و مرۆڤناسی وەربگیردرێت. پۆزیتیڤیستەکانیش کە بە خاڵی بەرانبەری ئەوان لەقەڵەم ئەدرێن، وێڕای ئاکارخوازەکان، لەو باوەڕەدان کە لە زانستی کۆمەڵایەتیشدا دەبێ کەڵك لە میتۆدی ئەزمونگەرانی وەربگیردرێت، چونکە ئەوشتانەی کە لەسەر شتە بابەتی و ئەزمونییەکان رانەوەستابن بایەخی زانستییان نییە.

سپراگێنز لەم کتێبەدا و لە کتێبەکانی تریشیدا ئەوەمان پێدەڵێ کە زانستی کۆمەڵایەتی لەسەداسەدی ئەزمونیی بوونی نییە و لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمەکانی گەورە نووسەرانی ئەندیشەی سیاسی، یەکجار زۆر بەکەڵکی مرۆڤی ئەمڕۆ دێن. شێوەی لێکۆڵینەوەکانی سپراگێنز، ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشێت کە باشتر رەهەندە قورسەکانی ئەندیشەی سیاسی دەرك بکات.

زانکۆگەلێکی زۆر لە جیهاندا وەك کتێبێکی دەرسی، لە پۆلەکاندا کەڵك لەم کتێبەی سپیراگێنز، وەردەگرن لەوانە لقی زانستی سیاسی زانکۆکانی ئێران. هەربۆیە بە پێویست دەزانرێ وەك سەرچاوەیەك بۆ خوێندنەوەی تیۆرگەلی سیاسی لەبەردەستی خوێنەری کورددا هەبێت" چونکە تێگەیشتن و دەرك پێکردنی تیۆرە سیاسییەکان، هەنگاوێکە بۆ سەقامگیرکردنی دایلۆگی کۆمەڵایەتی.

دواجار، جێی خۆیەتی ئاماژە بەخاڵێك بدەین، کەسەرچاوەی فارسی ئەم کتێبە لەبەردەستی خوێنەرانی کورد زمانی بەرێزدایە، دوو پێشەکیی وەرگێڕی فارسیەکەی تیایە کەیەکەمیان بۆ چاپی دووەم و دووەمیان بۆ چاپی یەکەمی نوسیون، لەبەرئەوەیی هیچ کامێکیان بەهایەکی زانستی و تیۆری وایان نەبوو بەپێویستمان نەزانی ئەوان وەربگێڕین و لەتوێی ئەم کتێبەدا بڵاویان بکەینەوە.

**فەرشید شەریفی ــ پاوە ــ ٢٠٠٢**

# پێشەکی

تیۆرە سیاسییەکان، لای زۆربەی ئەو کەسانەی کە خەریکی خوێندنەوە، یان وتنەوەیانن، شتێکی ئاساییں و گرنگییەکی ئەوتۆیان لایان نەماوە. ئەوان دەزانن کە تیۆرە سیاسییەکان، پیشاندەری رەنگدانەوەی هەندێ لەو زەینە مۆڵئەندێشانەن کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو مەسەلە گرنگانە ئەکەن کە هەموو مرۆڤێك رووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەوان دەرکیان بەوە کردووە کە بەبێ کەڵك وەرگرتن لە چەمکەکان و هەروەها رێساوچوارچێوەکانی ئەندیشەی سیاسی پێشینان، ناتوانین بە ئاسانی لە سەرگەردانی و پشێویەکانی بارودۆخی ئەم سیاسی سەردەمە هاوچەرخ تێ بگەین.

ئەوان هەروەها دەرکیان بەو زەرورەتە کردووە کەئەبێ راستەوخۆ بگەرێینەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکیی تیۆرە سیاسییەکانەوە. چونکە بە خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەك لە تیۆرە بەرجستە سیاسییەکان، ناتوانین دەرك بە یەکپارچەیی و لێکهەڵپێکراوی (انسجام) و گرنگیی تیۆرسازیی سیاسی بکەین. ئەو جۆرە هەڵبژاردانە، لەڕاستیدا رەنگە بە کۆمەڵێك لە نووسینە شەخسییەکانی پێشینان لە قەڵەم بدرێن. بەواتایەکی دیکە، ئەوانە نموونەگەلێکی هەڵبژاردەی وتارو، نامیلکەو قسەو باسە ئەو نووسەرانەن کەبە شێوەی جۆراوجۆر دەرئەبڕدرێن.

هەڵبەت، لێکۆڵەرەوەی چالاك، سەرەنجام ئەم پشێوی و سەرگەردانی و جیاوازییە ڕواڵەتییانە تێئەپەڕێنێت و لەچەندوچوونی مەسەلەکەش تێئەگات. بەڵام بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە هەروا کارێکی ئاسان نییە، بە تایبەت کە سەرمەشقە دیاردەناسی و متافیزیکییەکانی ئەم سەردەمە، کە توانایییەکی یەکجار زۆریشیان هەیە، ئەم کارەیان دژوارتر کردووە.

نووسەر هەوڵی داوە ئەم نووسینە، کە بە شێوەیەکی گشتی توێکاری؟ لە تیۆرە سیاسییەکان دەکا، بۆ هەموو ئەو خوێندەوارانەی کە حەزیان لە بابەتی ئەندیشەی سیاسییە، ئاسان بێت و بە ئاسانی تێیبگەن. مەبەست ئەوە بوە کەبابەتەکان سەرەڕای سادەبوونیان، خوێنەر هیلاکوماندوونەکەن و لەهەمانکاتدا کە رەسەنایەتیشیان بپارێزرێت، وەڕوخەری بیرکردنەوەیەکی تایبەت نەبن.

کاتێك دەتوانین قسە لەسەر سەرکەوتنی ئەم کتێبە بکەین کە بزانین لە فێرکردنی تیۆرە سیاسییەکاندا چ ڕۆڵێکی ئەبێت و تا چەند خوێنەر تێئەگەینێت. چونکە تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسییەکان، گرنگترە لەوەی کە تەنها کتێبەکانی فەلسەفەی سیاسی بخوێنینەوە و هیچیتر. تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسییەکان، ڕێگایەکە بەرەو ژیانی تاقیکراوەی تاکەکەسی و هەنگاوێکە بۆ دامەزراندنی گوتارێکی کۆمەڵایەتی کە خۆی لە خۆیدا گرێدراوە بەبوونی کۆمەڵگایەکی ئازادەوە.

**تۆماس. ئا سپراگێنز**

## وتاری یەکەم

### دەسپێک:

# سیاسەت و تیۆرە سیاسییەکان

دەستەواژەی "تیـۆرە سیاسـییەکان" واتـای جۆراوجـۆری هەیە. ئەمڕۆ، زانستی سیاسەت وەك بینایـەکی چەند نهۆم وایـە. هەرکام لە نهۆمەکان، یان بەشەکانی زانستی سیاسەت، بەجۆرێك لەجۆرەکان پێوەندییان بە "تیۆر"ەوە هەیە. ئەو کۆمەڵە لـە تیـۆرە سیاسـییەکان، کەلـەم کتێبـەدا لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر دەکـرێ، بـە بیروڕای هەندێ کەس، بە "تیۆری گەلی نۆمارتیڤ"و، بە بیروڕای هەنـدێکی تـریش بـە "فەلسـەفەی سیاسـی" لـە قەڵـەم ئـەدرێن. بەوتەی پرۆفیسۆر "شلدۆن ڤۆلین" تەنانەت دەشێت بتـوانین ئـەو تیۆرانە بە تیۆریگەلێکی "حەماسی" ناودێر بکەین.

ئەگـەر بمانـەوێت بـە باشـترین شـێوەو بـە کـەڵك وەرگـرتن لـە هـەر چـەمکێك، نـاوەڕۆکی ئـەم کتێبـە دەسنیشـان بکـەین، [ئـەبێ بڵێین کە] ئەو تیۆرەسیاسییانەی تیایداخراونەتـەڕوو، هـەمان ئـەو بابەتانەیەکـە لـەناو دەستنوسـە کلاسـیکەکانی وەك "کۆمـار"ی

ئـەفلاتوون، "لویاتـان"ی تۆمـاس هـۆبس، هـەروەها "پـەیمانی کۆمەلآیەتی" رۆسۆدا بەرچاو دەکەون. ئەم شاکارانە ئەیانەوێت وێنایەکی کامڵ و یەکپارچە لە ژیانی سیاسی بە دەستەوە بدەن. وشەی یۆنانی "تیۆریەن" کە وشەی "تیۆری" لـەوەوە وەرگیراوە، بەواتای "روانین، سەرنج دان و تێ ڕامان"ە. ئەمە هەر ئەو کارەیە کـە هزرمەنـدە گـەورەکان و کەسـانی تـری وەك ئـەوانیش، کـە چـەندین سـەدە قسـەیان لەسـەر تیـۆرە سیاسـییەکان کـردووە، داوایان لـە مرۆڤ کـردووە ئـەنجامی بـدەن. ئـەم هزرمەندانـە، مرۆڤ فێری جۆرە تێڕوانینێك ئەکەن کە ئەمە واتاکەیەتی: "وێنایەکی هێماییە لـە گشـتێکی سیسـتماتیك". ئـەوان سـەبارەت بـەدنیـای سیاسـەت ــ کـە مـرۆڤ ناچـارە تیایـدا بـژێت ــ تێـڕوانین و تێگەیشتنێکی هەمەلایەنە ئەخەنەڕوو.

## ئامانج و ئامراز لەسیاسەتدا

بەشێکی گرنگی زانسـتی سیاسـەتی هاوچەرخ، لێکۆڵینـەوە لەسەر دەسەڵات و هێز ئەکات. زانسـتی سیاسـەت لـە وەڵامـی ئـەم پرسـیارە کـە ئـەڵێ "چ کەسـێك حکوومـەت ئـەکات؟" ڕێگـە جۆراوجۆرەکـانی بڕیـار دەرکـردن ڕاڤـە ئـەکاتو هـەوڵ ئـەدات کـە سەرچاوەکان و چۆنیەتی دەرکردنـی بڕیـارە سیاسـییەکانی نـاو کۆمەڵـگا بدۆزێتـەوە. بەوتـەی "دێڤـد ئەسـتۆن" ئـەرکی زانسـتی سیاسـەت ئەوەیـە کـە "بـەهاکان بـە شـێوەیەکی ئامرانـە لـە نـاو

کۆمەڵگادا دابەش بکات". هەروەها "هارۆڵدلاسڤێل" ڕاشکاوانە دەڵێ "زانستی سیاسەت، لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە دەکا کە" کێ ئەبات، چی ئەبات، کەی ئەباتو چۆن ئەبات؟" خوێندنەوەی ڕەوتی بڕیاردەرکردن، هەم سەرنج ڕاکێشەو، هەم گرنگیشە. هیچ کەسێ ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە بە تەواوەتی کۆمەڵگا دەناسێ، مەگەر ئەوەی کە تێگەیشتنیکی دروستی هەبێت سەبارەت بە بەرنامە و ڕەوت و تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسانەی کە بڕیارە سیاسییەکانی ئەو کۆمەڵگایە دەرئەکەن. هەر لەبەر ئەوەشە کە "کۆمەڵناسیی دەسەڵات" بەشێکی زۆری خوێندنەوەکانی زانستی سیاسەت پێکئەهێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، سیاسەت چەندجۆری هەیە و تەنها بە واتای ململانێکردن بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات نییە. ئەگەر بڕیار بێت ئەو کۆمەڵگایەی لێکۆڵینەوەکەی لە سەر دەکرێ، دۆخی "جەنگی هەموان لەگەڵ یەکتریدا" تێ بپەڕێنێت،ئەوا لەوکاتەدا سیاسەت، شتێکە لە سەرووی "ململانێکردن بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات". هەروەها کۆمەڵگای سیاسی، چوارچێوەیەکە بۆ ئەو پێوەندییە سیستماتیکانەی کە تیایاندا تاکەکان، پێکەوە دەژین و داواکاری و پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانیان جێبەجێدەکەن. بە کورتی، کۆمەڵگای سیاسی تەقەلایەکی مەبەستمەندی مرۆڤییە کەهەر تەنها ڕووداو، یان دیاردەیەکی ئاسایی نییە. کۆمەڵگای سیاسی، دەسکردی

ئاگایی مرۆڤە، کە بەمەبەستی بەئەنجام گەیاندنی ئامانجە گرنگ و پراکتیکییەکان دائەمەزرێت و بەڕێوە ئەبرێت.

دوائامانجەکانی سیاسەت، لە پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤایەتییەوە سەرچاوە دەگرن. تەنانەت درێژەدان بەژیان لەم دنیایەدا، پێویستی بە هەوڵوتەقەلای رێکخراو هەیە. پێکهێنانی جۆرە ژیانێک کە مەبەستی هەر تەنها "مانەوە" نەبێت، هەرچی زیاتر پێویستی بە رێکخستنی دەزگا ئاڵۆزە سیاسییەکان هەیە. تاکەکانی مرۆڤ بە مەبەستی رزگار بوون لە بەڵاسروشتییەکان و هەروەها دەسدرێژیکردنی مرۆڤەکانیتر، داوای ئاسایش دەکات. ئەوان پێویستیان بە خواردەمەنی، پۆشتەمەنی و خانووهەیە. ئەوان هەروەها بەرادەیەکی کەمتر لە پێداویستییە زەروورییەکان، پێویستیان بە کەرەسەگەلێک هەیە کە بەهۆی ئەوانەوە، توانایییە مرۆڤییەکانیان بخەنەگەڕ و گەشەیان پێبکەن. بۆ نموونە، ئەوان پێویستیان بە شێواز گەلێک هەیە بۆ بەدەستهێنانی شوناس و دۆزینەوەی هاوڕێ.

هیچ پێویستیەکی مرۆیی بە تەنها بە "ئارەزووکردن" نایەتەدی. مرۆڤ لە بەهەشتی بەریندا ناژی تا سروشت هەموو داواکارییەکانی بۆ جێبەجێبکات. مانەوە و پێشکەوتنی مرۆڤ، پەیوەستە بە هەوڵ و تەقەلاکانی خۆی. مرۆڤەکان دەبێ بە یارمەتی مێشک و هەروەها دەستەکانیان، دەزگاگەلێک

دابمەزرێنن کە ئەو توانایەیان پێ ببەخشێت تا ببنە "بوونەوەرێکی شارستانی".

بەم پێیە بێ کەواتە ئامانجەکان و کارکردەکانی کۆمەڵگای سیاسی، جۆراوجۆرو فرەچەشنن: لە بنەڕەتدا ئەرکی سیستمی کۆمەڵایەتی، ئەوەیە کە پارێزگاری لەئەندامەکانی خۆی بکات. واتە دەبێ سەلامەتیی گیانی ئەندامەکان مسۆگەر بکرێت. هەروەها سیستمی کۆمەڵایەتی ئەبێ بە شێوەیەك هەوڵ بدات دەسڕەنجی کاروچالاکی تاکەکانی بپارێزێت. بەرتەسکترین زەیینیەت و تێگەیشتن لەسەر کۆمەڵگای سیاسی، ئەبێ لە خۆگری (شامل) ئەو شتە بێت کە جۆن لۆك، بە "پاراستنی گیان و ماڵ و ئازادی" ناودێری ئەکات. جیالەوەش، لەناو زۆربەی کۆمەڵگا مرۆڤییەکاندا، سیستمی بەرهەم هێنانی ئابووری — بەرهەم هێنانی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان - پێویستی بە هەوڵ و تەقەلایەکی بەکۆمەڵی سیستماتیك هەیە. هەر بۆیە پێویستە بەمەبەستی بەرهەم هێنان و دابەش کردنی سەروەت وسامان دەزگاگەلێك دابمەزرێنرێت. دامەزراندن و رێکخستنی ئەمجۆرە دەزگا ئیدارییانە، یەکێك لە ئەرکە سیاسییە گرنگەکان. هەر بەو شێوەی کە تیۆرسێنەکان لەسەردەمی ئەرەستۆوە تا سەردەمی مارکس پیشانیان داوە، بوونی ئەم جۆرە دەزگایانە، بۆ ژیان و حکوومەتکردن لەناو هەموو سیستمێکی سیاسیدا یەگجار پێویستە.

لە ئاستێکی باڵاترو ئاڵۆزتردا، کۆمەڵگای سیاسی چوارچێوەیەك دەستنیشان دەکا کە ماناو بایەخ بەژیانی تاکەکانی دەبەخشێ. کۆمەڵگای سیاسی، جۆرە ڕێکخستنێکی مرۆیی ئەخاتە جێی بێسەروبەرەیی و پشێویەکان. کۆمەڵگای سیاسی وەك درامایەك وایە کە بۆ هاوڵاتیانی خۆی، ڕۆڵ دیاری ئەکات. خەڵکیش بە پێی ئەو ڕۆڵانە مانا بە ژیانی خۆیان دەبەخشن. بەوتەی یەکێك لە تیۆرسێنە سیاسییە هاوچەرخەکان، کۆمەڵگای سیاسی، "دنیایەکی بچووك، یان مەنزوومەیەکە کە لەناوەوەو بەهۆی ئەو تاکە هەمیشە داهێنەرانەی کە کۆمەڵگای سیاسی بە ئامرازێك دەزانن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، مانا پەیدا ئەکات".

کۆمەڵگا سیاسییەکان فەلسەفەی بوونی خۆیان - ئامانجە سەرەکی و بونیادییەکان ـ بەتەشریفاتێکی زۆرەوە نمایش ئەکەن و پۆلێنیان ئەکەن. ئەندامانی کۆمەڵگایەك، بەوتنی سروودی میللی، سوێندی وەفادار بوون بە ئاڵاو هەروەها ڕێزگرتن لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵگای سیاسی، پشتیوانی خۆیان لەو ئامانجە هەرە گەورانەی کە کۆمەڵگا خوازیاریانە، دەرئەبڕن. لە هەندێ کۆمەڵگادا ئەم ڕێوڕەسمانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە. قوتابخانەکان، چاپەمەنییەکان و یانەهونەرییەکان هەوڵ ئەدەن ئامانجەکانی کۆمەڵگا لە ڕێگەی بەرنامەکانی خۆیانەوە بەخەڵکی ڕابگەینن. لەناو ئەو کۆمەڵگایانەی کە دیکتاتۆریەتی

ڕەها باڵا دەستە، ئەم هەوڵانە تاڕادەیەك ڕێكوپێك و هەماهەنگ ئەکرێن، تاکوو بە یەك دەنگ و بەیەك ڕەنگەوە ئاراستە بکرێن. تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە پلووراليزم بە سەریاندا زاڵە، بوونی کۆمەڵگا، نەك تەنها لە ڕێگەی ڕێکخراوە ڕەسمییەکانەوە، بەڵکوو بەهۆی هەستی نیشتمانپەروەری خەڵکی‌یەوە ــ کە لەشێوەی سروودی کی‌بەرکی‌ وەرزشییەکاندا دەرئەکەوێت ــ بە حەزو تاسەیەکی زۆرەوە شانازی پێوە ئەکرێت.

## ئامانج و گونجاوی تیۆرە سیاسییەکان

کۆمەڵگا سیاسییەکان، وەك هەموو ئەو دەزگایانەی کە بە دوای ئامانجێکی دیاریکراوەوەن، دەشێت سەرکەوتن بە دەست بهێنن، یان شکست بخۆن. ئەوان، یان بە ئامانجەکەیان ئەگەن، یان بە خراپترین شێوە ئەڕووخێن. کۆمەڵگای سیاسی بەدابین کردنی ئاسایش، پێشکەوتن، دادپەروەری و هەروەها دابین‌کردنی شەخسییەتی تاکەکەسی بۆ هەموو تاکەکانی، دەشێت ژیانیان بگەینێتە باشترین ئاستی خۆی، یان لە جی‌بەجی‌کردنی ئەو ئەرکانەدا، سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت و ژیانی تاکەکانی وەك دۆزەخێك لی‌بکات و، تووشی بەدبەختی، خوێن ڕشتن، ستەم و هەستی پوچیان بکات.

وتمان ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان، فەراهەمکردنی "تێڕوانینی هەمەلایەنە"یە لەسەر کۆمەڵگای سیاسی. تیۆرسێنی

سیاسی هەوڵ ئەدات سیاسەت بخاتە پانتاییەکی بەرفراوانەوەو پاشان، "وێنایەکی کامڵ" لە سیاسەت بخاتە بەردەستی موخاتەبەکانیەوە. ئەو، بە تایبەت لەرێگەی لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتگەلێکی وەك سروشتی مرۆڤ و تایبەتمەندییەکانی دیکەی جیهانی دەوروبەری، ــــ کە وەك کەرەسەیەکی خاون بۆ خوێندنەوەکانی ـ سیاسەت وەسف ئەکات.

تێڕوانینێکی هەمەلایەنەی لەوجۆرە، هەم تەوسیفی یە، هەم نۆرماتیڤ (normative) تیۆری سیاسی لە رووی تەوسیفییەوە، گرنگترین ئەکتەرەکان، هۆکارەکان و ئەو چوارچێوانەی کە ژیانی سیاسی ئەهێننە ئاراوە، دەس‌نیشان دەکا. جیا لەوەش پێوەندییە بنەڕەتییەکانی نێوان ئەو دیاردانەی کە دەستنیشانی کردوون، روون دەکاتەوە. بۆ نموونە، تیۆری مارکسیستی، "هێزە ئابوورییەکان" و تێزەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکان" پیشان ئەدات و پێیوایە کە، لە ریزی گرنگترین پرۆسە سیاسییەکاندان. ئازادیخوازەکانی سەردەمی رۆشنگەری، هێزە زانستییەکان و هەروەها بیرکردنەوەیان بەهاندەری پێشکەوتنی مرۆڤ لە قەڵەم ئەدا. تۆماس هۆبس، ئەفلاتوون، ئەرستۆ (وەئەوانی دیکەش) راڤەکارییەکی زۆریان کردووە سەبارەت بە کاریگەریی هەست و نەست و فرەخوازییەکانی مرۆڤ لەسەر سیاسەت. جرمی بێنتام و جیمز مەدیسۆن، بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر ئامانجی سیاسەت، رۆڵی یاسادانان و

سیستمی "دەستوری" ئەخەنە بەر ڕاڤە و لێکۆڵینەوە. گەڵاڵەی گشتی هەموو تیۆرێیەکی سیاسی، وەسفکردنی هەمەلایەنەی ئەو هەموو "کار" و "کاردانەوە"یەیە، کە لەسەرووی هەراوهوریاکانی سیاسەتدایە.

ئاساییە کە ئەم جۆرە وەسفکردنە هەمەلایەنەی چالاکییەکانی مرۆڤ، بەهۆی بەربڵاوی و بەرفراوان بوونیەوە، ڕەهەندێکی گرنگی نۆرماتیڤیشی هەیە. ئەو دیدگا سیاسییەی کە تیۆرە سیاسییەکان دەیخەنەڕوو، ئاسۆیەکی بەرفراوان لە زانیاریگەلێکی بێلایەن نییە، بەڵکوو ڕەنگدانەوەیەکە لە ڕێکخراوی یان پشێوی، سەرکەوتن یان شکستێکی دڵتەزێن، هاریکاری کۆمەڵایەتی یان جەنگ، پێشکەوتن یان لێکهەڵوەشانەوەن. تیۆرسێنی سیاسی بەخستنەڕووی وێنایەکی گشتی لە سیاسەت، ئەو توانایە بە مرۆڤ ئەدات کە بزانێت کام یەك لە دەزگاکان و ڕەفتارە سیاسییەکانی، وێرانگەر، ناکامڵ، بێ ئەقڵانە، یان نالۆژیکین. بۆ نموونە، ئەرستۆ ئەوە پیشان ئەدات کە هەرکاتێك بەبێ لەبەرچاوگرتنی فەرهەنگی کۆمەڵگایەك، هەندێ دەستوری بۆ دابڕێژرێت، ئەگەرێکی زۆر لە ئارادایە کە ئەو کۆمەڵگایە شکست بخوات. ئەفلاتوون ڕاست نەکردنەوەی هەواو داخوازە دەرونیەکانی ، بەشتێکی مەترسیدار لە قەڵەم ئەدات. هۆبس کێشەکانی پێڕەوی کردنی ئەو داخوازە کورتبینانەی پیشان ئەدات کە بیر لەو کارەساتانە ناکەنەوە

کەدەشێ دواجار لێیان بکەونەوە، مارکس نالۆژیکی بوونی "کالاپەرستی" روون دەکاتەوە، دواجاریش مەدیسۆن ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەگەر حکوومەت بە تاکێك بسپێردرێت، چ ئاکامگەلێکی خراپی لێدەبێتەوە. تیۆری سیاسی، بە لەبەرچاوگرتنی زەمینەی گشتی پێداویستییەکان و تواناییەکانی مرۆڤ ـ کە پێش هەمووشتێك لە سیاسەتەوە سەرچاوە دەگرن ـ بوار بۆ ئەوە ئەڕەخسێنێت کە کاروبار و هەروەها پلەوپایە سیاسییەکان بە شێوەیەکی ئاقلانە داوەرییان لەسەربکرێت. هەروەها دیدگایەك دێنێتە ئاراوە تا لە رێگای ئەو دیدگایەوە، بزانین چی ئەکەین و کارەکانمان چۆنن؟

کەواتە، تەواو ئاشکرایە کە تیۆرە سیاسییەکان، تەنها حەزو ویستێکی وانەیی و زانکۆیی نین، بەڵکوو بە تەواوەتی پێوەندییان بە بابەتە کردەیی و رۆژانەکانی سیاسەتەوە هەیە. راستە کە تیۆرسێنی سیاسی، تارادەیەك بۆ تێرکردنی داخوازە شەخسییەکانی خۆی ـ واتەبۆ تێگەیشتن لەو جیهانەی کە تیایدا دەژی ـ دەنووسێت، بەلام تا رادەیەکی زۆریش بۆ قازانج و کەڵك وەرگرتنی موخاتەبەکانی خۆی دەنووسێت. تارادەیەك هەموو تیۆرسێنە سیاسییەکان، ئاگاداری ئەوەن کە ئەگەر خەڵك گوێ لە رێنماییەکانیان بگرێت، بارودۆخەکە باشتر دەبێ. بۆ نموونە، هۆبس ئەڵێ "ئەم حەقیقەتە تیۆرییە، بگۆڕن بە حەقیقەتێکی پراکتیکی". کەواتە ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان ئەوەیە، وا لە

جیهانی سیاسەت بکەن کە بەئاسانی تێی بگەن، تاکو لەو ڕێگەیەوە بەرەو ڕێگەی ڕاست ڕێنمایی بکرێین. لە سیاسەت، نەقشەیەکی جوغرافیاییمان بۆ ئەکێشێت تا پێمان بڵێ لە کوێین چ ڕێگایەك ئەمانگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە مەبەستمانە؟

هەندێ لە تیۆرسێنەکان لەو باوەڕەدان کە مرۆڤ بە پێڕەوی کردنی وتە حەکیمانەکانی ئەوان، دەتوانێ کێشمەکێش و نەداری و هەژارییە کۆمەڵایەتییەکان لەناو بەرێت و سیستمێکی ڕێکوپێك و لەباری سیاسی بهێنێتە ئاراوە. ئەو کەسانەش کە کەمتر گەشبینن، ئومێدەوارن کە تێگەیشتنی سیاسی، بەلانی کەمەوە لە ژمارەی کارەساتە "بالقوە"کان کەم بکاتەوە. بۆ نموونە، هۆبس کە بەگشتی دیدگایەکی سیاسی ڕەشبینانەو تراژیدیانەی هەیە، لەو باوەڕەدایە کە تیۆرە سیاسییەکانی ئەو، ئێمە لەو ژیانە ڕزگار ئەکات کە "تەنیا، بێ ئەنوا، ناشیرین، دڕندەوکورت"ن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە تیۆرە سیاسییەکان، تێڕوانین گەلێ سەبارەت بە سیاسەت ــ وێناگەل سەمبولێکی لە گشتێکی سیستماتیك ــ ئەخەنەڕوو. ئەوانە لە ناو ئیستعارەگەلێکدا شاراونەتەوە کە لەبەشێکی زۆری کتێبە کلاسیکەکاندا بەرچاودەکەون. جیالەوەش، زۆربەی ئەم ئیستعارانە بە دەستەواژەگەلێك بەیانکراون کە گرنگیی کردەیی ئەو تیۆرانە پیشان بدەن. ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان، سڕینەوەی ئەو کەمو

کورپیانەیە کە زۆربەی کات لە سیاسەتدا دەبینرێن و رەنگە هەندێ ئاکامی خراپیان لێبکەوێتەوە. موناجات نووسەکان لەو باوەڕەدان کە ئەگەر "تێڕوانین" نەبێت،لەناوچوونی خەڵك شتێکی حەتمییە. زۆربەی تیۆرسێنەکان دەتوانن ئەم ئامۆژگارییە بکەن بە دروشمی خۆیان.

بۆ نموونە رەنگە مرۆڤ بە هۆی (کورتبینییەکی) لەڕادەبەدەرەوە، تووشیچەرمەسەرییە سیاسییەکان بێت. سەرقاڵ بوون بەداواکارییەکان و کێشە زەروورییەکان، هێندە مرۆڤ لە "دوور ئەندێشی" دوور ئەخەنەوە، تا دەرفەتەکە لەکیس بچێت. مرۆڤ بە پێداگرتن لەسەر بەدەستهێنانی ناوبانگ و سامانی تاکەکەسی، یان رەنگە بە هۆی کەمتەرخەمییەوە، ئەوەش کە بەدەستیهێناوە لە دەستی بدات. رەنگە تاکەکان بە هۆی بەدواداچوونی داخوازیە تاکەکەسییەکانیان و بایەخنەدان بە ئاکامی کردەوەکانیان، ببنە هۆی سەرهەڵدانی شەڕەناوخۆییەکان و هەروەها ئاژاوەو پشێویگەلێکی سیاسیی رووخێنەری سیاسی. بیرکردنەوەیەکی قووڵ و دروست کە بتوانێت وێنایەکی کامڵ بەدەستەوە بدات، رەنگە رێگری لەبەردەم روودانی ئەو جۆرە کارەساتانەدا بکات. کتێبی "لویاتان"ی تۆماس هۆبس کە بە "شاکاری فەلسەفەی سیاسی بە زمانی ئینگلیزی" لە قەڵەم دراوە، بەلای کەمەوە ئامانجێکی وای هەبوو. ئەو، ئومێدەواربوو کە بە هۆی تیۆرە سیاسییەکەیەوە، کە بە "زانستی ئاکارو

مەدەنییەت" ناودێری کردووە، ئەو مەسەلە بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەو ئەڵێ:

مرۆڤایەتی بەحوکمی غەریزە، "زەڕەبین" گەلێکی هەیە (مەبەست داواکارییەکان و خۆپەرستییەکانە) کە لە رێگەیانەوە هەموو خۆبەختکردنێك ئەگۆڕێت بەنارەزاییەکی گەورە. بەڵام ئەو "زەڕەبین"انەی نییە (واتە زانستی ئاکار و مەدەنییەت) تا بە هۆی ئەوانەوە بزانێت کێشەکانی مرۆڤ بەبێ ئەو خۆبەختکردنانە چارەسەرنابن.

ئەفلاتوونیش لە کتێبی کۆماردا ــ کەیەکەمین کتێبی فەلسەفەی سیاسی خۆرئاوایە ــ بەمەبەستی دەربڕینی مەبەستەکانی، بەردەوام خوازە بەکاردەهێنێ. ئەو لاربینییانەی کەئەفلاتوون لە مرۆڤدا ئەیانبینێت، لەگەڵ ئەو کورتبینییانەی کە هۆبس وەك کێشە سەرەکییەکانی پشێویی سیاسەتی مرۆڤایەتی لەقەڵەمیان ئەدا، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. ئەفلاتوون لە ناوەڕاستی ناملکەی کۆماردا تەمسیلە بەناو بانگەکەی "ئەشکەوت" وەك نموونە ئەهێنێتەوە، تاکێشەکانی مرۆڤی پێ وەسف بکات. ئەو ئەڵێ: زۆربەی خەڵك وەك ئەو کەسانەن کە هەموو تەمەنیان لە ئەشکەوتێکدا بەسەر بردووە. ئەوان هەر چییەکیان بینیوە، لەوشتانەی کە بە دیوارەکانی ئەشکەوتەکەوە ئەلەرانەوە، لە هەندێ سێبەر و شەبەح زیاتر هیچیتر نەبوە. ئەوان هەرگیز رووناکایی راستەوخۆی دەرەوەیان هەست

پێنەکردووە. نازانن ئەوشتانەی کە ئەیانبینن، لە سێبەر زیاتر هیچ نین. ئەوان بەبێ ئەوەی کە بتوانن پەی بەحەقیقەتەکان دەرك بەرن لە ناو دنیایەکی سیاسی خەیاڵیدا ئەژین کە خۆیان هێناویانەتە ئاراوە. بەڵام لەبەرئەوەی کە خەیاڵ گەرایی دەتوانێ لە "کورتبینی" مەترسیدارتر بێت، ئەوان کوێرانە ئەکەونە ناو ئەو چاڵە سیاسیانەی کە رەنگە ببێتە هۆی لەناوبردنی رۆح و جەستەیان.

رێگەچارەی ئەم تەسکبینییە، ئەوە نییە کە "زەرەبین"یك فەراهەم بکرێت بۆ تێڕوانینی باشتر. بە بڕوای ئەفلاتوون، مرۆڤ نەك تەنها دەبێ بتوانێت باشتر ببینێت، بەڵکوو دەبێ روانینیشی بگۆڕێت. مرۆڤ پێویستیبە"زەرەبین" نییە، بەڵکوو پێویستی بە رووناکاییە. دابینکردنی چاویلکە، رێگەچارەنییە. مرۆڤ ئەبێ سەرلەنوێ پەروەردە بکرێت و رابهێنرێتەوە. ئەبێ تێگەیشتنەکانی مرۆڤ لەسەر جیهانی دەرەوە گۆڕانیان بەسەردا بێت. بە بیروڕای هۆبس، تیۆرە سیاسییەکان بە فێرکردنی "دوور ئەندێشی" بەئامانجەکانیان دەگەن، لە کاتێکدا لای ئەفلاتوون ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان، ئەوەیە کە هەموو لایەنەکانی مەسەلەیەك لەبەرچاو بگرن و ئاوڕیان لێبدەنەوە، وەك چۆن ئەگەر چاو بیەوێت لە تاریکییەوە بۆ رووناکایی بڕوانێت، پێویستە هەموو ئەندامەکانی لەشی رووبکەنە ئەو شوێنە، هەر بەو جۆرەش پێویستە لە هەموو شتە مادی و زەمینییەکان

چاوپۆشی بکرێت تاکوو نەفس بتوانێت خوا ببینێت و تیشکەکانیشی تەحەمول بکات. ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئێمە ناو مان لێناوە "خێر".

سەرنج بدەنە نموونەیەکی تری ئەم سەردەمەی ئێستا. "هێربێرت مارکۆزە" لەو باوەڕەدا بوو کە شێوازەکانی فێرکاری و هەروەها بیرکردنەوە سیاسییە زاڵەکان، تێڕوانینی سیاسی مرۆڤ سنووردارو بەلاڕێدا دەبەن. ئەوانە، جۆرە "شعوورێکی درۆیین" ئەهێننە ئاراوە کە کاریگەرییەکی زۆریشی ئەبێت. مارکۆزە لە کتێبی "مرۆڤی تاك ڕەهەند"دا دەڵێ:

ئەوەندەی پێوەندی بە حەقیقەتێکی تایبەتەوە هەبێت، بیرکردنەوەو ڕەفتار، شعورێکی درۆیین ئەهێننە ئاراوە کە ڕێکخستنێکی درۆیین بە واقعییەتەکان دەبەخشن و پارێزگاریشیان لێ دەکەن. ئەم شعوورە درۆیینە. لە شێوەی ئامرازە تەکنیکییە زاڵەکاندا دەرئەکەوێت کە بەنیسبەت خۆیانەوە، بەرهەم هێنەری ئەم شعوورە درۆیینەن.

بە بیروڕای مارکۆزە، ئەم جۆرە لار بینییە و هەروەها ئەم شعوورە درۆیینە، ئاکامگەلێکی قووڵی سیاسییان لێدەکەوێتەوە. ئەوانە ئازادی زەوت ئەکەن. ئەوانە ڕێگە لە گەشەو نەشونماکردنی ئەو بەهرە ئینسانییانە دەگرن کە بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵگا پیشەسازییەکانەوە هاتوونەتە ئاراوە. ئەرك، ئارەزوو و هیوایەتی تیۆرە سیاسییەکان ئەوەیەکە مرۆڤ لە

تەسك بینییەکان و پاشانیش لە کۆتوبەندی سیستەمە کۆمەڵایەتییە سەرکوت کەرەکان رزگار بکەن. تێڕوانینێکی گرنگی ئەقڵی کە لە تیۆرسازی سیاسیدا شاراوەتەوە "هێزێکی رووخێنەر"ە کە ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشیّ کە ئازادی راستەقینە بەدەستبهێنێت. ئاساییە کە تیۆرە سیاسییەکانی هۆبس، ئەفلاتوون و مارکۆزە، لە شتە بچووکەکاندا (جزئیات) ناکۆکییەکی زۆریان لەگەڵ یەکدی‌دا هەیە، لەراستیدا ناکۆکییەکانیشیان، ئێجگار گەورەن. لەراستیدا قسەکانی تیۆرسێنە سیاسییەکان، تەواوە یەکناگرنەوە بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە دایلۆگ، یان وتوویژێك ئەهێننە ئاراوە. تیۆرسێنە سیاسییەکان، تێگەیشتنیکی سەرەکی وێکچوویان هەیە سەبارەت بە شێوەی راڤەکردن و لێکۆڵینەوە، کە ئەو توانایەیان پیّ ئەبەخشێت سەرەڕای بوونی جیاوازییەکان لە بواری زمان، شوێن و فەرهەنگی سیاسیدا، لە قسەکانی یەکتری تیّبگەن. ئەوان پیّ لە سەر ئەوە دائەگرن کە ناتوانین بە ئاسانی و بە تەواوەتی لە سیاسەت تیّبگەین. لەڕاستیدا تێگەیشتنی مرۆڤ بەگشتی "سنوردار"ەو، زۆرجاریش بەتەواوەتی تەحریف کراوە. ئەم نەتوانینە بۆ تێگەیشتن لە سیاسەت، بەگشتی مەسەلەیەکی مەترسیدارو رووخێنەرە. کەواتە، پێویستە هێندەی بۆمان بکرێت بەسەر تەسکبینییە سیاسییەکاندا زاڵ بین. ئەم زەرووەرەتە، ئەرکی تیۆرە سیاسییەکان دەستنیشان ئەکات.

# ڕێگاکانی تێگەیشتن لەتیۆرە سیاسییەکان

هەندێرێگای جۆراوجۆرو بەکەڵك هەن کە سنوور و پانتایی هەر لێکۆڵینەوەیەك پێناس و دەسنیشان ئەکەن. بۆ نموونە، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە ئەڵێ "تیۆرە سیاسییەکان چین؟" ڕەنگە سەرنج بدرێتە ئەو مەسەلانەی کە لە تیۆرە سیاسییەکاندا دەخرێنە ڕوو، یان ڕەنگە لێکۆڵینەوە لەسەر ئامانجەکانیان بکرێت، یان تەنانەت ڕەنگە لێکۆڵینەوە لەسەر "ڕێگەچارە دیاریکراوەکان" بکرێت.

ئەگەر بۆ پێناسە کردنی تیۆرە سیاسییەکان، مەسەلەکان و کێشەکان وەك خاڵی دەست پێکردن وابن، دەتوانین چەند بابەتی دیاریکراو، کەلە مێژووی ئەو تیۆرانەدا دوابەدوای یەك دووبارە بوونەتەوە، دەسنیشان بکەین. ئەم پرسیارە "هەمیشەییانە" کە بەردەوام و بەجەختەوە سەرهەڵئەدەن، وەك سەنتەری سەرقاڵییە زەینییەکانی تیۆرە سیاسییەکانن. "پێوەندییە دروستەکانی نێوان تاك و کۆمەڵگا کامانەن؟"، "دەسەڵات دەبێ بدرێتە دەست کێ؟"، "چۆن دەوڵەت دەتوانێ ئازادییە مرۆڤییەکان دابین بکات و چۆنیش چوارچێوەیان بۆ دائەنێت و سنوورداریان ئەکات؟". مرۆڤ چ شۆڕش بکا بەسەر کۆمەڵگای سیاسیداو، چ بیەوێت چاکسازی تیابکات، بەناچار ڕووبەڕووی ئەم مەسەلانەو هەندێ پرسیاری دیکەی لەو جۆرە دەبێتەوە. هەموو تیۆرسێنەکان، بە

جۆرێـك رووبـەرووی ئـەو پرسـیارانە بوونەتـەوە و بـە شـێوەی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ هەر دەبێ وەڵامیان بدەنەوە. کەواتە ناسـین و دەرككردنـی بابەتـە هەمیشـەییەکان، لـە تیـۆرە سیاسییەکاندا، دەتوانێ تارادەیەکی زۆر یارمەتی ئەوەمان بدات کە بتوانین لە کۆمەڵگای سیاسی تێبگەین.

ئـەتوانین بـە ئاسـانی لـە سروشـت تیـۆرە سیاسـییەکان تـێبگـەین، ئەگـەر بـەوردی خوێندنـەوە لەسـەر ئامـانج و ئاکامەکانیان بکەین و هەروەها بزانین کە تیۆرسێنەکان بەدوای چ شتێکدا دەگەڕێن؟ ئەوان دەیانەوێ چ شتێك بزانن؟ کەسانێك کە بـەدوای ئـەم بۆچوونانەدا ئەچن، زۆربـەی کـات بـەو دەرەنجامـە ئەگەن کـە تیـۆری سیاسـی، تەقەلایەکە بۆ تێگەیشتن لـە توخمـە پێکهێنەرەکانی "کۆمەڵگای باش". بۆ نموونە، "لیڤی شتراوس" کە یەکێکە لە خاوەن بیروڕا بەرجستەکانی تیـۆری سیاسـی، لەو باوەڕەدایـە کـە فەلسـەفەی سیاسـی، هـەوڵ و تەقەلایـەکی پـاك و راسـتگۆیانە بـۆ ناسـینی سروشـت کاروبـارە سیاسـییەکان و هـەروەها دەرككردنـی چییەتی سیسـتمی سیاسـی دروسـت یـان چاك.

لـە راستیشـدا ئـەوە پێنـاس کردنێکـی گەلـەك بەکەڵکـە. بەڕاسـتی هـەموو تیۆرسـێنە سیاسـیە گـەورەکان، ئاوڕیـان لـەم مەسـەلەیە داوەتـەوە. ئـەوان، هـەموو ئـەو توخمانـەی کـە کۆمەڵـگایەکی بـاش ئەهێننـە ئـاراوە ـــ کۆمەڵـگایەك کـە مـرۆڤ تووشـی نەهامـەت و بەدبـەختی ناکـات و ژیـانێکی پـڕ لـە

ئاسـوودەیی بـۆ دابـین ئـەکات ـــدەناســن و ڕاڤــەکاری و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەکەن.

سەرەنجام، رەنگە بتوانین تیۆرەسیاسییەکان هەر لە ڕێگەی ئەو ڕێگەچارانەی کە خۆیـان دەستنیشـانیان ئەکـەن، بخەینەبەر ڕاڤە و شیکردنەوەوە. تیۆرە سیاسییەکان چ ئیدیعایەکان هەیە؟ چ مەسەلە گەلێك ئەخەنەڕوو؟ لەبەرئەوەی کە تیۆرە سیاسییەکان هەندێ ڕێگەچارە و پێشنیار دەستنیشان ئەکەن، لە مێژووی تیۆرە سیاسییەکاندا بە تیۆری "تەجویزی"ش ناودێر ئەکرێن. بەواتایەکی دی، تیۆری سیاسی "تەجویزی" هەوڵئەدات فێری ئەوەمان بکات کە "چی بکەین"، هەروەها بانگەشەی ئەوەش دەکا کە ئەرك و ئامانجەکانمان دەناسێ.

هـەرکام لـەم تێڕوانینانـە، چ بەتـەنهایی و چ وەك کۆمـەڵ، تێگەیشتنیکی قووڵ و بایەخدار لە کرۆکی تیۆرە سیاسییەکان بە دەستەوە ئەدەن. لە ڕاستیدا بە هیچ شێوەیەك ناتوانین لە چالاکییەکی فیکری تێبگەین، مەگەر ئەوەی ئەو کێشە بنەڕەتییانەی کە رووبەڕووی دەبنەوەو هەروەها ئامانجە ڕۆشنبیرییەکانی و هەروەها ئەو ڕێگەچارە و مەسەلانەش کە ئەیانخاتە ڕوو، بەباشترین شێوە دەرکبکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم شێوازانە سەرەڕای پێویستبوونیان، ناتەواون و تەنها بەشێك لە لێکۆڵینەوەکان ئەگرنەوە. بۆ نموونە، ئەگەرچی ئەو شێوازانە قسەلە سەر "سەرچاوە" و "سەرەنجام"ی تیۆرە سیاسییەکان ئەکەن ـ واتە ئەو پرسیارانەی کە خراونەتەڕوو و ئەو وەڵامانەش کە دراونەتەوە ـ بەڵام

سەبارەت بە "مەودای" نێوانیان و هەروەها چۆنیەتی تێپەڕین لە قۆناغێکەوەو، گەیشتن بە قۆناغێکی تر، بێدەنگییان هەڵبژاردووە. بۆ کامڵ کردنی ئەو وێنایە، نەك تەنها دەبێ پرسیارە چارەنووسسازەکانی تیۆرسێنەکان بناسین، بەڵکوو دەبێ ڕێگەکانی گەیشتن بەو ئامانجانەش بزانین. ئەبێ ئەو ڕێگەچارانەی کە دیاریکراون، یاخود دیدگاکانیان بناسین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ سەرچاوە و جۆری ڕوونکردنەوەی ڕێگەچارەکانیش بناسین.

## "لۆژیکی ناوەکی" لەبەرانبەر "لۆژیکی سەرلەنوێ دروست کراو"دا

پێم وابێت بۆ ئەوەی بەتەواوەتی پەی بەهەر لێکۆڵینەوەیەك بەرین، دەبێ بەدروستی لە ڕەوتە فیکرییەکانی تێبگەین. دەبێ بە تەواوەتی سەرنج بدەینە ئەو شتەی کە پرۆفیسۆر "ئابراهام کاپلان" بە "لۆژیکی ناوەکی دیاردەکان" ناوزەدی ئەکات. هەر بەو شێوەی کە ئەو ئەڵێ، لە ڕشتەیەکی زانستیدا، ئەو لۆژیکەی کەپاش تەواوبوونی کارو، بەهۆی پۆلێن کردنی ئەو بابەتانەی کە خراونەتەڕوو، سەر لە نوێ بەرهەم ئەهێنرێتەوەو چاکسازی تیا دەکرێ، جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ڕەوتە کردەییەکانی مەعریفە، یان لۆژیکی ناوەکیدا. جیا لەوەش، ناتوانین ئەم ڕەوتانە لەگەڵ "لۆژیکی سەرلەنوێ دروست کراو"دا، بەیەك شت

لە قەڵەم بدەین و ناشتوانین هێندە لە پلەوپایەیان کەم بکەینەوە. ئەگەرچی لۆژیکی ناوەکی، لەگەڵ لۆژیکی سەرلەنوێ‌دروست کراودا، تێکەڵاوییەکی ئاشکرایان هەیە، بەڵام ناتوانین بە یەکسانیان لە قەڵەم بدەین. یان وەك چۆن ناتوانین وتەکانی "گیبۆن"ی مێژوونووس سەبارەت بە رووخانی دەوڵەتی رۆما، لەگەڵ وتەکانی پزیشکێك سەبارەت بە "تاو"ی نەخۆشێك بە یەکسان لە قەڵەم بدەین، ناشتوانین تەسەور بکەین کە ئەم دوو میتۆدە، پێوەندییەکی دروستیان لەگەڵ یەکدی‌دا هەیە.

هەڵبەتە لەرووی لۆژیکییەوە دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە لۆژیکی بازسازی‌کراوی رەوشی تۆیژینەوە، بە بێ‌کەڵك وەرگرتن لە بزۆزبوون (دینامیك)ی لۆژیکی ناوەکی، رەنگە پێناسەیەکی گومڕاکەرو تەحریفکراو لەسەر بابەت بەدەستەوە بدات. لۆژیکی سەر لەنوێبنیات نراو، جگە لە وێنایەکی یۆتۆپیایی لە سەربابەت زیاتر، هیچی تر نییەو لەگەڵ ئەوەشدا وێنایەکی ئەبستراکتیشە. هەر بابەتێکی ئەبستراکت و ئامانج خوازانە، بە چاوپۆشی کردن لە لایەنە پۆزەتیڤەکانی، لە خراپ لێکدانەوەیەك زیاتر هیچی‌ترنیە.

ئەگەر بۆ تێگەیشتنی هەر بابەتێك، جەخت بکرێت لەسەر بنیات‌نانەوەگەلی دیکەی فۆرمێکی دیاریکراوی لێکۆڵینەوە، وەك بناغەیەك بۆ تێگەیشتن لەو مەسەلەیەی کە مەبەستمانە، لەو

کاتەدا نوقسانی و کەموکوڕی دێتە ئاراوە. لە راستیدا رەنگە دەرەنجامی کارەکە گومڕاکەربێت. بۆ نموونە، تۆماس کۆهن لە کتێبیکدا بە ناوی "بنەمای شۆڕشە زانستییەکان" ئەڵێ: ئەمە بە تەواوەتی ئەو کارەساتەیە کە زانستە ئەزموونگەرییەکان تووشی بوە. بەبیروڕای ئەو، لەو روەوە کە مرۆڤ بە مەبەستی دەرك کردنی زانستەکان، تێڕوانینەکانی خۆی لەسەربنەمای سەرکەوتنە زانستییە کامڵەکانەوە دائەمەزرێنێت، خۆی هەرچی زیاتر گومڕاتر کردووە.

لەزانستی تەجروبیدا ئەم مەسەلە حاشاهەڵنەگرە کە ئەگەر تێورە سیاسییەکان وەك "کۆمەڵێك مەسەلە" چاولێبکەین، ناتوانین بە شێوەیەکی دڵخواز دەرکیان بکەین. دیارە ئەم جۆرە رەوشانە، شتگەلێکمان فێرئەکەن بەڵام شتگەلێکی زۆریشمان لەدەست ئەچێت. رەنگە ئەوشتانەش کە لەدەستمان ئەچێت، زۆر گرنگ بن. هەروەك پێشتر باسمان کرد، تیۆرە سیاسییەکان سەمبولێکن لە "گشت" گەلێکی سیستماتێك. ئەوانە رەوش گەلێکن بۆ دەرك کردنی جیهان. هەرکاتێك تیۆرسێنیك بیەوێت بیروڕاکانی خۆی بەسەر گوێگرانیدا بسەپێنێت و ناچاریان بکات کە لە روانگەی ئەوەوە لە جیهان بڕوانن، ناچارە بەکەڵك وەرگرتن لە هەندێ رێگەچارەو ستراتیژ و تێکەڵەیەك لە فۆرمە گرامرییەکان (فۆرمگەلی رێزمانی) ئەو کارە بکات. ئەو، جگە لەڕستە سادەکان، تەمسیلەکان، خوازەکان، پرەنسیپە

بابەتییەکان (اصـــول موضـــوعه)، چیرۆکە خەیاڵییەکان، ئەفسانەکان و هەروەها ئەو ڕستانەی بۆهاندان بە کارئەهێنرێن و تەنانەت لە ڕستە "داخواز"ییەکان کەڵك وەردەگرێ. ئەو، ناتوانێت بە بێ هیچ گیروگرفتێك تەنها کەڵك لە تەعبیر و وشە باوەکان وەربگرێت. چونکە ئەم وشانە، واتاکانی خۆیان لەو گەمە زمانییە وەردەگرن کەتیایدا چالاکن، (لۆدڤیك ڤیتگنشتاین فەیلەسوفی بەرجستەی ئەم سەردەمە، بە باشترین شێوە ئەمەی پیشان داوە)، ئامانجی تیۆرسێنی سیاسی ئەوەیە کە کایەیەکی یەکجار تازەمان پێبناسێنێت.

جیالەوەش، لۆژیکی ئەبستراکت، جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە پێویستە ئەو شتەی کە "هەیە" لەو شتەی کە "دەبێ ببێت" جیابکرێتەوە. ئەگەر تەنها بە شێوەی لۆژیکی سەرنج بدرێتە بابەتەکە، ئەو دەستەواژانەی کە "هەیە"کان روون ئەکەنەوە، هەرگیز ناتوانن ئەو شتەی کە "ئەبێ ببێت" روون بکەنەوە. کەواتە هونەری گەورەی تیۆرە سیاسییەکان دەستنیشان کردنی ڕێگایەکە، کە بەهۆی ئەو ڕێگایەوە، ئەم دوو نۆرمە ـ ئەگەر بە لۆژیکیش نەبێت، بەلانی کەمەوە بە شێوەی "سروشتی" ـ تێکەڵی یەکدی بکرێن. لۆژیکی سەرلەنوێ بنیاتنراو، مرۆڤ ناچار دەکا کە بەشی "تەوسیفی" لە بەشی "تەجویزی" تیۆرەسیاسییەکان جیابکاتەوە کە دەرەنجامەکەی ئەمجارەش لە تەحریف زیاتر هیچی‌تر نیە. تایبەتمەندییەکانی لۆژیکی وەستاو

(راکد)ی ئەو کارەی کە دواتر ئەنجام دەدرێت، مرۆڤ ناچار ئەکات تا بەرانبەر یەکێك لە گرنگترین رەهەندەکانی تیۆرە سیاسییەکان کەمتەرخەمی بکات. ئەم جۆرە تێگەیشتنە، چۆنیەتی پێوەندی نێوان ئەو جیهان بینییەی کە خراوەتەڕوو، لەگەڵ پەرچەکردارییە سروشتی و گونجاوەکانی هەمان ئەو جیهانبینییە ئەپچڕێنێت. جیا لەوەش ئەم رەوشە، ئامرازەکانی دەرککردنی ئەم واقعییەتە گرنگە لە مرۆڤ ئەسێنێتەوە کە "تێڕوانینێکی بەربلاوی تیۆرە سیاسییەکان، وێنایەك لە بەختەوەری پیشان ئەدات و هەروەها ئەو بەهایانە ئەهێنێتە ئاراوەکە ژیانی مرۆڤ بە بێ ئەوانە هیچ دەوامێکی نابێت".

هەروەها بۆچوونی لۆژیکی سەرلەنوێدروست کراو، گشتێتی (کلیّت) ڕەهەندی وجوودیی تیۆرە سیاسییەکان ـ کە لەڕاستیدا یەکێکە لە بوعدە چالاك و سەرنج ڕاکێشەکانیان ـ ئەسڕێتەوەو لە بەینی ئەبات. تیۆرە سیاسییەکان لە دنیای ڕاستەقینەدا، سەروکاریان لەگەڵ مەسەلە هەرە گرنگە مرۆڤییەکاندا هەیە. تیۆرە سیاسییەکان، لە سەرگەردانییەکان، سەرلێشێواوییەکان، بێبەشییەکان و هەروەها لەو قەیرانانەی کە تیۆرە نائومێدەکان دەیانەوێ چارەسەرێکیان بۆ بدۆزنەوە، دەست پێئەکەن. ئەوان دەرگیری داخوازەکان و پێداویستییە مرۆڤییەکانن و بەجیدییەتێکی تەواوەوە بەدوای دابینکردنی ئەو داواکاری و پێداویستییانەوەن. هەڵبەت خوێندنەوەی تیۆرە

سیاسییەکان ڕێبازی لۆژیکی سەرلەنوێ دروست کراو ـــ ئەگەرچی هەڵەش نەبێت و بگرە قازانجیشی هەبێت ـبەڵام وەك ئەوە وایە کە مرۆڤ بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ژینی مرۆڤ، لە تەرمەکەیەوە دەست پێبکات.

لەبەرئەوەی ئەبستراکت کردن دوای لۆژیکی سەرلەنوێ دروست کراو، دەتوانێ گومڕاکەربێت، کەواتە بۆ تێگەیشتن لە هەر میتۆدێکی توێژینەوەو بەتایبەت تیۆرە سیاسییەکان، نابێ سەرەتا لەو بابەتانەوە دەست پێبکەین کە هەڵقولاوی خودی ئەوتیۆرانەن، بەڵکوو بەوتەی فەیلەسوف زانست "ستیفن تولمین" دەبێ ئەو بیرکردنەوەیەی کە چالاك و زیندووەو لە ڕووی مێژووییشەوە لە حاڵی گەشەکردندایەو چەمکەکان تیایدا قازانجێکی گشتی و هەمەکییان هەیە، خاڵی دەست پێکردن بێت. هەر بەوجۆرەی کە تولمین دەڵێ: گۆڕینی ئەم تێڕوانینە مرۆڤ ناچار دەکا واز لەو شیکردنەوەو ڕاڤەکارییە "سەر پێییانە" بێنێت کە هزرمەندان لە ڕێگەیانەوە، چەمکە ڕۆژانەکانی زانستی سروشت و چالاکییە فیکرییەکانی تریان ڕوون کردۆتەوە. لە جیاتی ئەوەش مرۆڤ دەبێ "وێنایەکی زیندوو"ی مێژوویی، لە چالاکی و ڕەوتی فیکر بەدەستەوە بدات و ئنجا ئومێدەوار بێت کە دواجار، چالاکی مێژوویی چەمکەکان دەرك بکات و بەم جورەش سروشت و ریشەی "لۆژیك"ی ئەو چەمکانە بناسێت.

## خوێندنەوەی بەرهەمە کلاسیکەکان

بەرهەمەکلاسیکەکانی تیۆرە سیاسییەکان، بۆ خۆیان پێشینەیەکی دیاریکراوی مێژوویی ــ کە زۆریش گرنگە ــ بەدەستەوە ئەدەن. دەکرێت لە رێگەی خوێندنەوەو هەروەها پێڕەوی کردنی شێوازی هزرمەندە بەرجستەکانەوە زانیاری بەدەست بهێنرێت. ئەگەر خولیاکان، ئامانجەکان و تەسەورە بەرجستەکانی هزرمەندانی وەك رۆسۆ، لۆك، یان هێگڵ دەرك بکرێن، زۆرێك لە مەحدودییەتەکانی تێڕوانینی "سەرپێیی" روون دەبێتەوە. لە ڕاستیدا بیرمەندان و توێژەرەوە جۆراوجۆرەکان، بە کەڵكوەرگرتن لەم رەوشە، فێری "پیشە"ی خۆیان ئەبن. ئەوان نەك بە خوێندنەوەی چەند کتێبێکی تەجریدی سەبارەت بە پرەنسیپەکان و میتۆدەکان، بەڵکو لە رێگەی پێڕەوی کردنی سەرمەشقەکانی پسپۆڕە بەناوبانگەکانەوە پەی بەوە دەبەن کەچۆن دەتوانن ببنە "گیاناس"، "فیزیکزان" یان تیۆرسێنی سیاسی.

لەگەڵ ئەوەشدا تیۆرە سیاسییەکان، ئەگەر تەنها لە رێگەی خوێندنەوەی بەرهەمە کلاسیکەکانەوە فێربکرێن ــ هەرچەند گرنگیی خۆی هەیە بەلاّم هەندێ مەترسی و سنورداریشی بەدواوەیە.

یەکــەم، ئەگەرچــی کتێبــە کلاســیکەکان بــە تــەواوەتی ڕێگەچارەگەلێکی سیستماتیك نین، بەڵام "دەستکەوت گەلێکی کامڵن". ئەوانە لۆژیکێکی شیکاری (تشریحي) ئەخەنە پێش‌چاو کە بەدەگمەن دەتوانێ شان‌لەشانی لۆژیکی "لێکۆڵینەوەیی" بدات. خوێندنەوەی دروستی هەندێ کتێبی وەك "پەیمانی کۆمەڵایەتی" یان "کۆمار" ڕەنگە تارادەیەك تێگەیشتنیکی باش لە تێگەیشتنەکانی ڕۆسۆو ئەفلاتوون لەسەر ڕێکخستنی سیاسی ئاراستە بکەن، بەڵام بەبێ‌چالاکی کردن و بەدواداچوونێکی هۆشمەندانە، ڕەنگە بە تەواوەتی ئەوە روون نەبێتەوە کە ئەم تێگەیشتنانە لە کوێوە هاتوون و، چ ئارەزوویەك ڕۆسۆ، یان ئەفلاتوونی هانداوە کە جیهان‌بینییەکی لەوجۆرەیان هەبێت؟ بۆچی ئەبێ وابزانن بیروباوەڕەکانیان هێندە کاریگەر دەبن؟ ئەگەر لۆژیکی ناوەکی ئەندیشەکانیان بە تەواوەتی دەرك نەکرێت، هەر ئەم خراپ تێگەیشتنە وامان لێ ئەکات کە نەتوانین بە دروستی لە تیۆرەکانیان تێ‌بگەین.

دووهەم، تەنها پشت‌بەستن بەو بەرهەمە کلاسیکانەی کە ئیدی سەردەمیان بەسەرچوە، ڕەنگە ئەو تەسەورە لە زەیندا دروست بکات کە تیۆرە سیاسییەکان وەکوو بەرهەمی عەنتیکە وان. دیارە ئاسەوارە کلاسیکەکان بەرهەمی سەردەم و کۆمەڵگاکانی پێشوونو، هەر بەم هۆیەشەوە ڕەنگە مرۆڤ وا تەسەور بکات کە تیۆری سیاسی، لقێکە لە مێژووی بیرکردنەوە،

ئەگەر ئەم قسەیە راست بێت، کەواتە شتێکی بەجێگەیە ئەگەر لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەیان بدرێتە دەست مێژوونووسانی "مێژووی بیرکردنەوە"، یان ئەوکەسانەی کە پسپۆری دێریننناسین. لە واقیعدا هەر لەبەرئەوەیە کە پرۆفیسۆر " دێڤد ئیستۆن" لەو باوەڕەدایە کە" هۆی گرنگیینەدان بە تیۆرە سیاسییەکان لەم سالانەی دواییدا، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرەی بیرکردنەوە.

سێهەم، لەبەرئەوە کە ئاسەوارە کلاسیکەکان بەرهەمی سەردەم و کۆمەڵگاکانی پێشوون، رەنگە جیاوازییەکی زۆریان هەبێت لەگەڵ سەردەم و کۆمەڵگای ئێمەدا و هەروەها لەبەرئەوەی کە رەنگە بە رەوش گەلێك بەیان کرابن کە بە رەوشەکانی ئەم سەردەمە نامۆ بن، ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە دەرك کردنیان ــ بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە ئاشنایيەکی ئەوتۆیان لەگەڵ مێژووی بیرکردنەوەدا نییە ــ یەکجار دژواربێت. بۆ نموونە، ئەفلاتوون کتێبی کۆمار بە "پیاسەکردن بەرەو پیرائوس"، هۆبس، لویاتان بە "قسەکردن لەسەر سروشتی حەرەکەت"، هەروەها ئیدمۆندبرێك، کتێبی "تێڕامانێك لەسەر شۆڕشی فەرەنسا"، بە دەمەتەقێکردن لەگەڵ ریچارد پرایس، کەرۆحانییەکی بەرجستە و کۆڵ نەدەرە، دەست پێ ئەکەن. ئەم جۆرە دەستپێکردنانە، لە بواری دراماتیکی، لۆژیکی و مێژوویيدا، هەرکام بۆخۆیان زۆر پڕمانان. هەڵبەتە واتای

سەرەکی ئەم دەستپێکردنانە، بە خوێندنەوەیەکی سەرپێیی روون نابێتەوە. ئەم قسەیە سەبارەت بە بابەتگەلێکی یەکجار گرنگ و بەرواڵەت ئاڵۆزی وەك چەمکی "دۆخی سروشتی"ش راستی لەخۆدەگرێت.

سەرەنجامیش لەبەرئەوەی کتێبە کلاسیکەکانی تیۆرە سیاسییەکان بە هەندێ میتۆد و زمانی جۆراوجۆر نووسراون، رەنگە ئەوە روون نەبێتەوە، کە بە هەموویانەوە سوننەتی یەکپارچەی دایلۆگیان دامەزراندوەو تەقریبەن لەگەڵ مەسەلەگەلێکی گرنگ و یەکساندا سەروکاریان هەیە. دەستنیشانکردنی‌خاڵی هاوبەشی ئەم کتێبانە کارێکی ئاسان نییە. ئەگەر توخمەکان، یان خولیا هاوبەشەکانی نێوان ئەم کتێبانە دەرك نەکرێت، لەو حاڵەتەدا هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی تیۆرە سیاسییەکان لەگەڵ یەکتری‌دا، ئەگەر مەحاڵ نەبێت، بەلای کەمەوە کارێکی یەکجار سەختە. جیا لەوەش، بەگران دەتوانین چۆنیەتی ئەم واقعییەتە دەرك بکەین کە ئەوان سەرەڕای هەندێ جیاوازی "کاتی"، "شوێنی" و "زمانی" (بەمانا واقعییەکەی وشە) دەتوانن لەگەڵ یەکتری‌دا و هەروەها لەگەڵ ئێمەشدا قسەبکەن و پێوەندیمان پێوەبکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو لێکۆڵیارانی تیۆرە سیاسییەکان، ئەوە باش دەزانن کەبەرهەمە کلاسیکەکانی تیۆرە سیاسییەکان، ڕاڤەکارییە جۆراوجۆرەکانیان نەهێندە دژوارو دێرینن و نە

ئەوەنـدەش فرەچەشـن و پەڕاگەنـدەن کـە هەڵسـەنگاندنیان لـە توانـادا نـەبێت. کەسـانێك کـە بـە هـەوڵ و تەقـەلاو تـەرخانکردنی کاتێکی زۆر، ئەم رەمزانەیان شکاندووە، ئاگادارن کە قسـەوباس و بابەتەکانی تیۆرە سیاسییەکان، زۆر پڕنـاوەڕۆکن و پێویسـتیان بەوەنییـە کـە بـە تێپـەڕبوونی کـات ئـەو بایەخـە بەدەسـتبهێنن. لـە ڕاسـتیدا هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە لـە کۆمەڵـگایەکی مەدەنیـدا ئەژین و هەندێ بڕیار دەرئەکەن، تاڕادەیـەك تیۆرسـێنی سیاسـین. مرۆڤ بـە پێـی کۆمـەڵێك بـاوەڕو تێگەیشـتنی بنـەڕەتی، ـ تەنانـەت ئەگەر زۆربەی کـاتیش ناکامڵ و هەڵـە و نیمـە لـۆژیکی بن ـ قسـە لەسەر چییەتی سیاسـەت ئەکەن.

ئامـانجی تیـۆرە سیاسـییەکان ئەوەیـە ئـەو باوەڕانـەی کـە ڕێنمای رەفتارە سیاسییەکانی مـرۆڤن، یەکپارچە بکـات و لەسـەر بناغەگـەلێکی پتـەو دایـانمـەزرێنێت. لـەم دەربڕینـەدا، تیـۆرە سیاسییەکان یەکێك لە بنەڕەتیترین جیلوەکانی هەوڵ و تەقەلای مرۆڤ بۆ "لۆژیکی" بوونن. مرۆڤ ئەیەوێت بەیارمـەتی ئـەو تیۆرانـە خـۆی بگۆڕێـت بـە بوونـەوەرێـك کـە ژیـانی ڕۆژانـەی، نـەك بـە حەزوویستێکی کوێرانـە، بـەڵکوو بەهۆی ئەقڵـەوە بـەڕێوە ببرێـت. تیۆرسـێنە سیاسـییەکان، بـەو هۆیـەوە لـەوانیتـر جیانابنـەوە کـە "خـاوەنی" تێـڕوانینی سیاسـین، بـەڵکوو بـە هـۆی "چـۆنیەتی" تێڕوانینەکـەیان لـەوانیتـر جیادەبنـەوە. بەواتایـەکی دیکـە، جیاوازی تیۆرسێنە سیاسییەکان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئەوەنییە

کـــە خـــاوەنی تێـــڕوانینی سیاســـین، بـــەڵکوو لـــە چـــۆنیەتی تێڕوانینـەکانیاندا جیاوازی هەیـە، ئـەوان ژنـان و پیـاوانێکن کـە هەوڵ ئەدەن بە شێوەیەکی بنەڕەتی مانـا بـە سیاسـەت ببەخشـن. ئەوان هەوڵیان داوە تێڕوانینە سیاسییەکەیان روون و هەماهـەنگ بێـت و لەسـەر بنـەمای کـاملترین زانسـتی مـرۆڤ، لـە سروشـتی مرۆڤـەوە بگـرە تـا سروشـتی دنیـا، دابمـەزرێت. هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە بـەدوای رەفتـاری لۆژیکییـەوەن، دەتـوانن لـەو تیۆرسێنە سیاسییانە فێربن و ژیانی ئەوان بکەنـە سەرمەشقی خۆیـان. شـاکارەکانی تیـۆرە سیاسییەکان نـەك تـەنها مـرۆڤ والـێ ئەکەن کە بە قووڵی لەدنیای سیاسەت تێبگات، بەڵکوو کەم و زۆر فێری ئەوەش ئەکەن کە، چی لە ژیانی بکات؟

## تیۆری سیاسی: چوارچێوەیەکی چالاك

مەبەسـت لـە نووسـینی ئـەو وتارانـەی کـە لـە بەشـەکانی دواییـدا دەخرێنـە بەرچـاو، خسـتنەڕووی شـێوازی لێکۆڵینـەوەو هـەروەها چوارچـێوەیەك بـۆ تێگەیشـتنی تیـۆرە سیاسـییەکانە. تیۆرسێنە سیاسییەکان، هەرچەند سەبارەت بە شێواز و هـەروەها چـەمکەکان، بیروڕای یـەکجار جیاوازیـان هەیـە بـەڵام نـەك تـەنها لەگەڵ مەسـەلە گـەلێکی یەکسـاندا سـەروکاریان هەیـە، بەڵکوو بۆ وەڵامدانـەوەی هـەر ئـەو مەسـەلانە شـێوازێکی تاڕادەیـەك یەکسـان بەکارئەهێنن. زۆربەی کـات، ئـەو مۆدێلـە یەکسانەی لێکۆڵینـەوە،

لــه نــاو بەرهەمــه بــه ئاکامگەيشــتووەکانی ئــەو تيۆرســێنانەدا، بەئاشـکرا بـەدی ناکرێت. لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی کـات، تـەرتيبی خستنەڕووی بەشەکانی تیۆری سیاسی ئەشێوێت و پاش‌وپێش ئـەخرێن، تـەرتيبی ئەنديشـه و تێگەيشـتنی "کـرده"يـيش زيـانی بەردەکەوێ. بۆ نموونه دەرەنجامی "پرۆسەی" توێژينـەوه رەنگـه به شێوەی "پێش گريمانه" يان (صغـري) و (كــبري) بخرێتـەڕوو. بەڵام گرنگ ئەوەيه کـه مۆدێلەکه لـه ئارادايەو ئەگەر بمانەوێت، دەتوانين بۆی بگەڕێينەوەو، ڕجووعی پێ‌بکەين. ئـەم کتێبـەش بـه پێڕەوی کردنـی هەنـدێ نووسـەری وەك تولـمين، کاپلان و کـوهن ئەيـەوێت دەرك کردنـی "لـۆژيکی نـاوەکی" تيـۆره سياسـييەکان بۆهـەموو کەسـێك ئاسـان بکـات. نووسـەر لـه جێگايەکـەوه دەسـت پـێ‌دەکـا کـه تيۆرسـێنەکان خۆيـان دەسيان پـێ‌کـردووه. نـه لـه دەرەنجامـــەوه دەســـتی پـــێ‌کـــردووەو نـــه لـــه پرســـياره ئەبسـتراکتەکانەوه، بـەڵکوو لـه سـەرلێ‌شـێواوی و حەيرەتێکـەوه دەستی پێکردووه که سەرەتا تيۆرسێنەکانی ناچار بـه تـێ‌ڕامـان کــردووه. ڕەوتـــی لێکۆڵينـــەوه، دوای دەســـت‌پـــێ‌کــردن، بۆخــۆی چـــالاکييەکی دەروونـــی (نـــاوەکی) تيـــا دروســـت ئـــەبێت. وەڵام‌دانـەوەی پرسـياره سـەرەتاييەکان و دەستنيشـان کردنـی ڕێگەچـاره، هەنـدێ پرسـيار ئـەورووژێنێت کـه دەبـێ ورده ورده وەڵامـی هـەموويان بدرێتـەوه. وەڵام دانـەوه بـەم پرسـيارانه، لـه هەندێ ئاستی‌تردا مەسەلەگەلێکی‌تر ئەخاتەڕوو و ئـەم ڕەوتـه، تا

ئەو قۆناغەی کە تیۆرسێن، تێگەیشتنە سەمبولیکەکانی خۆی لەناو گشتێکی سیستماتیکدا زانستیانە ئەکات، درێژەی ئەبێت. بە تەنها لەم قۆناغەدایە کە پشکنینە زەینییەکانی تیۆرسێن کۆتایی دێت، تەنها پاش ئەم سەرکەوتنەیەکە ئەو سەرلێشێواوییەی کە ببوە هۆی "لێکۆڵینەوە" لە بەین دەچێ.

چوارچێوەی چالاکی "لۆژیکی ناوەکی" تیۆرە سیاسییەکان، کە نووسەر بەکاری ئەهێنێت، لە بنەڕەتدا نەبەرفراوانە و نەبەیەگجاریش تەرخانکراوە بۆ خوێندنەوەی تیۆرەسیاسییەکان بەڵکوو لە راستیدا سەرمەشقێکە بۆ ئەو زەینە چالاکانەی کە بەدوای رێگەچارەدا ئەگەڕێن. هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئامانجی سەرەکی تیۆرسێنەکان، دەستنیشانکردنی رێگەچارەیەکە بۆ کێشەکان. هەڵبەتە کێشەکانی ژیانی سیاسی، تەنها کێشە فکرییەکانی مرۆڤ نین، بەڵکوو ئەو قەیرانانەش ئەگرێتەوە کە لە ئارادان ، کە ئەوەش خاڵی دەسپێکردنی تیۆرسێنی سیاسییە. بەواتایەکی تر لەو قەیرانانەوە دەست پێئەکات کەکۆمەڵگا رووبەڕوویان بوەتەوە.ئەو هەوڵ ئەدات کە ڕەهەندەکان و سروشتی قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان بناسێت و لە هەمان کاتیشدا دەیەوێ میتۆدگەلێك ئاراستە بکات کە رێكوپێکن و پشت ئەستووریشن بەتێڕامان لەسەر هەموو لایەنێکی بابەتەکان، تا خەڵك نەك بە رەوشی ئەزموون وەرگرتن و فێربوون لە شکستەکان بەڵکوو

بەیارمەتی ئەوانە، لەگەڵ مەسەلەکاندا هەڵس‌وکەوت بکەن. هەر بەم هۆیەشەوە لە وتاری دووەمدا قسە لەسەر خوێندنەوەی "لۆژیکی ناوەکی" تیۆرە سیاسییەکان ئەکەین و لەو قۆناغەوە دەست پێ‌دەکا کە تیۆرسێنی سیاسی دەرکی بە قەیرانی سیاسی و هەروەها بێ نەزمییەکانی (ناڕێك و پێکی) ژیانی سیاسی کردووە.

کەم‌و زۆر وا دەردەکەوێ هەموو تیۆرسێنە سیاسییەکان لە بینینی بێ‌نەزمی ژیانی سیاسییەوە دەست پێ‌دەکەن. جارنوجار هەندێ تیۆرسێن سەرهەڵ ئەدەن کە بەتەواوەتی، لەو بارودۆخەی کە لە ئارادایە ڕازین وبە تەنها وردبینی و بزۆزبوونی فیکرییان هانیان ئەدات کە لەسەر بونیادەکانی ئەو نەزمە بکۆڵنەوە کە لەئارادایە. ئەم جۆرە تیۆرسێنانە ئاوارتەن. زۆربەی تیۆرسێنەکان بەرهەمەکانیان لە سەردەمێکدا نووسیوە کە بەتەواوەتی هەستیان بەوە کردووە کە کۆمەڵگا ڕووبەڕووی قەیران بۆتەوە. هەندێ جار ئەمە کارێکی زۆرئاسانە. ڕەنگە هەموو کەسێ بتوانێت دەرك بە قەیرانەکانی "ڕاوەستانی ئابووری" یان شەڕە ناوخۆییەکان بکات، بەڵام هەندێ جار تەنانەت ناسینی کێشەکە خۆی، پێویستی بە تێ‌ڕامانێکی زۆر هەیە. دوای ئەوە کە کێشەکە زانرا، تیۆرسێن ناتوانێت ئۆقرە بگرێت و بێ‌دەنگ بێت، بەڵکوو ئەبێ ریشەی کێشەکە بدۆزێتەوە. ئەبێ بە وردی لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکارەکانی

بێنەزمی و کارکردی نادروستی ئەو بارودۆخە سیاسییە بکات کەبەچاوی خۆی بینیویەتی. دیارە زۆربەی کاتیش دۆزینەوەی هۆکارەکان کارێکی ئێجگار دژوارە. سەرمەشقە فیکرییەکانی هەندێ لە تیۆرسێنە سیاسییەکان، هەوڵ و تەقەلایەکە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە. رەوتی دەستنیشانکردنیهۆکارەکان بابەتی وتاری سێهەمە.

لە هەنگاوێکیتردا تیۆرسێن، کۆمەڵگایەك وێنا ئەکات کەتیایدا کێشە سیاسییەکان بە شێوەیەکی کاریگەر، ڕاڤەکارییان لەسەر کراوەو شی کراونەتەوە. ئەو لەم قۆناغەدا بە کەڵك وەرگرتن لە خەیاڵ، هەوڵ ئەدات وێنای رێکخستنێکی سیاسی بەدەستەوە بدات کە لەو سەردەمەی ئەودا بوونی نییە. سەرلەنوێ دروست کردنی دنیای سیاسی بە شێوەیەکی خەیاڵی لەزەینی تیۆرسیێندا بابەتی وتاری چوارەمە.

سەرەنجام نۆرە دەگاتە ئەو بەشە لە تیۆرە سیاسییەکان کە هەندێ جار وەکو تایبەتمەندی بەرجستەی تیۆرە سیاسییەکان لە قەڵەم ئەدرێن. دواهەمین بەشیش دەستنیشانکردنیرێگەچارەیە. رەنگە تیۆرسێن دوای ناسینی شکستە سیستمە سیاسییەکان، پاش ناسینی هۆکاری شکستەکان و هەروەها پاش وێناکردنی تەسویری ئەو سیستمە سیاسییەی کە سەرلەنۆی دامەزراوەتەوەو زیندوو کراوەتەوە، پێشنیارگەلێکی "کردەیی" بخاتە ڕوو. هەروەها پێشنیارگەلێك

بـۆ کـردەوە سیاسـییەکان ئەخاتـەڕوو کـە بـە بـاوەڕی خـۆی بەباشترین شێوە کێشەکان چارەسەر دەکا. هەندێ جار تیۆرسێن بە ئاشکرا و ڕاشکاوانەترین شێوە پێشنیارەکانی ئەخاتەڕوو. بۆ نموونـە، ڕێگەچـارەکانی مـەکیاڤیلی کـە بەشـێکی هـەرە زۆری نووسـینەکانی پێکئـەهێنن، دەسـتوور و یاسـاگەلێکن بـۆ دەسـەڵاتداران. هەڵبـەت هەنـدێ لـە دەستوور و پێشـنیارەکانیش ئاشکرا و سیستماتیك نین. لە هەر دوو حاڵەتدا، خاڵێك کە دەبێ پێـی لەسـەر دابگیردرێـت ئـەو میتـۆدی لێکۆڵینـەوەو ڕاڤەکاریانەیەکە ئەم ڕێگەچارانە ئەیانخاتە ڕوو. وتـاری پێنجـەم ئەم قۆناغەی تیۆرە سیاسییەکان روون ئەکاتەوە. ڕەنگە تـەرتیبی ئـەم قۆناغانـە ـ بەکردەوە ـ تـا رادەیـەکی کـەم پـاش و پێشـیان پـێبکرێـت. بـۆ نموونـە هـەر جـۆرە پێشـنیار و ڕێگەچـارەیەك لـە دواهـەمین قۆناغـدا ئەخرێتـەڕوو. ئـەو پێشـنیارانەی کـە بـۆ بڕیـارێکی تایبـەتی سیاسـی دەخرێنـەڕوو، کاتێـك پڕمانـاو پـڕ بایەخن کە پاش ناسینی کێشـە و دەستنیشانکردنیهۆکارەکانی و هـەروەها دەستنیشـان کردنـی ئـەو شـتانەی کـە ڕێگەچـارەیەك دروست ئەکـەن، بخرێنـەڕوو. تـا کاتێك کـە وەڵامـی ئـەم مەسـەلە سـەرەکییانە نەدرێتـەوە، قسـەکردن لەسـەر ڕێگەچـارە، کـارێکی یەگجار بێهوودە و بێمانایە.

هـەر بـەو پێیـە قۆنـاغی شـیکردنـەوەو ڕاڤـەکردنی ریشـەی مەسەلەکە ـ لە رووی لۆژیکییەوە ـ ناتوانێت بەرلەبینینی قەیران

ونارێکوپێکی سەرهەڵبدات، واتە ئەبێ قەیران و بێنەزمییەك لە ئارادابێت تابتوانرێت شیبکرێتەوەو ڕاڤەی لەسەر بکرێت. کەواتە تەنانەت ئەگەر لە قۆناغی خستنەڕووی تیۆری سیاسیدا ئەو ڕێکخستنە ڕەچاو نەکرێت، لە ڕەوتی لێکۆڵینەوەدا هەمیشە بەمجۆرەی خوارەوە پۆلێن دەکرێ:

١- بینینی بێنەزمی

٢- دەستنیشانکردنیهۆکارەکانی بێنەزمی

٣- خستنەڕوی ڕێگەچارە

چوارەمین بەشی ڕەوتی تیۆرسازی، واتە وێناکردنی کۆمەڵگای سەرلەنوێدروستکراو وەك "شتومەکێك کە سەرئاو کەوتبێت" وایە. ئەم قۆناغە بەڕواڵەت دەبێ بکەوێتە پێش خستنەڕوی ڕێگەچارە، بەڵام ڕەنگە لە پێش، یان لە دوای دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی بێنەزمی بخرێتەڕوو. تەنانەت ڕەنگە هەندێ جار بکەوێتە پێش بینینی بێنەزمییەوە. زۆربەی کات ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە وێناکردنی کۆمەڵگای سەرلەنوێ دروست کراو، بە شێوەی دیالکتیکی، بە بینینی بێنەزمی و دەست نیشانکردنی هۆکارەکانی، قۆناغ لە دوای قۆناغ دەربکەوێت.

قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ڕەوتەکە بە تەواوەتی پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بەڵام "گشت"ێکی یەکپارچە پێك ناهێنن. فۆرم و ناوەڕۆکی هەر قۆناغێکی توێژینەوە، بەگشتی بە قۆناغی دواتر

لە خۆی شکڵ ئەبەخشێت، بە بێ‌ئەوەی کە سنووررو فۆرم و ناوەڕۆکەکەی دەس‌نیشان بکات. لەڕەوتی لێکۆڵینەوەدا، هەر قۆناغێکی بە ئەنجام گەیشتوو، لەسەربناغەی قۆناغەکەی پێشترلەخۆی بنیات ئەنرێت. هەڵبەتە هەر قۆناغێك بەرادەی پێویست، داهێنان (خلاقیت)ی تیایە کەوای لێ‌دەکا تەنها درێژەپێدانێکی ئاسایی قۆناغی پێشتر نەبێت و لە پێڕەوی کردنێکی ڕەهای تێ‌ئەپەڕێنێت.

بۆ نموونە قۆناغی دەستنیشانکردنی سەرچاوەکانی مەسەلەکە، تاڕادەیەك لە بینینی بێ‌نەزمی‌یەوە سەرچاوە دەگرێت. چونکە قۆناغی بینینی بێ‌نەزمی، ئەو نەخۆشییانە پیشان ئەدات کە خوێندنەوە لەسەر هۆکارەکانیان دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرەتادا دەرەنجامەکانی قۆناغی "دەستنیشان کردن" روون و ئاشکرانین چونکە تەنها دەستنیشان کردنی نیشانەکانی تێکهەڵشکان، هۆکارەکانیان روون ناکاتەوە. بەمجۆرە ئەو پێشنیارانەی کە تیۆرسێن ئەیانخاتەڕوو، تەنها لە ڕێگەی خوێندنەوەی قۆناغی پێشترەوە دەستنیشان ئەکرێن. ئەبێ لە ڕێگەی بڕیارگەلێکی جۆراوجۆری ستراتژیکییەوە ڕێگەچارەی کۆتایی دەستنیشان بکرێت. سەرنج بدەنە ئەم نموونانەی خوارەوە: مرۆڤ دەتوانێ سەبارەت بەم مەسەلەیە کە ئەسینا تێك هەڵشکابوو، خۆی لەگەڵ بیروڕای ئەفلاتووندا ڕێك بخات، ئەگینا چۆن ئەیتوانی سوقرات بەمەرگ

تاوانبار بکات؟ بەڵام دەتوانێ لەگەڵ رێگەچارە کۆتاییەکەیدا ناکۆك بێت، واتە ئەو سیستمەی کە لە کتێبی کۆماردا پیشانی ئەدات، یان ئەوەکە رەنگە مرۆڤ لەو مەسەلەیەدا لەگەڵ مارکس دا هاوبیروڕابێت کە ئابووری سەرمایەداری، چینی کرێکار ئەچەوسێنێتەوە و بەخۆی نامۆی ئەکات، بەڵام دیکتاتۆری پرۆلیتاریاش بەرێگەچارەی کۆتایی نەزانێت (یان سەبارەت بەم مەسەلەیە باوەڕی بەزەروورەتی دیکتاتۆرییەتی چینی کرێکار نەبیت).

## وتاری دووهەم

# قەیران و بینینی بێ نەزمی

تیۆره سیاسییەکان وەك مرواری وان: مەبەست ئەوەیە کە بە بێهۆ نایەنە ئاراوە. زۆربەی تیۆره سیاسییەکان، یان بەلانی کەمەوە زۆربەی تیۆره "حەماسی"یەکان، لەبەر ئەوە نووسراون کە لێکۆڵینەوە لەسەر هەندێ لە کێشە ڕاستەقینەو زەرووریيەکان بکەن. ئەم مەسەلانە پێویستیان بەوە هەیە کە لە لایەن تیۆرسێنەکانەوە ئاوڕیان لێبدرێتەوە: چونکە ئەوان تەنها بە توێژینەوە رازی نابن [بەڵکوو بە قووڵی لەسەر مەسەلەکان ئەکۆڵنەوە]. زەرووره‌تی تێگەیشتن لەو کێشە سیاسییانە کە گیروگرفتێکی زۆریان لێکەوتۆتەوە و، کەسانێکی زۆریشیان تووشی کێشەوگرفت کردووە، تیۆرسێنەکانی ناچار بە نووسین کردووە.

لەسەردەمانێکدا کە خەڵك بەختەوەرن و کەمتر بیانوویەك بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرانبەر بارودۆخی کۆمەڵگا لە ئارادایە، تیۆره سیاسییەکان بەدەگمەن سەرهەڵ ئەدەن [واتە تەنها سەردەمە

ئـــاڵۆزو قەیرانییـــەکانن کـــە دەبنـــەهۆی ســـەرهەڵدانی تیـــۆرە سیاسییەکان]. ئەو قسەیەی ئیدمۆندبرێك زۆر ڕاستەکە ئەڵێ:

ئـــەوی داواکارییـــەکی زۆرهەیـــە بـــۆ تیـــۆرە سیاســـییەکان، ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە کۆمەڵـگا بە شێوەیەکی خراپ بەڕێوە ئـەبرێت. هـەروەها دەڵـێ: کۆمـەڵانی خـەڵك کاتێك کەخۆشحاڵن، هـیچ حـەز و تاسـەیەکیان بەرانبـەر تیـۆرە سیاسـییەکان نییـەو هەرگیز بەدوایاندناچن. لە ڕاستیدا ئەگـەر خـەڵکی کۆمەڵـگایەك بە رەغبەتـەوە لـە تیـۆرە سیاسییەکان بڕوانن، ئـەوە دەگـەینێ کە وڵات بە شێوەیەکی خراپ و ناڕێك و پێك بەڕێوەئەبرێت.

ئەمریکییـــەکان بایـــەخێکی ئـــەوتۆ بـــە تیـــۆرە سیاســـییەکان نادەن و رەنگە هۆیەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیانەی لە سـەرەوە باسمـان کـردن. ئـەوەش بـەو مانایـە نییـە کـە ئـەمریکا تووشـی پشـێوی و پێکـدادانی سیاسـی نـەبوە، بـەڵکوو زۆربـەی کـات ئـەو نـاکۆکی و پێکدادانانـەی کـە لـەو کۆمەڵـگایەدا هاتۆتـە ئاراوە، لـە بەرژەوەندییە تاکەکەسی و بەکۆمەڵەکانەوە سەرچاوەیان گرتـووە و کـەمتر لـە سـەر پرەنسـیپە بنەڕەتییـەکان ململانێیـان کـردووە. زۆربەی کـات پێکادانـە سیاسییەکان لـە ئەمـەریکادا سـەبارەت بـە پرەنســـیپەکان لـــە چوارچـــێوە و ئســـوڵێکی پەســـەندکراودا دەرئەکەوێت کە تەنانـەت بـە تـەواوەتیش پێناسـە نـەکراون. لەبـەر چـەندین هـۆی مێـژوویی و کۆمـەڵ ناسـانە، گرنگیـی گریمانـە لیبراڵییەکانی جۆن لۆك سەبارەت بە نـەزمی سیاسـی، تـا ڕادەیـەك

بـە مەسـەلەیەکی پەسـەندکراو لـە قەڵـەم ئـەدرێت. ئـەم باوەڕانـە هێندە پەسەند ئەکرێن کە تەنانەت هۆی "بوون"یشیان فەرامۆش دەکـرێ. لـوییس هـارتز دەڵـێ: لـە ئـەمریکادا هـەرگیز بزاڤ، یـان حیزبێکـی سیاسـی لیبرالْ بـوونی نـەبوە. تـەنها شـتێك کـە هـەبوە شێوەی ژیـانی ئـەمریکی بـوە کـە لـە ڕاستیدا ئەوەش کاریگـەری ئەندیشەکانی جۆن‌لۆکی لەسەربوە بەبێ‌ئـەوەی ئاگاداری ئـەوەش بن کە ئەندیشەکانی لۆك ئەو کاریگەرییەی لەسەرداناون.

ئەمریکییـــەکان کـــە لەپەســـەندکردنی بونیـــادی بـــاوەڕە سیاسـییەکانی کۆمەڵگاکـەیان ــکـەزۆربەشـیان سیسـتماتیك و ناسـراونین ـ تـا ڕادەیـەکی زۆر ڕازیـن، لـە سیاسـەتدا پێـڕەوی لـە بۆچوونی "ڕەسەنایەتی کردەوە" دەکـەن. ئەگـەر بناغـەو بونیادی سیستمێك، پایەدار و پتـەو بێت، یـان باوەڕێـك لەمەڕ پتـەوبوونی ئەو بناغەیە لەئارادابێت، مەسـەلە تایبەتـەکانیش یـەك‌لـەدوای‌یـەك و لەرێگـــەی "تاقیکـــاری" و "هەڵـــەکردن"ەوە کۆتاییـــان دێـــت. ئەمریکییـەکان لـە جیـاتی ئـەوەی کـە بایـەخ بەڕیشـەی مەسـەلە سیاسییەکان بـدەن" واتـە ئـەو قەڵـەمڕەوەی کـە تیـۆرسـازی تیایـدا زەرروورەت پەیـدا ئـەکات، بـە پێچـەوانەوە لـە ڕێگـەی هەنـدێ "پێکدادانی ناشیانە"وە هەنگاو هەڵ دەگرن.

بـە پێـی قسـەکەی ئیدمۆنـدبرێك ئـەم بایەخنەدانـە بـە تیـۆر سـازی، ڕەنگـە لـە بـارودۆخێکی ــ تـا ڕادەیـەك ــ سـەقامگرتووی سیاســی‌یــەوە سەرچـاوە بگرێـت. هەڵبەتــە هەرچــەند ئــەوە

ئیمتیازێکی باشی کردەیی و سیاسی‌یە، بەڵام زیان بە رەوتی "بیرکردنەوە" ئەگەینێت. هەرچەند نەبوونی ئاڵۆزێتی فکری و هەروەها لێهاتوویی فکری لەریزی لایەنە پۆزەتیڤەکانی سیاسەتی ئەمریکا دائەنرێن بەڵام شتێك نییە کە بتوانین لە مێژووی ئەندیشەدا شانازیی پێوە بکەین.

ئەگەری ئەوە لەئارادایە کە بایەخ نەدان بە تیۆرە سیاسییەکان زیانگەلێکی کردەیی زۆری لی‌بکەوێتەوە. بۆ نموونە یەکێك لەو هۆیانەی کەئەمریکا ناتوانێت لە وڵاتان و گەلانی دیکە تی‌بگات و پێوەندییان لەگەڵ دابمەزرێنێت، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم مەسەلەیە. هەرچەند هەندیٚ پرەنسیپ لە ئەمریکادا زۆر گرنگن، بەڵام ئەوە ناگەینێت کە دەبیٚ هەموویان باوەڕیان پێیان هەبێت. ئەوە خەیاڵێکی خاوە کە ئەمریکییەکان وا لی‌دەکا نەتوانن سەرچاوەی کێشمەکێشە نێودەوڵەتییەکان و هەروەها ئەو ڕێگەچارانەی کە دەیانخەنەڕوو بناسن تێیابگەن. رەنگە زۆربەی ئەمریکییەکان وەك ئەو سناتۆرە بن کەنەیدەزانی بۆچی عەرەبەکان و ئیسرائیلیەکان وەك مەسیحییە چاکەکان، پێکەوە دانانیشن و کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

تەنانەت لە بواری سیاسەتی ناوخۆییشدا، ڕەنگە ئاڵۆزنەبوونی تیۆرەکان، زیانگەلێکی زۆری لی‌بکەوێتەوە. رەنگە هەندیٚ کێشەی سیاسی، هێندە گەورەبن کە تەنها لە رێگەی "زرمو کوتی نەزانانە"وە چارەسەرنەکرێن. مرۆڤ ئەگەر

سەرچاوەی کێشـەکان نـەزانێت، رەنگـە لـە چـالێك بێتـەدەرەوەو بکەوێتە چالاێکی ترەوە.

## بەکۆمەلایەتیکردن و هەڵسەنگاندن

کاتێ کە دۆخێکـی کۆمەلایـەتی لـە ئارادایـە، شـیکردنەوەو ڕاڤـەکردنی نـەزمی سیاسـیش هـەم بێفایدەیـەو هـەمیش دژوارە. ئامانجی ڕێکخراوە ئیدارییەکان لە هـەر کۆمەڵگایەکدا ئەوەیـە کـە تاکەکانیان هان بدەن بیروڕا زاڵـەکان قبـوولْ بکـەن. منـالان هـەر لـە سەرەتاوە فێری ئەوە دەبن کە تێگەیشتنە دروسـتە سیاسـییەکان و هـەروەها رەفتـارە گونجاوەکـان کامانـەن؟ بـۆ نموونـە، خـەڵك لـە ئەمریکادا فێری ئەوە دەبن کە "شێوەی ژیانی ئەمریکی" یـەگجار باشـەو هـەروەها "ئـازادی" و "دیموٚکراسـی" شـتێکی بـاش و بەکەڵکن، هەر بۆیە سیستمی سیاسـی ئـەو وڵاتـە (واتـە ئـەمریکا) نوێنـەری ڕاسـتەقینەی ئـازادی و دیموٚکراسـییە. هەرچـەند ئـەم ڕەوتـە لـە سیسـتمە سیاسـییەکانی دیکـەش‌دا بـە هـەمان شـێوەیە بەلام ناواخنی پەیامەکانیان لێك جیاوازن. منالێکی کووبایی هـەر لە سەرەتای منالییەوە فێری ئەوەدەبێ کە "ئیمپریالیزمی‌یانکی" مەترسـیدارترین دوژمـنی کۆمەڵـگایە و هـەروەها فێـری ئـەوەش دەبێ کە فیدل کاسترۆ ڕێبـەرێکی مەزنـەو وڵاتەکـەی ئـەوی ڕزگـار کردووە.

راستییەکانی جیهانی سیاسەت لە ڕێگەی فێرکاری و ڕاهێنانەوە ـ بۆنموونە لە ڕێگەی خوێندنگە ڕەسمییەکانەوە، یان ڕێزگرتنی ئالاوە ــ هەروەها تارادەیەکیش لە ڕێگەی فێرکارییە ناڕەسمییەکانەوە، یان لاسایی کردنەوەی ڕەفتار و کرداری ئەوانی ترەوە، بەسەر خەڵکدا دەسەپێنرێن. ئەگەر کەسانی دەوروبەرمان بە بیستنی هەندێ وشەی وەك کۆمۆنیزم، فاشیزم، یان ئیمپریالیزمی یانکی ترس دایانبگرێت، مرۆڤەکانی تریش بە هەمان شێوە ئەوانە بە دیاردەگەلێکی مەترسیدار لە قەڵەم ئەدەن. هەر بەو پێیە ئەگەر کەسانی دەوروبەرمان بەرانبەر دەستوری وڵات"دامەزرێنەرانی کۆمەڵگای ئەمریکی" یان "وڵاتی سۆسیالیستی" وەفاداربن و ڕێزیان لێ بگرن، ئەوانی دیکەش بەو دەرەنجامە دەگەن کە ڕێزگرتنیان کارێکی باشەو کەواتە دەبێ پێیان وەفاداربن.

خانمی لیلیان سمیت لە کتێبەکەیدا لە ژێرناوی "بکوژانی خەون" کە سەبارەتە بە سەردەمی منداڵی خۆی لە باشووری ئەمریکادا، نموونەیەکی یەگجار باش و گرنگ لەبارەی "ڕەوتی بە کۆمەڵایەتی کردن" دەخاتەڕوو. سمیت باس لە شێوەگەلێك دەکا کە لەرێگایانەوە، باوەڕە سیاسییەکان و ڕەفتارە دروستە کۆمەڵایەتییەکان، بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا، بە تایبەت لاوان دا، دەسەپێنرا:

هیچکەس بە شێوەیەکی رەسمی فێری ئەو بابەتانە نەئەبوو، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئێمە وانەکان باش فێر بووین. ئێمە زۆرشت فێربووین وەك" سیستمی ئاڵۆزی حەرامەکان، تاوانەکان و پاداشەکان، گۆڕینی دەنگ و لەحن و وشە و هەستەکانمان لەکاتی دەربڕینی رستەکاندا، لەکاتی رۆیشتنمان بۆ ئاودەس و هەروەها لەکاتی کایەکردندا. نایەتەوەبیرم چۆن و کەی ئەوەم زانی کە خوامیهرەبانەو عیسا کوڕیەتی و بۆ دابەش کردنی خێرو بەرەکەت بەسەر مرۆڤدا نێردراوە و هەروەها فێری ئەوە بووین کە هەموو خەڵك لەیەك دایك و باوکەوە خوڵقاون. لەگەڵ ئەوەشدا فێربووم کە من لە رەشپێستەکان باشترم و ئەوان لە ناو کۆمەڵگادا پلەو پایەیەکی نزمتریان هەیە و دەبێ هەر بەهەمان شێوەش بمێننەوە. فێری ئەوەش بووین کە "سێکس"ی بەر لە دەس پێکردنی ژیانی هاوبەش (ئیزدواج) کارێکی خراپەو هەروەها ئەگەر من بەرەچاوکردنی یەکسانی و بەرابەری، لەگەڵ رەشپێستەکاندا هەڵسوکەوت بکەم باشوور [وڵاتە یەکگرتووەکان] تووشی کارەساتێکی وێرانگەردەبێ.....

پرۆسەی فێرکردنی من هەر لەرۆژی لە دایك بوونمەوە دەستی پێکرد و لە ناوچوارچێوەیەکی هێندە ئاڵۆزو گەورەدا پەروەردەبووم کە ناکرێ بە کورتی وەسفی بکەم. فێربووم چۆن خۆم لەگەڵ ڕێساکاندا بگونجێنم. فێربووم کە چۆن دەکرێ لەیەك کاتدا هەم مەسیحی بم و هەم سپی پێستێکی باشووری.

دەشکرێ لەیەك کاتداهەم خانمێکی بەڕێز بم و هەم بوونەوەرێکی دڵڕەق و لەخۆبایی. دەکرێ شەوانە عیبادەت بکەیت و ڕۆژانەش سواری ئۆتۆمبیلی تایبەتی سپی‌پێستان بیت و هەر دوو کارەکە بەئاسانی ئەنجام بدەیت. فێربووم باوەڕم بە دیموکراسی هەبێت و بە بیستنی وشەی دیموکراسی، شادی و خۆشییەکی لەڕادەبەدەر دامبگرێت. بەڵام بەکردەوە هەر لە بەیانییەوە تاشەو، کار لە کۆیلەکان بکێشمەوە و بیانچەوسێنمەوە. ئێمە زیاتر لە ڕەفتارەکانمانەوە شت فێر ئەبووین، وەك لە پەند و ئامۆژگارییەکان. لە برۆ هەڵخستنێك، نوکتەیەك، دەنگێکی لەرزۆك، جووڵەیەکی دەست یان دەم وچاو و هەروەها بێ‌دەنگییەکی درێژ خایەنەوە زیاتر شت فێر ئەبووین وەك لە رستەیەکی درێژ.

بەتەواوەتی فێربوونی ئەم وانەگەلە، کاریگەرییەکی یەگجار زۆر لەسەر نەقشەی جیهانی سیاسەت دادەنێ و نابێ بەشتگەلێکی ئاساییان لە قەڵەم بدەین. وادیارە پێویست نەکات و گونجاو نەبێت بەشێوەیەکی نرمنی باس لەوانە بکەین، بەڵکو واباشترە بەڕاشکاوانە باسیان بکەین. قسەیان لەسەر بکەین، ئەگینا وامان لێ دەکا ئەوانە نەك بە حەقیقەتێکی پەسەندکراو، بەڵکوو بە وتەزاگەلێکیان لەقەڵەم بدەین کە قابیلی قسە و باس

لەسەر کردنن. ئەم باوەڕانە لە ڕێگەی ویژدانی خودئاگاوە دزەئەکەنە ناو ڕەگ و خوێنی مرۆڤەوە و ئیدی لەو کاتەدا لەناوبردنیان کارێکی یەگجار سەخت و دژوارە.

ڕەوتی بە کۆمەڵایەتی کردن، بەشێکی حاشاهەڵنەگری هەر کۆمەڵگایەکی سیاسییە. هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ سەلماندنی ئامانجەکان و فەلسەفەی وجودیی خۆی بە تاکەکانی، ناتوانێت درێژە بە ژینی بدات و گەشەبکات،خۆ ئەگەر نەیتوانی کارێکی وابکات، مەشرووعییەتی خۆی لە دەست دەدا. بەواتایەکی دیکە ئەگەر کۆمەڵگایەك نەتوانێت بایەخ و گرنگیی خۆی بە ئەندامەکانی بسەلمێنێت، ناشتوانێت داوای وەفاداری وهاوکاری کردنیان لێبکات. ئەگەر شتێکی لەو جۆرە رووی دا، ئەوا لەو حاڵەتەدا کۆمەڵگا ڕووبەڕووی مەترسی بوەتەوە و ئیدی ناتوانێت لێبڕاوانە هۆکارە دەرەکییەکان لە ناوببات. لە لایەکی تریشەوە، نەزمی کۆمەڵایەتی ناوخۆییش هەڵئەوەشێتەوە.

بەم هۆیەوەیە کە تیۆرەکان و تیۆرسێنە سیاسییەکان، زۆربەی کات بە "رووخێنەر" لە قەڵەم دەدرێن. ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان ئەوەیە کە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی سیستمی سیاسی، بە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە بخەنەبەر ڕاڤە و لێکۆڵینەوە. لەو حاڵەتەدا، ئاسایی دەبێ ئەگەر دەسەڵاتداران شیکردنەوەی ڕاڤەکارانەی ئامانجەکانی کۆمەڵگا بەشتێکی ناحەز و بگرە مەترسیداریش لە قەڵەم بدەن. تیۆرە سیاسییەکان ڕەنگە تەنانەت

"یەککگرتنی کۆمەلاّییەتی"ش بخەنە ژێر پرسیارەوە، یان مەشرووعییەتی سیستمی فەرمانڕەوا رووبەڕووی مەترسی بکەنەوە. لە روانگەی دەسەلاّتدارانەوە باشترین حالّەت ئەوەیە کە خەلّك، لە جیاتی ئەوەی رەخنە لە باوەڕە سیستماتیکەکانی کۆمەلّگا بگرن، بە پێچەوانەوە بە نۆرمگەلێکی پەسەندکراویان لە قەلّەم بدەن.

نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەسینایییەکان، سوقراتییان بە تاوانی مەترسیداربوون بە مەرگ مەحکووم کرد. لەراستیدا ئەوە عادەتەکەی سوقرات بوو کە بواری بۆ دادگایی کردن و پاشان لە سێدارەدانی ئەو خۆشکرد: واتە هەموو ئەوشتانەی کە ئەوانی تر بەدیاردەگەلێکی ئاساییان لە قەلّەم ئەدا، ئەو بەپێچەوانەوە گومانی لێئەکردن. سوقراتیان بەوە تاوانباردەکرد کەبێدینەو لاوان فاسد ئەکات، چونکە ئەو، بە تەعبیری خۆی، رۆشنبیرێکی "مێشوولە" ئاسابوو. [کە کاری چزاندن و وشیارکردنەوەی خەلّك بوو] ئەو لاوانەی کە دەیانویست لە بەردەم وانەکانی سوقراتدا ئامادەبن، گومان کردنی سوقراتیان لە باوەڕە زالّەکان وەك شتێکی هاندەر و پالّنەر ئەبینی. لە لایەکی ترەوە، دەسەلاّتدارانی دەولّەتشاری ئەسینا، کە بارودۆخێکی لەرزۆك و ناڕێك وپێکیان هەبوو، ئەو گومان کردنانەیان بەمەسەلەیەکی مەترسیدار و هێرشکەر لە قەلّەم ئەدا. کەواتە، بەوهیوایەی کە بێدەنگی بکەن، یان ناچاری بکەن کە قسەکانی

خۆی بە درۆ بخاتەوە و واز لەو جۆرە قسانە بێنێت، دەسگیریان کرد. کاتێك ئەو کارەیان کرد و سوقراتیش ڕازی بە دوورخستنەوە (تبعید) نەبوو، کوشتیان.

کەواتە، تیۆر سازیی سیاسی دەتوانێ کارێکی مەترسیدار بێت. ئەو پرسیارانەی کە تیۆرە سیاسییەکان، ئەیانخەنەڕوو، هەمیشە دڵخوازو لەبارنین. کۆمەڵگا دیکتاتۆرییەکان، بەجەختەوە ڕێباز گەلێك هەڵئەبژێرن کە نایەڵن هیچ جۆرە تیۆرێکی سیاسی ڕەخنەگرانە چرۆبکات و گەشەبکات. ئەم سیستمانە، وەك هەندێ کۆمەڵگای ژێردەستی حکوومەتە مەزهەبییەکانن کە تیایاندا تەنها باوەڕە "ڕەسمی و ئورتۆدۆکسییەکان" برەویان هەیە. هێندەی پێوەندی بە باوەڕی سیاسییەوە هەبێت، ئەوە تەنها ئایدۆلۆژیای ڕەسمی یە کە قابیلی پەرەپێدانە. هەرجۆرە گومانکردنێك لە پرەنسیپگەلی باوەڕە زاڵەکان، بە "بدعت" و بێ‌دینی لەقەڵەم ئەدرێت.

بەڵام بارودۆخەکە لەکۆمەڵگا لیبراڵەکاندا تاڕادەیەك جیاوازە. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا، ئازادی ڕادەربڕین مسۆگەرکراوە و لەحاڵەتێکی وادا دەکرێ بەشێوەیەکی جیدی بە دوای تیۆرە سیاسییەکاندا بڕۆین. لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا، ئەوشتەی کە بە قسە قبووڵ دەکرێ ڕەنگە بەکردووە ژێرپێ‌بخرێت. هەرچەند ئەمریکاییەکان بەقسە داکۆکی لە ئازادی ڕادەربڕین دەکەن بەڵام توێژینەوەکانی زانستی

سیاسی و هەروەها مێژووی تیۆرە سیاسییەکان لە ئەمریکادا ئەوە پیشان ئەدات کە رەنگە مۆڵەت بەدەرکەوتنی ئاشکرای ئەندیشە دژە ئەمریکاییەکان نەدرێت. پێدەچێت سوقراتەکان لە ئەمریکادا هیچ شوێنێکیان نەبێت. ئەمریکاش وەك زۆربەی کۆمەڵگاکان حەزئەکات وەسف و ستایشی سیستمە سیاسییەکەی بکرێت، وەك لەوەی رەخنەی لیٚبگیردرێت.

چونکە ئەو پرسیارانەی کە بە هۆی تیۆرە سیاسییەکانەوە دەخرێنەڕوو، رەنگە بە "رووخێنەر" لە قەڵەم بدرێن، هەروەها لەبەر ئەوەی کە رەنگە تیۆریسازی کارێکی مەترسیدار بێت، "لیڤیستراوس" دەڵێ: لەکاتی خوێندنەوەی کتێبەکانی تیۆرە سیاسییەکاندا دەبێ ئەم خاڵە لەبەرچاوبگیردرێت: رەنگە تیۆرسێنیك زۆر بە پارێزەوە هەندێ قسەی کردبێت، بە تایبەت ئەگەر گیانی لا شیرین بێت ونرخی بۆ دانا، هەر بەم هۆیەوە دەبێ هەندێ لەبەرهەمەکانی تیۆرە سیاسییەکان بەوردبینییەکی زۆرەوە بخوێنرێنەوە و مانای پیتەکان لەدووتوێی وشەکانەوە هەڵێنجێنین.

بەرهەڵستی کردنی ئەم داکۆکیکردنە کۆمەڵایەتی و ناوخۆییانە لەبەرانبەر تیۆرسازی سیاسیدا، لەسەردەمە قەیرانییەکاندا تاڕادەیەکی زۆر، کەم دەبێتەوە. کاتێك بارودۆخەکە تێك دەچێ و تێگەیشتن لە مەسەلەکانیش دژوارتردەبێ، خەڵکیش رەغبەتێکی زیاتریان دەبێت بۆ

گومانکردن لەو باوەڕانەی کە پێشتر بە "حەقیقەت" لە قەڵەمیان ئەدان. ڕەنگە دەسەڵاتداران حەزبکەن ڕێگەبگرن لە خستنەڕووی ئەو مەسەلانەی کە بەڕووخێنەریان دەزانن. بەڵام خەڵك ڕۆژلەدوای ڕۆژ لەوە تێدەگەن کە ئەبێ بایەخێکی زۆر بدەن بەو پرەنسیپە بنەڕەتییانەی کە بەسەر ژیانی سیاسیدا زاڵن. ڕەنگە بە سەختی بتوانرێت گومان لەو باوەڕانە بکرێت کە پێشتر قبووڵ کراون، بەڵام کاتێك کە ئەم باوەڕانە کێشەو گرفتیان لێدەکەوێتەوە بە ئاسانی دەتوانرێ گومانیان لێبکرێت.

بۆ نموونە لەسەردەمە ئارام و هێمنەکەی ١٩٥٠ زایینیدا، بیرمەندانی زانستی سیاسەت لە ئەمریکادا، پێشبینییان کرد کە تەمەنی "سەردەمی ئایدۆلۆژیا" بەسەرچووە. بەڵام دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکانی دەیەی ١٩٦٠ز، بایەخی ئەو پێشبینی کردنەیان ـ لانی کەم بۆ ماوەیەك ـ لەناو برد. زۆربەی ئەمریکاییەکان بە هۆی ناڕەزاییەتییان بەرانبەر شەڕی ڤیتنام و نادادپەروەرییە سیاسییەکان و هەروەها ناسەقامگیربوونی شارستانییەت و نەزمی کۆمەڵایەتی، حەزێکی تازەیان بەرانبەر تیۆرە سیاسییەکان تیا دروست بوو. "چەپی نوێ" تیۆرە توندڕەو و سۆسیالیستی و ئانارشیستییەکانی پەرەپێدا. لیبراڵەکان ناچار بوون فەلسەفە سیاسییەکەی خۆیان بە شێوەیەکی تازەتر هەڵسەنگێنن و بیکەن بەشتێکی زانستیانە و داکۆکیشی لێبکەن. هزرمەندە کۆن پارێزەکان هەوڵیاندا ئەوە بسەلمێنن کە

پرەنسیپە سیاسییەکانیان ئەتوانن ئەو مەسەلانەی کە لە ئارادان چارەسەربکەن. کاتێك قازانی سیاسەت هاتەکوڵ، "گۆنجاوێتی و پێوەندی" نێوان تیۆرەسیاسییەکان دەردەکەوێ.

## بینینی بۆنەزمی

ئەو قەیرانانەی کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی تیۆرەکان، لە شێوەگەلی جۆراوجۆردا دەرئەکەون. رەنگە قەیرانێك بۆ هەموو کەسێك روون بێت ـ بەلای کەمەوە لە ئاستی دەرکەوتنی هەندێ هێماونیشانەدا ــ و، هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بگرێتەوە و کارێگەری لەسەر ژیانی هەموویان دابنێت. لێکپچڕانەکان و ئەو کارەساتە گەورانەی کە بە شێوەی شەڕە ناوخۆییەکان و قەیرانە ئابوورییەکان، رووبەڕووی کۆمەڵگا مرۆییەکان ئەبنەوە و کێشەیان بۆ سازدەکەن، نموونەگەلێکی روون و ئاشکران، ئەگەر هەموو کەسێك لەگەڵ دراوسێکانیدا خەریکی شەڕکردن بێت، ئەگەر رێکخستنی کۆمەلآیەتی و ئاسایشی تاکەکەسی لەناو چووبێت، وە ئەگەر زۆربەی خەڵك دەسکورت و هەژاربن، رەنگە تەنها گرووپێکی بچووکی کۆمەڵگا باوەڕیان بە چارەسەکردنی کێشە زەرورییەکانی کۆمەڵگا نەبێت [چونکەخۆیان لە خۆشگوزەرانیدا ئەژین و دەرك بە کێشەکانی ناو کۆمەڵگا ناکەن].

هەندێ جار رەنگە تەنانەت لەم جۆرە بارودۆخە قەیرانییانەشدا، دەرککردنی کێشەکان کاریکی ئاسان نەبێت.

هەندێ جار هەموو لایەك ئەوەیان قبووڵە كە كۆمەڵگا تووشی هەندێ كێشەبووە، بەڵام بۆ ناسینی كێشەی سەرەكی یەكبیروڕامان نییە. بۆ نموونە، جەنگ و كوشتاری ناوخۆیی و قەیرانی بەربەبڵاوی كۆمەڵایەتی، بە ئاشكرا ئەوە ئەگەینن كە كێشەیەك لە ئارادایە، بەڵام پێویستە لەوە بكۆڵینەوە كە ئایا هۆی سەرەكی دەگەڕێتەوە بۆ ستەمگەرێتی دەوڵەت، یان لاوازی و بێهێزبوونی؟! بۆ نموونە كێشە و ململانێكانی دەیەی ١٩٦٠ز ئەمریكا لە بەرچاوبگرن. هەموولایەك لەسەر ئەوە هاوبیروڕابوون كە ئەم رووداوانە ئەوە دەگەینن كە كێشەگەلێك لە ئارادایە كە ئەبێ ئاوڕیان لێ بدرێتەوە، بەڵام تاقمێك هۆكاری ئەو رووداوانەیان ئەگەڕاندەوە بۆ "هەبوونی ئازادی لەرادەبەدەر" و گرووپێكی تریش بۆ "سەركوتكردنی ئازادی". هەندێ داوەری كردنی پێمپراو لەگریمانە، بە ئاشكرا كاریگەری دیاریان لەسەر دەستنیشانكردنو تەنانەت پێناسەكردنی كێشەكە دانابوو.

رەنگە قەیرانەكانیتر، یەگجار بەرتەسك و تەنانەت نادیاریش بن و كاربەدەستانی سیستمی سیاسی بە ئاسانی نەتوانن دەركیان پێبكەن. رەنگە گرووپێك وا تەسەور بكەن كە هیچ كێشەیەك لەئارادا نییە و كەواتە ناكۆكییەكان هەر لەوێوە دەست پێدەكەن. بۆ نموونە لە كاتێكدا كە ماركس، هەژاری و دەسكورتی چینی كرێكاری بەریتانیای بە قەیرانێك لە قەڵەم ئەدا، ئەوانی تر ئەم مەسەلەیان بەدەرەنجامێكی زەرووری یاسا

حاشاهەڵنەگرەکانی جیهانێکی ناکامڵ لە قەڵەم ئەدا. کەواتە، ئەو قەیرانەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی تیورێکی سیاسی، رەنگە لە هەندێ حاڵەتدا ناوچەیی و تاکەکەسی بن، نەك گشتی و جیهانی. لەوانەیە تیۆرسێن بەنیسبەت ئەو بونیادە سەرەکییانەی کە بەسەر سیستمێکی سیاسیدا زاڵن، لەبەر چەند هۆیەك کە بۆ بەشەکانی تری کۆمەڵگا نادیار و نەناسراون، تووشی دڕدۆنگی (توهم) بووبێت و رەخنەیان لێبگرێت. رەنگە مارکس لە ریزی ئەو کەسانەدا بێت کە بە هۆی باوەڕە زاڵەکانی کۆمەڵگاوە زەرەر و زیانێکی زۆری چەشتبێت، یان تەنانەت رەنگە قسەکانی ئەو سەبارەت بە نادادپەروەری و هەڵوەشانەوەی ئاکاری، وەکوو "مشت بۆ دیوار هاوێشتن" بێت، کە ئەوانی تر، یان ناتوانن، یان نایانەوێت گوێی لێبگرن.

دوا ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان تێگەیشتن و روون کردنەوەی نەزمی راستەقینەیە لە کۆمەڵگادا بەڵام ئەم ئامانجە لە بینینی وێرانیو بێنەزمییەوە دەست پێدەکا. لە راستیدا ئەم رەوشی دۆزینەوەی رێگەچارە، واتەروێشتن لە هەڵەوە بۆ راست، تەنها تایبەت بە تیۆرە سیاسییەکان نییە. نموونەگەلێکی زۆری ئەزموونە رۆژانەکان و هەروەها لێکۆڵینەوە لە بوارەکانی تردا، ئەوە دەرئەخەن کە ئەم رەوشە رەوشێکی ئاسایی و قابیلی پەسەند کردنە.

بۆ نموونە ئەگەر من زانیارییەکی یەگجار کەمم سەبارەت بە دروست کارکردنی مۆتۆری ئۆتۆمبیلەکەم هەبێت، تاڕادەیەکی زۆر ئەو زانیارییانەم دەگەڕێنەوە بۆ خراپبوون و بەرێکوپێك کارنەکردنی مۆتۆری ئۆتۆمبیلەکەم. رۆژێکیان کەحەماوەی مۆتۆری ئۆتۆمبیلەکەم بەرزبۆوە، لەگەڵ پۆمپی ئاوو جۆری کارکردنی ئاشنا بووم. شەوێکیان کە ئۆتۆمبیلەکەم کوژایەوە، لەگەڵ دینامۆ و جۆری کارکردنی ئاشنا بووم. هەروەها هەندێ گرفتی دیکە کە وایان لێکردم تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ جۆری کارکردنی مۆتۆرێکی ساغ و بێنوقساندا ئاشنا بووم. ئەم جۆرە فێربوونە یەکجار سەختەو دیارە زۆرکەسانیتریش، تاقی کردنەوەی لەو جۆرەیان هەبووە.

"ئێدمۆندکان" توێژەرەوەی بەرجستەی زانستی ماف دەڵێ" ئەم شێوازە لە رشتەی مافیشدا کاری پێ ئەکرێت. بە بیروڕای ئەو، تەنها لە ڕێگەی بیرکردنەوە و تێڕامانی ئەبستراکتەوە مرۆڤ ناتوانێ لە دادپەروەری تێبگات. مرۆڤ لە بۆشایی"خلاء"دا ئەو پرسیارە ناکا کە "دادپەروەری چییە؟" ئەم پرسیارە تەنها لە کاتێکدا مانای هەیە کە مرۆڤ بەردەوام خەریکی چاککردنی بارودۆخێك بێت کە لای ئەو نموونەیەکی شازی نادادپەروەرییە. مرۆڤ نۆرمەکانی رەفتاری دروست و هەروەها یاسادادپەروەرانەکان، بە شێوەیەکی تێخوێندنەوەیی "استقراء"یی لە پرەنسیپە فەلسەفییەکانەوە هەڵناهێنجێت،

بەڵکوو پاش قەرەبووکردنی ستەم و ڕێگرتن لەدووبارەبوونەوەی ئەوستەمە، هەوڵ ئەدا فۆرمیان پێ ببەخشێت. "کان" دەڵێ:

ئەگەر دادپەروەری بە پێی عادەت، بە میتۆد، یان مەرجێکی یۆتۆپیایی لە قەڵەم بدرێت، هەڵوێستی مرۆڤیش لە بەرانبەریدا جگە لە تێڕامان و بیرکردنەوە، هیچی‌ترنییە. بەڵام هەڵوێستی مرۆڤ لە بەرانبەر نموونەیەکی حەقیقیدا، یان تەسەورکردنی نادادپەروەرییەك، شتێکی جیاوازە. ئیحساسێکی تەواو زیندووە کە لە دەماروخوێنی مرۆڤدا جەرەیانی هەیە. دادپەروەری بەو مانا قامووسییەی کە بەکاری دەهێنن، بریتییە لە ڕەوتێکی چالاکانە بۆ چارەسەرکردن، یان ڕێگرتن لە پێکهاتنی ئەو بارودۆخەی کە هەست کردن بە نادادپەروەری دەبێتە هۆی ڕاچڵەکاندنی.

کاتێك لەگەڵ مرۆڤدا بە شێوەیەك ڕەفتار دەکرێ کە "کەسایەتی مرۆڤ" ژێرپێ‌دەخرێت، یان نابەرابەری و نایەکسانی بە شێوەیەکی ناجوامێرانە ئەخرێتەگەڕ، یان بەشێوەیەکی نابەجێ و نادروست لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتار دەکرێ، هەست کردن بە نادادپەروەری لە نێوانیاندا ئەبزوێت و لەدژی ئەو جۆرە نادادپەروەرییە رادەوەستێت، تا هەم ئەو نادایەروەرییە قەرەبووبکاتەوەو هەمیش ڕێساگەلێك بۆ ڕەفتاری دادپەروەرانە

بهێنێته ئاراوه تا رێگە لە سەرهەڵدانی دووبارەی نادادپەروەری لە ئایندەدا بگرێت.

کەواتە، بۆ تێگەیشتن لە بیرۆکەکانی تیۆرسێنیکی سیاسی یەکەم پرسیار ئەوەیە کە "کێشەکەی ئەو کامەیە؟" یان بە بڕوای ئەو، چ شتێك مەترسیدار، گەندەڵ یان رووخێنەرە؟ چ شتێك ئەوی هانداوە کە تێڕامان و بیرکردنەوەی زەینی، بکات بە تیۆرێکی سیاسی یەکپارچە و بنەڕەتی و بیخاتە قۆناغی نووسینەوە؟ چ ئامانجێکی هەیە؟ دەیەوێ چ کەموکوڕی و بێنەزمییەکی تایبەت چارەسەر بکات؟

تا ڕادەیەك دڵنیاین لەوەکە ئەو، بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەیەکی گرنگ و دیاریکراو کە رووبەڕووی کۆمەڵگاکەی بۆتەوە، دەست ئەداتە قەڵەم و دەنووسێت. "واڵتەر لیپمەن" لە سەرەتای کتێبەکەیدا واتە "فەلسەفەی کۆمەڵگا"، باسی هۆیەکانی نووسینی ئەو کتێبە دەکا (بەچاوپۆشی کردن لە تایبەتمەندییە جوگرافییەکانیان)، ئێمەش دەتوانین ئەو هۆیانە بۆ هەموو تیۆرسێنیکی تری سیاسیش بە کاربهێنین: [واتە هەر تیۆرسێنیك لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت کە بۆی گرنگن، دەست ئەکا بە نووسینی کتێب یان تیۆرێك] ئەو ئەڵێ: لە هاوینە نەگبەتەکەی ١٩٣٨دا دەستم کرد بەنووسینی کتێبێك تا لە رێگەیەوە لە زەین و دڵیخۆمدا ئەو بێنەزمییانەی کۆمەڵگای خۆرئاوا، کە بەردەوامیش لەزیاد دەکەن، دەرك بکەم.

ئەم هەوڵ و تەقەلایە ــ یان بەوتەی لیپمەن "تێگەیشتن لە بێ نەزمییە رووڵەزیادبوونەکانی کۆمەڵگا"ــ تا رادەیەك رەهەندێکی گرنگی وجوودیشی هەیە. هەموو تیۆرسێنیك لەناو ژیان و رۆحیدا، بێنەزمی تاقیئەکاتەوە. ئەوە ڕاستە کە قەیرانەکە "لەدەرەوەی ئەو" دایە، بەلام کاریگەری لەسەر دەروونیشی دادەنێت. قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان، هاوسەنگی دەروونیی مرۆڤە قەیراندیوەکان تێکئەدەن. هەروەك "سوزان لانگر" دەڵێ: هەر کات بە هۆی گۆڕانکارییە سەرسووڕهێنەرەکانی جیهانی دەرەوە و هەروەها نەزمی کۆمەڵایەتی، هەڵوێستە دەروونییەکانی ئێمەش گۆڕانیان بەسەرداديت، مرۆڤ کۆنترۆڵی خۆی لە دەست ئەداو باوەڕەکان سست و لاواز ئەبن و لەم ڕێڕەوەدا ئامانجە پراکتیکییەکانی ژیانی فەرامۆش ئەکرێن.

لەو روەوە کە رۆحی مرۆڤ بە تەواوەتی تێکەڵی کردەوەو سەرمەشقەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی بووە، رەنگە پشێوییە کۆمەڵایەتییەکانیش لە شێوەی شڵەژاوییەکی ئیحساسی و هەروەها پەرێشانحاڵییەکی تاکەکەسییەوە دەربکەون. لەوانەیە تیۆرسێنی سیاسی، بە هۆی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکان و لەناوبردنی بنچینەی رەنج و ئازارە رۆحییەکانی خۆی، ناچار بێت بە قووڵی بیر لە مەسەلەکانی کۆمەڵگای سیاسی بکاتەوە. بۆ نموونە رۆسۆ لە کتێبی "ئیعترافات"دا باس لەوە دەکا کە چۆن

دڵـــــەڕاوکێ تاکەکەســــییەکانی، کاریگـــــەرییان لەســـــەر تیۆرەسیاسییەکانی داناوە. جۆن ستیوارت میل، لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانی خۆیدا قسە لەسەر کەمایەسی عاتیفی ئەکات کە چۆن وای لـیکـردووە تـا دەرك بـە کـەمو کـوڕیی ئامانجـە عەقلانییەکۆمەلایەتیـەکان بکـات، لـە کاتێکـدا پێشـتر دەرکـی پێنەکردبوون: هەر ئەو ئامانجانەی کە بە هۆی فێرکارییەکانی باوکیـەوە، بـاوەڕی پـێهێنـابوون. پێدەچـێت، کـە "قـەیرانی شوناس" لە ژیانی شەخسی هێگلدا هاندەرێکی گەورە بووبێت بۆ خولقاندنی تیۆرە سیاسییەکەی.

لە راستیدا، لەبەر چەندین هۆ دەتوانین تیۆرە سیاسییەکان بەچارەسەرگەلێکی رۆحی بۆ کۆمەلگای سیاسی لە قەلەم بدەین. ئـەم هەلسەنـگاندنە چ لـەبـواری فـۆرم و چ لـە بـواری ئامـانجی لێکۆلینـەوەدا، شـتێکی بەجێیـە. خـالی دەسـپێکردنی تیـۆرە سیاسـییەکانیش، وەك دەروونشـیکاری، پەردەهەلمالینـە لەسـەر هۆکارەکـان و کرۆکـی ئـەو بـێنەزمییانـەی کـە "کـارکردخواز" و بونیادیشن. تیۆرە سیاسییەکانیش، وەك دەروونشیکاری، پێیان وایـە دەبـێ بەمەبەسـتی تێگەیشـتن لـە هۆکارەکـان و هـەروەها ریشـەی رەفتـاری مرۆڤـەکان، لێکۆلینـەوە لەسـەر ئـەو بابەتانـە بکەین کە بێنرخ لە قەلەم دراون، یان تا ئێستا راڤە نەکراون. دوا ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان، وەك دەروون شیکاری ئەوەیە کە لـە رێگـەی رووبەڕووبوونـەوە لەگـەل ریشـەی بـێنەزمییـەکان و زال

بوون بەسەریاندا هێمنیی و ئاسایش بگێڕنەوە بۆکۆمەڵگای.
ئەوەی کە تیۆرسێنی سیاسی، بەرپرسیارە لە بەرانبەر مەسەلە شەخسییەکانی خۆیدا، ئەوە ناگەیەنیٚ کە تەنها لەمەسەلەگەلێکی کۆڵیوەتەوە کە بەتەواوەتی شەخسین و هیچ نرخێکیان نییە. ئەو شتەی کە نرخ و گرنگیی بە لێکۆڵینەوەکانی دەبەخشیٚ، ئەوەیە کە راڤەی بابەتە "هەمیشەییەکانی" سیاسەتی کردووە، کاریگەری لەسەریان داناوە. هۆبس، بۆ هەڵسەنگاندنی کێشەی بیٚنەزمی مەدەنی لە کۆمەڵگای سەدەی ١٧ی بەریتانیادا لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەوە کردووە کە داخوازە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا، بەیەکەوە ئاشت بکاتەوە و پێکەوە بیانگونجێنێت. رۆسۆ، بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر گەندەڵی کۆمەڵگای فەرەنسەی سەدەی هەژدەهەم، پێداویستییە ئاکارییەکانی کۆمەڵگای مرۆڤی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە و راڤەکردنەوە. مەکیاڤیلی، بەمەبەستی توێژینەوەی بیٚنەزمی ئیتاڵیای سەردەمی رێنسانس، پرسیارگەلێکی جیهانی سەبارەت بە کرۆك و پانتایی دەسەلاٚتی سیاسی خستەڕوو.

بەواتایەکی دی، تیۆرسێنی زانا و بیرمەند لە چوارچێوەکانی دەوروبەری خۆیشی تیٚئەپەڕێنێت. دیارە بارودۆخە سیاسییە تاکەکەسییەکانی ئەو، ئەو مەسەلانەی بۆ روون ئەکاتەوە کە رووبەڕوویان بوەتەوە. بەلاٚم ئەم مەسەلانە لەخۆگرو نوێنەری هەندیٚ لە مەسەلەکانی سیستەمی سیاسین کە

پێوەندییان بە هەموو کات و شوێنێکەوە هەیە. ئەو تیۆرسێنانەی کە کارەکانیان شیاوی خوێندنەوەن، هەموویان لە کێشەگەلێکی تایبەتی مێژوویییەوە دەست پێ ئەکەن و پاشان دەچنەسەر مەسەلە "هەمیشەییەکان".

زۆربەی بەرجستەترین تیۆرگەلی سیاسی، رەنگدانەوەی شڵەژاوێتی و مەترسی هەڵوەشاندنەوەی نەزمی مەدەنین [واتە بۆ ئەوە نووسراون کە بەرپرچی شڵەژاوێتی و مەترسی هەڵوەشانەوەی نەزمی مەدەنی بدەنەوە]. ئەوانە لەسەردەم و شوێنگەلێکدا نووسراون کەسیاسەت بە کردەوە، خەریکی هەڵوەشاندنەوە و هەڵگیرساندنی شەڕبووە. هەندێ روانگەی زەرووری و گرنگی لەوجۆرە، هزرمەندانی وەك مەکیاڤیلی، هوبس، برێك و لۆکی ناچار کرد کە توخمە گرنگ و سەقامبەخشەکانی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنن. بۆچی و چۆن مرۆڤەکان نایەڵن، کێشمەکێشە سیاسییەکان و رێکنەکەوتنەکانیان، ببنە هۆی هەڵوەشانەوە و رووخانی کۆمەڵگاکەیان؟ هیچ کێشەیەکی سیاسی، لەوە گرنگتر نییە، بە تایبەت لە رووی پراکتیکییەوە. جیالەوەش، هیچ کێشەیەکی سیاسی، وەك ئەم کێشەیە ناتوانێت سەبارەت بە پێکهاتەی مرۆڤ و کۆمەڵگای سیاسی، هەندێ مەسەلەی گرنگ بخاتەڕوو. خوێندنەوەی بارودۆخ و وەزعی تایبەتی ئەم تیۆرسێنە حەماسییانە، رەوشی ناوبراو باشتر روون ئەکاتەوە.

# نیکۆلۆ مەکیاڤیلی و قەیرانی سەقامگیری

بۆ نموونە، لەو سەردەم و بارودۆخەدا کە مەکیاڤیلی تیۆرە سیاسییەکەی خۆی دەنووسی، بێ نەزمییەکی یەگجار زۆر وڵاتی ئیتاڵیای گرتبووەوە. یەکەم ئەوەی کە، ئەو لەکاروباری دەوڵەتی بەرکەنارکرابوو - هەلومەرجێك کەدەتوانێ هەموو کەسێك والێ بکات کە لە کێشە سیاسییەکانی دەوروبەری تێبگات - هەڵبەتە ئەمە بەشێکی سادەی مەسەلەکە بوو. کێشەی سەرەکی ئەوەبوو کە دەوڵەتشارەکانی باکووری ئیتاڵیا، لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠ ز دا بارودۆخێکی نالەباریان هەبوو، بارودۆخی ناوخۆیی زۆربەی شارەکان تێکچووبوو و ململانێ چینایەتی و خێڵەکییەکان شڵەژاندبوونی. سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان یەکلەدوای‌یەك دەهاتن و دەڕۆشتن. بێ گومان لە فلۆرانسیشدا -واتە زێدی مەکیاڤیلی -بارودۆخێکی لەو جۆرە لە ئارادابوو، چونکە ململانێی نێوان هەژاران و دەوڵەمەندەکان و هەروەها نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکانی ئەریستۆکراتەکاندا، یەگجار زۆربوو. جیا لەوەش ئەم شەڕو پێکدادانە ناوخۆییانە، دەوڵەتشارەکانی لەبەرانبەر هێرشە دەرەکییەکاندا یەگجار کزو لاوازتر دەکرد. لەشکری شارە جۆراوجۆرەکان و هەروەها تاقمی سیخوڕو هەندێ جاریش لەشکری هێزە دەرەکییەکان وەك فەرەنسە، ناوچەکانی ئیتاڵیایان کردبووە مەیدانی پەلامار و

هێرشەکانیان. بەگشتی، بارودۆخێکی باشی سیاسی لەئارادا نەبوو. پرۆفیسۆر جۆرج سابایین لەم بارەوە دەڵێ:

کۆمەڵگاو سیاسەتی ئیتاڵیا لەسەردەمی مەکیاڤیلیدا، بەگشتی پیشاندەری بێهێزبوونی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان بوو. ئیتاڵیای ئەو سەردەمە، کۆمەڵگایەك بوو کەلەرووی فکرییەوە پرشنگدارو لە رووی هونەریشەوە داهێنەربوو... بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ببوە قوربانی خراپترین گەندەڵی سیاسی و هەڵوەشانەوەی ئاکاری. دەزگا مەدەنییەکانی پێشوو کۆتاییان هاتبوو. دڵڕەقی و جینایەت، ئامرازە پەسەندکراوەکانی حکوومەت بوون" ئاکاری چاك و دروستکاری وەك خولیاگەلێکی منالانە وابوون کە مرۆڤی سەردەمی رۆشنگەری، بەدەگمەن سووچە ئاوڕێکی لێ ئەدانەوە. فێڵ و تەڵەکە، کلیکی سەرکەوتن بوو. بەرەلایی و بەدڕەوشتی وجینایەتکاری، هێندە پەرەی سەندبوو کە هەرباس ناکرێ. سەردەمێك بوو کە بەڕاستی ئەتوانین بەسەردەمی حەرامزادەکان و سەرچڵەکان ناودێری بکەین. کۆمەڵگایەك کە بەڕاستی وێنایەك لەو قسەیەی ئەرستۆ بوو کە ئەڵێ: کاتێك کەمرۆڤ لە دادپەروەری دووربکەوێتەوە، لە ئاژەڵەکانیش وەحشیتر ئەبێت.

کاتێك بنەماڵەی "مەدیچی" لە ساڵی ١٥١٢ز لە فلۆرانسدا دەسەڵاتی گرتەدەست، مەکیاڤیلی بێکار مایەوە و ئەو هەلەی بۆ رەخسا کە بە قووڵی بیر لە بارودۆخی سیاسی بکاتەوە. جیا

لەوەش مەکیاڤیلی لەسەر چەندوچوونی سیاسەتی ئیتاڵیا هەندێ زانیاری باش و بەکەڵکی هەبوو. ئەو وەك کارمەندێکی حکوومەتی فلۆرانس، لە ماوەی ١٠ ساڵ دا توانیبووی گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە نزیکەوە هەست پێبکات. بۆ نموونە مەکیاڤیلی چەندین جار نێردرابوو بۆ جێبەجێکردنی "راسپاردە"گەلێکی دیپلۆماتیکی لەو رێگەیەوە، توانیبووی چالاکی پێوەندییەکانی دەسەڵاتە دژبەیەکەکان لە نزیکەوە ببینێت و راڤەیان بکات.

مەکیاڤیلی، بەکەڵك وەرگرتن لەم ئەزموونانە، لەو بڕوایەدابوو کە سەبارەت بە مانەوە و بەهێزترکردنی سیستمی پایداری سیاسی، قسەگەلێکی زۆری پێیە بیاندرکێنێت. جیا لەوەش زۆر حەزی لە زانستی مێژوو بوو و هەر لەو رێگەیەشەوە، هەندێ ئەزموونی جۆراوجۆری سیاسی سەبارەت بە کات و شوێنەکانی‌تری خستە پاڵ ئەزموونە سەرەتاییەکانی دیکەی. ئەو ئەیوت ئەم زانیارییانە، توانای تێگەیشتن لەریشەو سەرچاوەی ناسەقامگیری (عدم ثبات) سیاسی و هەروەها توانای سڕینەوەی ئەو ناسەقامگیرییە سیاسییەی بۆ فەراهەم کردووە. کەواتە مەبەستی لە نووسین ئەوەیە کە روانگە قووڵ و پڕناوەڕۆکە سیاسییەکەی خۆی بخاتە بەردەستی ئەوانی‌تر و وایان لێبکات کە پەندو ئامۆژیاری لە ئەزموونە مێژووییەکانەوە وەربگرن.

## تۆماس هۆبس و قەیرانی دەسەڵات

بریتانیا، نزیکەی سەدەیەك دواتر، ڕووبەڕووی هەندێ دووبەرەکی سیاسی و ململانێی مەدەنی بووەوە. سەرەتا پۆلێنبەندی‌یە مەزهەبییەکان، کۆمەڵگای بەریتانیای هەڵوەشاندبووەوە. گرووپە جۆراوجۆرە سیاسییەکان، کە پاش ریفۆرمە ئایینیەکان سەریان هەڵدابوو، خۆیان بە بابەتگەلێکەوە بەستبووەوە کە پێوەندییان بە جیهانی سیاسەتیشەوە هەبوو. چینی مامناوەندی بازرگان، کە لەحاڵی گەشەکردندابوو، دەستی کردبوو بە دژایەتی کردنی چینی ئەریستۆکرات. لە سەرووی هەموو ململانێ چینایەتی و مەزهەبییەکانەوە، کێشەیەکی گەورەتر لە ئارادابوو، کە بریتی بوو لە ناکۆکی سەبارەت بەتێگەیشتن لە سیستمێکی لەباری سیاسی بۆ کۆمەڵگا. ئەم دووبەرەکییە گەورانە، لە کۆمەڵگای بەریتانیادا، سەردەمێکی سیاسی پڕ لە پشێوی و ئاژاوەی هێنایە ئاراوە. لە سەدەی هەقدەهەمدا لە ملی پاشایەکیان دا و کوشتیان، پاش ڕووخانی "کراموول" پاشایەکی‌تر دەسەڵاتی گرتەدەست و پاش ئەویش پاشایەکی‌تر هاتەسەرحوکم کە بە هۆی دەنگی خەڵك و پەرلەمانەوە بەربەستی زۆریان بۆدانا. "شۆڕشی شکۆمەند" (The Glorious Revolution)بەیارمەتی "مەنشووری ماف" و "یاسای لێك بووردن"، سەرەنجام ڕێگەچارەیەکی دەسنیشان

کرد کە بناغەیەکی زۆر پتەوی بۆ سیستمی سیاسی بەریتانیا دامەزراند. بەڵام لە ماوەی هەر ئەو سەدە پڕ لە جەنجاڵیەدا، کەسانێکی زۆر هەبوون کە پێشبینی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای بەریتانیایان ئەکرد.

قەیرانی سیستمی سیاسی بەریتانیا، هزرمەندگەلێکی زۆری هاندا کەبە قووڵی بیرلەو کێشانە بکەنەوە کە کۆمەڵگای خستبوە بەردەم مەترسی‌یەوە. ئەوان ناچاربوون بونیادەکانی سیستمی سیاسی راڤەبکەن، چونکە ئەو سیستمە سیاسییەی کە بەسەریاندا حکوومەتی ئەکرد، لە راستیدا هەر لە بنەڕەتەوە لەرزۆك و بێهێزبوو. هزرمەندی دیاری بەریتانی، ریچارد هۆکر (کە جۆن لۆك هەمیشە بە "هۆکری ئاقڵ" ناوی دەبرد) کتێبە چەندبەرگییەکەی نووسی و تیایدا هۆی نووسینی ئەو کتێبەی باس کردووە: "با وەچەکانی داهاتوو نەڵێن کە ئێمە [مەبەست هۆکرو هاوچەرخەکانی] هێندە لە بەرانبەر مەسەلەکەدا بێ دەنگ بووین کە وەك بڵێی ئەم سەردەمە لە خەونێك زیاتر هیچ نەبوە و بەوە تاوانبارمان بکەن کە کەمتەر خەمیمان کردووە.

هەندێ لە هزرمەندان توانییان لە بارودۆخی ژینگەکەی خۆیان تێی بپەڕێنن و دەرك بەمەسەلە و پرەنسیپگەلێکی زۆری بونیادی سەبارەت بە سیاسەتی مرۆڤی بکەن. ئەوان توانییان هەندێ مەسەلەی تایبەتی دیاریکراو هەست پێ‌بکەن، مەسەلەگەلێك کە لە راستیدا نموونەی کێشە جیهانی و

هەمیشەییەکان بوون و مرۆڤیش بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی سەقامگیر و دادپەروەر، ڕووبەڕوویان ئەبێتەوە. ئەم بەرهەمانە، بە هۆی قووڵبوونی بابەتەکانیانەوە، لە ڕیزی بەرهەمە کلاسیکەکاندا دائەنرێن و لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردنی تیۆرە سیاسییەکان ئاسانتر ئەکەن. ئەم بەرهەمانە سەرەڕای ئەوەی کە بەزووترین کات ئاوڕ لە قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان و قەیرانی یاسای ئەساسی و هەروەها سەردەمی دوای ڕیفۆرمە مەزهەبییەکان لە بەریتانیادا ئەدەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی ڕۆشنگەریش ئەبینن. هۆکر کە بیروڕاکانی خۆی لە دوایین ساڵەکانی سەدەی شانزدەهەمدا دەنووسییەوە، یەکێکە لەو هزرمەندانە. تۆماس هۆبس و جۆن لۆك، تەنانەت لە هۆکریش بەناوبانگترن و پێوەندییان بە ژیانی ئێمەوە زیاترە، چونکە تیۆرە سیاسییەکانی ئەوان کەمتر سەرقاڵی باوەڕە زاڵەکانی سەردەم و شوێنی خۆیانن.

هۆبس تێگەیشتنی خۆی لە بێنەزمی کۆمەڵگاکەی خۆی، لە سەرەتای کتێبەکەیدا بە ناوی "بەهیمۆس" (Behemoth) کە سەبارەتە بەهۆیەکانی شەڕەناوخۆییەکانی بەریتانیا، بەیان کردووە. ئەو ئەڵێ لە ساڵەکانی نێوان ١٦٤٠ تا ١٦٦٠ز هەرکەس جیهانی ئەو سەردەمەی ئەبینی و ڕەفتاری خەڵك، بەتایبەت لە بەریتانیای لەبەرچاو ئەگرت، ئایندەیەکی وای بۆ جیهان پێشبینی ئەکرد کە جیهان لە ئایندەدا دەتوانێ هەموو جۆرە

نادادپەروەری و سووکایەتییەك تەحەمول بکات. هەروەها مرۆڤ لەوە تیَئەگەیی کە چۆن دووڕوویی و خۆفریودان (یەکەمیان بی ویژدانی و ناجوامێری و دووهەمیان حەماقەت و بێ ئەقڵی) ئەم رەزیلەت و نەفس نزمییانەی هێناوەتە ئاراوە.

بە بیروڕای هۆبس، سەرەکی ترین کێشەی کۆمەڵگای سیاسی بەریتانیا، قەیرانی دەسەڵات بوو. ئەو ئەڵێ "خەڵك زۆربەیجار فاسدن". خەڵك هێندە لە ئەرکەکانی خۆیان بێ ئاگان کە تەنانەت رەنگە لەهەزار دا یەکی مافە مرۆییەکانیش نەناسن. "هەروەها پەی بەزەرورەتی بوونی پاشا، یان کۆمەڵگای مەدەنی نابەن". قەشە کاتۆلیك و پرۆتستانەکان و هەروەها فەیلەسوفان و ئاژاوەچییەکانیتر، خەڵکیان والێکردووە کە بە ئاسانی کۆنترۆڵ نەکرێن. قەشە کاتۆلیك و پرۆتستانەکان هەردووکیان، وا پڕوپاگەندە ئەکەن کە دەسەڵاتدارە سیاسییەکان دەبێ پێڕەوی لە خاوەن کڵێسەکان بکەن و ملکەچیان بن. فەیلەسوفەکانیش، پاشایەتی و دیکتاتۆرییەت بە یەك شت لە قەڵەم ئەدەن و دەرەنجامەکەشی لەناوچوونی دەسەڵاتی حاکمییەتی پاشایە و لەو روەوە کە ئەم دەسەڵاتە، کزولاواز بۆتەوە، کەواتە سیستمی سیاسی بەریتانیا، شەلە شەل بەرەوفەوتان و نەمان هەنگاو هەڵ ئەگرێت. هۆبس لەو بڕوایەدا بوو کە هۆی ئاژاوە گێڕییەکان و شەڕە ناوخۆییەکانی سەردەمی ئەو، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەسەڵات لە کۆمەڵگادا بە

تەواوەتی شکستی خواردبوو، کە ئەڵبەتە پێشتریش پێشبینی ئەو شکستە کرابوو. ئەم بارودۆخە، پاشەکشەکردنی مرۆڤ بەرەو لای "بارودۆخی سروشتی"، پیشان ئەدا، بەبێڕەچاوکردنی بڕیارەکانی کۆمەڵگای مەدەنی" واتە "شەڕی هەموان لە دژی هەموان".

## جۆن لۆك و قەیرانی ڕەوایی

جۆن لۆك سەبارەت بە بێنەزمی سیاسی بەریتانیا، دیدگایەکی دیکەی هەبوو. ئەو لەگەڵ هۆبسدا هاوبیروڕا بوو کەدەسەلات و قودرەتی سیستمی پاشایەتی لە بەریتانیادا کۆتایی هاتووە. بەلام بەبیروڕای ئەو، کزولاوازبوونی دەسەلات لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە پاشا خەریك بوو لە سنووری دەسەلاتەکەی خۆی تێی بپەڕێنێت.

قەیرانی راستەقینە، قەیرانی ڕەوایەتی بوو. ئەوە راست نەبوو کە خەڵك بەهۆی لاسارییەوە گەندەڵ و سەرکێش بوونە، یان بەهۆی پێغەمەرە درۆیینەکانەوە گومڕابوونە. راستییەکەی ئەوە بوو کەدەسەلاتدارانی کۆمەڵگا هەوڵیاندابوو رادەی دسەلاتی خۆیان، زیاتر لەوە کە حەقیان بوو، زیاد بکەن. بە کورتی، خەڵك بۆ کردەوەو رەفتارەکانیان پاساوگەلی قەناعەت

پـیـّکـەریان هـەبوو، هـەر بۆیـە لـە بەرانبـەر سـتەمی دەسـەڵاتی سیاسیدا خۆڕاگرییان دەکرد.

لـۆك بـۆ بـەیانکردنـی تێگەیشـتنی خـۆی لـە قـەیرانی کۆمەڵگای بەریتانیا، پێوەندی نێوان خەڵك و دەسەڵاتدارانی لە چوارچێوەی پەیماننامـەدا خسـتە بـەر راقـە و لێکۆڵینـەوە. ئـەو ئەیوت بەو هۆیـەوە کەمرۆڤەکان لە رووی سروشتییەوە، ئازادو یەکسان و ئاقڵ و لۆژیکین، کەواتە ناتوانین ئەوە قبووڵ بکەین کە ئـەوان بـە ویسـت و رەغبـەتی خۆیـان لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتی دیکتـاتۆرو ڕەهـادا، چـۆك دابـدەن و ملکـەچ بـن. لـە راسـتیدا حکوومـەت، وەکـوو ئەمانـەتێك وایـە کـە لەسـەر ئیزنـی خـەڵك دائەمەزرێت و لەلایەن خەڵکەوە هەندێ بەربەست و چوارچێوەی بـۆ دەسنیشـان دەکـرێ. کـاتێ کـە دەسـەڵاتدارانی کۆمەڵـگایەك هـەوڵ بـدەن دەسـەڵاتگـەلێك وەچـنگبێـنن کـەلەلایـەن خەڵکـەوە پێیـان نەسـپێردراوە، لـە واقیعـدا، پـەیمانی نێـوان خۆیـان و خەڵکیان ژێرپێخستووە و لەو حاڵەتەشدا ئیدی خەڵك بە ئەرکی خۆیان نازانن بەرانبەر پرەنسیپەکانی ئەو پەیمانە وەفادار بن.

جۆن‌لۆك لەو باوەڕەدا بوو کە قەیرانی کۆمەڵگاکەی ئەویش بـە تـەواوەتی لـەو جۆرەیـە. دەسـەڵاتدارانی بـەریتانیا بـە هـۆی بەدەسـتهێنانی لەرادەبـەدەرو بـە ناحـەقی دەسـەڵات، بـۆ نموونـە:

وەرگرتنی باجی زیادە لە خەڵك و پێکهێنانی لەشکری نایاسایی و ژێر پێ‌خستنی ئازادی‌یە مەزهەبییەکانی خەڵکەوە، لە راستیدا پرەنسیپەکانی پەیمانی نێوان خۆیان و خەڵکیان خستۆتە ژێرپێ.

لێك‌جیاوازبوونی تێگەیشتن لە بێ‌نەزمییەکەی بەریتانیا، خاڵی سەرەکی جیاوازی نێوان هۆبس و لۆك بوو. تێگەیشتن لە هەر دوو قەیرانی دەسەڵات و قەیرانی رەوایی، لەسەر بناغەی دوو تێگەیشتنی جیاواز سەبارەت بە "زێدی راستەقینەو سنوورەکان و ئامانجەکانی حکوومەتی مەدەنی" راوەستاوە. ئەم عیبارەتە، تیتری لاوەکی (فرعی) کتێبەکەی لۆکە، واتە، "نامیلکەی دووهەم سەبارەت بە حکوومەتی مەدەنی". ئەم جیاوازییە لە بنەڕەتدا ئەگەڕێتەوە بۆ باوەڕە جۆراوجۆرەکان دەربارەی سروشتی مرۆڤ و زەروورەتی سیاسەت. لۆك و هۆبس لەبەر ئەوەی کە ناچاربوون هۆیەکانی تێگەیشتنە جیاوازەکانی خۆیان لەسەر قەیرانی کۆمەڵگای بەریتانیا روون بکەنەوە، هەر بەهەمان شێوە ناچاریش بوون روانگەشیکارانە و کاریگەرەکانیان سەبارەت بە سیاسەت پەرە پێ‌بدەن.

## فەیلەسووفە رۆشنگەرەکان و قەیرانی "رژێمی کۆن"

بارودۆخە شڵەژاوەکەی دەیەکانی شۆڕشی فەرەنسە، وەك سەردەمی شۆڕش لە بەریتانیادا، بوەهۆی سەرهەڵدانی تیۆرگەلێکی گرنگی سیاسی. قەیرانی کۆمەڵگای فەرەنسە کە سەرتاسەری ئەورووپای گرتبووەوە، لایەنگران و نەیارانی شۆڕشی ناچارکرد تا بەوردی بیر لە زەروورەتەکان و توانایییەکانی سیاسەت بکەنەوە.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتنی دوایین ساڵەکانی سەدەی هەژدەهەمدا، بارودۆخی "ڕژێمی کۆن"یش رۆژلەدوایرۆژ خراپتر دەبوو. پاشایان کە لەگەڵ چینی ئەریستۆکرات و فیۆداڵە دواکەوتوخوازەکان یەکیان گرتبوو، هەرچی زیاتر توانایی تەگبیر و بیرکردنەوەیان لەدەست داوپێوەندیشیان لەگەڵ خەڵکدا پچڕا. ئەو دەستەوەستانی و بەخۆنامۆبوونەی کە بەهۆی ئەو بارودۆخەوە ــ بە تایبەت لە ناوچینەکانی خوارووی کۆمەڵگا ــ هاتبوە ئاراوە، بە تەواوەتی ئاشکرابوو. بەڵام هۆکارو چییەتی سەرەکی ئەو کێشەیە چیبوو؟

لە روانگەی فەیلەسوفانی ئازادیخواز و رۆشنگەرەوە، کێشە سیاسییەکان لە فەرەنسەدا ئاماژەیان بە بوونی قەیرانگەلێکی گەورەتری فکری و کۆمەڵایەتیان لە شارستانییەتی خۆرئاوادا ئەکرد. ئەوان ــ بۆ نموونە کۆندۆرسە ــ مێژوویان بە داستانی

حەماسەتی ئەقڵ و داستانی پێشکەوتنی فیکر لە قەڵەم ئەدا و لەو باوەڕەدا بوون کە پێشکەوتنی ئەقڵ، دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئازادی مرۆڤ. حەقیقەت و ئازادی، شانبەشانی یەك گەشەدەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو مرۆڤانەی کە بەرژەوەندییان لەوەدابوو سیستەمە چینایەتییەکان وەك خۆیان بمێننەوە، دژایەتی هەموو جۆرە پێشکەوتنێکی ئەقڵیان دەکرد. دیکتاتۆرییەت و خورافات، هەمیشە دژایەتی حەقیقەت و ئازادییان کردووە، کەواتە، قەیرانی "رژیمی کۆن" بۆ ئەم فەیلەسوفە رۆشنگەرانە بە تازەترین و لەراستیدا دوایین نموونەی ئەم ململانێ هەمیشەییە لەقەڵەم ئەدرا. خاوەن کڵێسەکان، کە بەرژەوەندییەکانیان لەوەدا بوو کە ئەندیشەکانی خەڵك وەك خۆیان بمێننەوە و گۆڕانیان بەسەردا نەیەت، هەروەها سیاسەتمەدارانیش کە حەزیان دەکرد دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەڵکەوە بپارێزن، یەکیانگرت و دەستیانکردە دژایەتی کردنی ئازادی و عەقڵانییەت. لەم بارەوە بە لەحنێکی توندوئاگرینەوە وای نووسی:

"مرۆڤ کاتێك رزگار دەبێ کەدواین پاشا بەریخۆڵەی ئاخرین قەشەوە هەڵواسرێت و لە سێدارەی بدات".

کانێ کە شۆڕشی فەرەنسە، پاشماوەکانی "رژیمی کۆن"ی فڕێداو سیستەمێکی تازەی سیاسی دامەزراند، خەڵکێکی زۆر بە حەز و تاسەیەکی زۆرەوە پێشبینی سەرهەڵدانی سەردەمێکی

تازە و پرشنگداری سیاسییان کرد. بۆ نموونە" لە بەریتانیادا، گرووپێك لە رێبەرە مەزهەبییەکان و رۆشنبیرە دەرکەوتووەکان، دەستیان کرد بە خۆرێكخستن‌و لێکۆڵینەوە بەمەبەستی داکۆکی کردن لە پرەنسیپەکانی شۆڕش وئومێدیان ئەوەبوو کە ئەم پرەنسیپانە لە کۆمەڵگای بەریتانیادا، پەرە پێ بدەن و دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەرەنسە لە وڵاتەکەیاندا دووبارەبکەنەوە.

## ئێدمۆندبرێك‌و قەیرانی شارستانییەت

ئەوە راستە کە کەسانێکی زۆر شۆڕشیان پێ‌باش بوو، بەڵام سیاسەتمەداری بەرجەستەی بەریتانیایی، ئێدمۆندبرێك، بەدیاردەیەکی مەترسیداری لە قەڵەم دا. بە بیروڕای ئەو، "ئەو رێگەچارە"یە کە لەلایەن شۆڕشگێڕە تازەکانەوە بۆ کێشەکانی مرۆۋ دەستنیشانکرا، لە واقیعدا دەس پێکردنی قەیرانێکی تازەبوو. هەر بەم هۆیەشەوەبوو کە کتێبە گرنگەکەی خۆی واتە "بیرکردنەوەگەلێك سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسە"ی نووسی، کە لەبواری تیۆرەسیاسییەکاندابوو. برێك بەو هیوایە بوو کە لەرێگای ئەو کتێبەوە، هاونیشتمانییەکانی خۆی لە مەترسییەکان و حەماقەت و نەزانکارییەکانی سیستمە سیاسییە تازەکەی فەرەنسە ئاگاداربکاتەوەو بەمجۆرە نەهێڵێت پێڕەوی لە شۆڕشی فەرەنسە بکەن. ئەو ئەڵێ: پێدەچێت کە نەك تەنها لە

فەرەنسەدا بەڵکوو لە سەرتاسەری ئەورووپا و تەنانەت لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەورووپاش رووبەڕووی قەیرانێکی گەورە بووینەتەوە. ئەو سەرلیٚشێواویانەی ئێستای بەریتانیا، سەرەتا بچووك و کەم بایەخ بوون بەڵام... منداڵێکی بێ تواناسان دیوە کە لە یەكچرکەساتدا هێندە گەورەو بەهێز بووبوو کە دنیای تێکداوەو دەیەوێ لەگەڵ ئاسمانیشدا بە شەڕ بێت. کاتێ کە خانووی دراوسێکەمان لە ئاگردابسووتێت، ئەگەر "تیمەکانی ئاگر کوژاندنەوە" تۆزێکیش خۆیان بە خانووکەی ئێمەوە خەریك بکەن، بێقازانج نابێت.

بڕێك رایگەیاند کە فەرەنسییەکان وا تەسەوردەکەن بناغەی کۆمەڵگایەکی تەواو ئازادیان دامەزراندووە، بەڵام ئەوە خەیاڵێکی خاوە. فەرەنسە بەهۆی لەناوبردنی بونیادی ئازادییە سیستماتیکەکانی وەك مەزهەب و خەسڵەتگەلی شۆڕشگێڕانەو هەروەها زنجیرە پلەوپایەکۆمەڵایەتییەکان، لە راستیدا پێی لە بەرەی خۆی زیاتر راکێشاو ئەو دەزگا گرنگانەی کە رێیان لە غەریزە مرۆییەکان دەگرت، داخست و پشتگوێی خستن. بڕێك وای پێشبینی دەکرد کە دەرەنجامی ئەم کارە لە داهاتوودا گەندەڵی و خراپکاری و دیکتاتۆرییەت و پشێوی دەبێت. بڕێك، بە شێوازە راشکاوانەکەی خۆی، قەیرانەکەی فەرەنسەی بەمجۆرە بەیان کرد: لە ناو نەتەوەکاندا فەرەنسە، کارەساتە ئاشکراکانی بەنرخێکی گرانتر لە نیعمەتە هەرە گرنگەکان کڕی. شۆڕشی

فەرەنسـە، هـەژاری لـە نـاوبرد بـەڵام لـە رێگـەی جینایەتـەوە. فەرەنسـە فەزیلەتـەکانی بـۆ پاراسـتنی بەرژەوندییـەکانی خـۆی نەفرۆشت، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بە قازانجی بەرژەوەندییەکانی، فەزیلەتەکانی خۆی پشتگوێ خست. کاتێ کە دەسەڵاتی پاشا لە فەرەنسەدا رۆژبەڕۆژ کەمتر دەبووەوە، بە شێوەیەك کەوەك بڵێی ئیمتیازو بەرژەوەندییەکان خەریکە دابەش دەکرێن، بەرەڵڵایی و توندوتیژی کردن و گوستاخی و بێ دینی، مۆڵەتیان پێدراو ئەم دیاردانـە هـەموو لایەنـەکانی ژیانیـان گرتـەوە. واتـە هـەموو ئـەو گەندەڵیـە دزێوانـەی کـە بەگشـتی لـە دیاردەکـانی "سـامان" و دەسەڵات"ەوە سەرچاوە دەگرن.

## کارڵ مارکس و قەیرانی سیستمی سەرمایەداری

مارکس لە سـەردەمێکی تـری پڕ لـە ئاژاوە، واتـە سـەردەمی شۆرشەکانی ١٨٤٨ز و هەروەها لـە رەهەنـدێکی تـری تیۆرسـازی سیاسـیدا، دەسـتی بەخسـتنەڕووی تیـۆرە سیاسـییەکانی خـۆی کرد. بەڕای ئەو، جۆرە بێنەزمییەکی دیکە هەڕەشە لە کۆمەڵگای ئـەورووپا ئـەکات. ئـەو، پێکهاتـەی ئـابووریی کۆمـەڵگا سـەرماییەدارییەکانی بـە پێکهاتەیـەکی پتـەو لـە قەڵـەم ئـەدا. ئـەم سیستمە توانیبووی باشتر لە سیستمەکانی پێشوو، کاڵا بەرهـەم بهێنێت. هـەروەها بـێنەزمییـەکی نالـەباری خسـتبووە نـاو ژیـانی ئەو کەسانەوە کە لەو سیستەمەدا کاریان ئەکرد. مارکس، پێـی

وابوو کە زۆرێك لەو بێنەزمییانە لە شێوەی هەژاری و دەسکورتی چینی کرێکاردا دەرئەکەوێت بەلاّم خەڵك لەبەرچەندین هۆی جۆراوجۆر، نە دەرك بە خودی کێشەکان دەکەن، نەبە گرنگییان. بەڕای مارکس، پێدەچێت خەڵك تەنانەت سەبارەت بە لایەنە یەگجار قووڵ و گرنگەکانی مەسەلەکەش هیچ زانیارییەکیان نەبێ. مارکس دەیەویست ئەم تێگەیشتنە نادروستە و هەروەها نائاگایی و دەرك نەکردنی باردۆخی کۆمەڵگا بگۆڕێت و چاکسازی تیابکات. ئامانجی تیۆرە سیاسییەکەی ئەو ئەوەبوو کە مرۆۋ والێ بکات بتوانێت دەرك بە بارودۆخە نالەبارەکەی خۆی بکات. یەکێك لە ئامانجەکانی مارکس ئەوە بوو ئەو توانایە بەخەڵکی جیهان ببەخشێت کە لە ویژدانی خۆیان بە ئاگابن و لەخەونە پووچەکان رابچڵەکێنێ و هەروەها لێکۆڵینەوە لەسەر رەفتارەکانیان بکا. پاش ئەوە خەڵك دەتوانن لەجیاتی هەندێ ململانێی بێ سوود و ڕوخێنەر، بەکەڵك وەرگرتن لە هێزە مێژووییەکان، بەسەر کێشەکاندا زاڵ بن. مارکس تەنانەت لەوەشی تێپەڕاندو وتی: "ئەگەر مرۆۋ ئەیەوێ تاوانەکانی ببەخشرێن، دەبێ بە تەواوەتی دانیان پیابنێت".

ئەو تاوانانەی کە مارکس دیتبوونی و دەیەویست رایانبگەینێ، بریتی بوون لە "بەخۆنامۆبوون"ی چینی کریکار و ئەو پارادۆکسانەی کە لەناو کۆمەڵگا بۆرژواییەکاندا لە ئارادابوون. مارکس لەو باوەڕەدابوو کە لە ناوکۆمەڵگا بۆرژواییەکاندا، پارادۆکسگەلێکی جۆراوجۆر لە ئارادان کە لە

شێوەی هەندێ کێشە و لێکدژیی دەروونیدا دەرئەکەون. لە دیدگای مارکسەوە ئەو سەروەت و سامانەی کە سیستمی سەرمایەداری بەرهەمی دێنا و هەروەها ئەو هەژارییەی کە بەکردەوە هێنابوویە ئاراوە، سەرەکیترین لێکدژییەك بوو کە لەئارادابوو. ئەو ئەڵێ:

ئەوە راستە کە "هێزی کار" بۆ دەوڵەمەندەکان، سامان و نیعمەت و فراوانی و بە پێچەوانەوە بۆ کرێکاران، هەژاری و دەسکورتی ئەهێنێتە ئاراوە. بۆ سەرمایەداران کۆشك دروست ئەکات و بۆ کرێکارانیش ماڵەقوڕینەیەکی بچووك. بۆ ئەوان جوانی و بۆ ئەمان ناشیرینی بەرهەم ئەهێنێت. سەرمایەداری، ماشین لە جێی کرێکار دادەنێ، بەڵام بە شێوەیەکی وەحشیانە لە هەندێ کرێکاریتر کاردەکێشێ و هەندێکی تریشیان ئەگۆڕێت بە ماشین. گەشە بە فکری ئەوان ئەدات، بەڵام بۆ کرێکاران نەزانی و نەفامی و چەرمەسەری بەدیاری دەهێنێ.

مارکس لەو بڕوایەدابوو کە جۆری بەرهەم هێنان و دابەشکردن لەناو کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا مرۆڤ بە خۆی نامۆدەکا. ئەم سیستمە، بەرلە هەمووشتێك مرۆڤ بە بەرهەمی دەسڕەنجی خۆی نامۆ ئەکات. بەرهەمی دەست و زەینی لێدەستێندرێ و لە شێوەی "شتومەکێکی نامۆ کە حکوومەتی بەسەردا دەکا" رووبەڕووی دەبێتەوە. هەموو ئەو شتومەکانەی کە خۆی خوڵقاندوونی، بۆی نییە بڵێ هی ئەون. ئەوان، دەبنە دنیایەکی نامۆ کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و ئاشتییئامێزیش

دژایەتی دەکەن و لێی ناڕازین. بەمجۆرە مرۆڤ بە هۆی شێوەی بەرهەمێنانی سەرمایەدارییەوە، بە "سروشت"یش نامۆدەبێ.

جیا لەوەش بەبیروڕای مارکس مرۆڤ بە هەمان شێواز بە خۆیشی نامۆ دەبێ، نەك تەنها ئەو شتانەی کە بەرهەمی هێناون بەڵکوو چالاکییەکانیشی ئەچنە ژێر رکێفی هێزە دەرەکییەکانەوە. کرێکاران وایان لێ‌دێت کە بەچالاکییەکانی خۆشیان نامۆدەبن، بە واتایەکی‌تر، چالاکی ئەگۆڕدرێت بەرەنج، دەسەڵات بە بێ هێزی، زاوزێ کردن بە نەزۆکی، هەروەها وزەی جەستەیی و فکری دەبێتە چالاکییەك لەدژی خۆی کە نەك تەنها هی ئەو نییە بەڵکوو پێیشی نامۆیە. لەوکاتەدا کرێکاران وەك چۆن بە شتوومەکەکان نامۆ بوونە، بە خۆشیان نامۆ ئەبن.

## ژان ژاك رۆسۆو قەیرانی یەکسانی ئاکاری

ئەگەرچی رۆسۆ وەك مارکس قسە ناکات، بەڵام ئەویش بەمەبەستی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی لەبار، لە بینینی دژوازییە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا و بەخۆنامۆبوونی مرۆڤەوە دەس پێ‌دەکا. ئەو "نامۆبوونەی" کە رۆسۆ و مرۆڤەکانی تریش تووشی بووبوون، لە راستیدا جۆری سێهەمی ئەو نامۆبوونانە بوو کە مارکس باسی دەکرد، واتە: نامۆبوونی تاك بەرانبەر خۆی و هاوچەشنەکانی. بە بیروڕای رۆسۆ، بە خۆنامۆبوونی مرۆڤ، جۆرە فریودانێکی دەسکردی کۆمەڵایەتییە. کردەوە و نۆرمە

رۆژانـەکان، مـرۆڤ ناچار ئەکـەن تاهەسـتە سروشـتییەکانی خـۆی سەرکوت بکات و بیانکاتە قوربانی شتە ڕووکەشـەکان و هـەروەها ئـەوداب‌ونەریتـە دەسـکردانەی کـە لـە کێشـەوگرفت زیـاتر هـیچ قازانجێکیان نییە. رۆسـۆ دەڵـێ: جـۆرە سـوکییەك بەسـەر رەفتـارە هەنووکەییەکاندا زاڵە و بە شێوەیەکی هێندە فریودەرانەش لەیەك ئەچن کە مرۆڤ واتەسەوردەکا هـەموو مێشـکەکان، بەیـەك "قاڵـب" دروسـت کـراون. هـەموو کردەوەکانمـان دەسـکردن و هیچیـان لـە بنەڕەتـدا هـی ئێمـە نـین و تـەنها بـە هـۆی خۆگونجانـدن لەگـەڵ کۆمەڵـگا و تاکـەکانی دیکـە ئـەنجامیان ئـەدەین. داب و نـەریت فـۆرمی دیاریکراوی خـۆی هەیـە و "سـەردەم "یـش یاسـای خـۆی هەیە و مرۆڤیش ناچارە هەموویان رەچاوبکات و هـیچ کـاتیش بـە شـێوەیەکی راسـتەقینە چـالاکییە واقعییـەکانی خـۆی نـەنوێنێت. مـرۆڤ ئیـدی نـاوێرێ خـۆی بـە تـەواوەتی ـ وەك چـۆن هەیـە ـ بنـوێنێ، بەڵـکوو بەردەوام و بـە شـێوەیەکی رووکەشـانە خـۆی لـە شتە حەرامەکان بەدوور ئەگرێت.

رۆسۆ لیبڕاوانە ئەیوت کە سـەرکوت کردنـی تاکـەکان و نـامۆ بـوونی مـرۆڤ بـەخۆی، جـێگـۆڕکێ کردنـی پێوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانی لێ ئەکەوێتەوە. رۆسۆ بەتەنزەوە دەیگوت:

ئـەم متمانـە پـێنەکردنانـە، نـەفس نزمـی و سـوکێییەکی زۆریـان لـێ دەکەوێتـەوە. هاوڕێیـەتی و ریزگـرتنی راسـتەقینە و هـەروەها "بـاوەڕ بـەخۆ بـوون" بـە تـەواوەتی لـەناو خەڵکـدا

لەناوچوە. ئێرەیی پێبردن، بەدگومانی، ترس، بێئیحساسی، خۆخواردنەوە، نەفرەت و تەڵەکەبازی لە ژێر پەردەی فێڵبازانەی ئەدەبدا و هەروەها خۆپەرستنی دلۆڤانانە و موئەدەبانە ـ کە لەراستیدا مرۆڤ قەرزداریانە ـ سەرتاپای کۆمەڵگای تەنیوەتەوە. لە سایەی رووناکی و رێبەرایەتی ئەم سەردەمەدا، ئێمە ئیدی لە کاتی سوێندخواردنەکانماندا، هەر لە خۆوە ناوی "خوا" بەکار ناهێنین، بەڵکوو بە هۆی کردەوە کوفرئامێزەکانمانەوە سووکایەتی پێدەکەین و واشمان لێهاتووە کە ئەوانە بە سووکایەتی پێکردن لە قەڵەم نادەین. بووینەتە مرۆڤگەلێکی هێندە خاکی کە سەبارەت بەخەسڵەتەکانی خۆمان هیچ قسەیەك ناکەین بەڵام زۆر بوێرانە سووکایەتی بە خەسڵەتەکانی ئەوانیتر دەکەین.

هەموو ئەوشتانەی کە رۆسۆ لەکۆمەڵگاکەیدا بە بێبەندوباری ئاکاری لە قەڵەمی ئەدا، لە رووی سیاسی و حکوومەتییەوە چوارچێوەیەکی دیاریکراو و ئاشکرایان هەبوو. بێبەندوباری ئاکاری وگەندەڵی سیاسی شانبەشانییەك گەشەیان دەکرد. رۆسۆ تێگەیشتنی خۆی سەبارەت بەگەندەڵی سیاسی لە یەکێك لە کتێبە بەناوبانگەکانیدا دەربڕیوە لە کتێبەکەیدا بە ناوی "وتارێك سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی" دەڵێ:

نایەکسانییە ئاکارییەکان، کە بە هۆی یاسا داڕێژراوەکانەوە مۆڵەتیان پێ ئەدرێت، هەرکات لەگەڵ نابەرابەری جەستەیی و سروشتیدا گونجاو نەبن، لەگەڵ مافەسروشتییەکانیشدا دژایەتی پەیدا دەکەن و یەك ناگرنەوە، ئەم دژایەتییە بەشێوەیەکی یەگجار گرنگ و چارەنووس‌ساز، فێری ئەوەمان دەکا کە چۆن بیر لەو نابەرابەرییانە بکەینەوە کە بەسەر هەموو کۆمەڵگا شارستانییەکاندا زاڵن. یاسا سروشتییەکان، بە هەر شێوەیەك لێکبدرێنەوە، دژایەتییان هەیە لەگەڵ ئەم حەقیقەتانە کە، منالان بەسەر بەسالاچوەکاندا حکوومەت بکەن، بێ ئەقڵەکان بەسەر ئاقڵەکاندا حکوومەت بکەن و کەمینەیەکی زاڵ، سامانە گەورەکان قووت بدات، لە کاتێکدا کە زۆرینەیەکی برسی، موحتاجی سەرەتاییترین پێداویستییەکانی ژیان بێت.

تیۆرەکانی هزرمەندانی وەك برێك و مارکس و رۆسۆ، ئەوەمان بۆ دەرئەخەن کە رەنگە بێنەزمییە سیاسییەکان، لە تێکدانی ئاسایشی جەستەییشی تێبپەڕێنن و مەترسی لەوە زیاتریشیان لێ بکەوێتەوە. تەنانەت رەنگە رەهەندە ئالۆزونادیارەکانی سیستمی ئاکاریش بگرێتەوە. سیستمە سیاسییە ستەمەگەرو سەرکوتکەرەکان هەمیشە لە بەردەم مەترسیدان، چونکە هەموو کاتێك ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە مەشرووعییەتی خۆیان لەدەست بدەن. لەوانەیە ئەو کۆمەڵگایانەی کە دەتوانن بەسەرکەوتنێکی تەواوەوە یاساو نەزم بەرقەراربکەن، لە هەمان کاتیشدا بتوانن پەرە بدەن بەو "لادان"ە ئاکاری و کۆمەڵایەتییانەی کە ژیانی هاوولاتیان دەخەنە بەردەم مەترسی فەوتانو نەمانەوە.

# ئەفلاتوون و قەیرانی داد پەروەری ئەسینایی

یەکێك لە باشترین تەقەلاکانی تیۆرسێنیك بۆ رۆشنگەری لە بواری بێنەزمی ئاکاریدا، لەڕاستیدا بە کۆنترین نموونەش لە قەڵەم دەدرێ. ئەفلاتوون کە بەگشتی بە بناغەدانەری تیۆرە سیاسییەکان لە رۆژئاوادا دەناسرێت، یەکێك لە نامیلکەکانی بۆ ئەو مەبەستە نووسیوە کە تێگەییشتنەکانی خۆی سەبارەت بە گومڕایی ئاکاری کۆمەڵگاکەی پیشان بدات.

بە بیروڕای ئەفلاتوون، تێکشکانی دەوڵەتشاری ئەسینا، بە هۆی تراژیدیای ژیانێکی راستەقینەوە زیاتر ئاشکرا بوو. مەبەستیشی لەو قسەیە، دادگایی کردن و لە سێدارەدانی سوقرات بوو. پیاوێك کە بەڕای ئەفلاتوون و زۆربەی هزرمەندانیش، یەکێك لە ئاقڵترین و باشترین پیاوەکانی سەرڕووی زەوی بوو، کەچی حوکمڕانانی ئەسینا دەسگیریان کرد و پاش دادگاییکردنیشی سەرەنجام حوکمی مەرگیان بۆدەرکرد.

بەڕای ئەفلاتوون، دادگایی کردنی سوقرات لە راستیدا دادگایی کردنی کۆمەڵگای ئەسینا بوو. کاتێك کە ئەسینا سەبارەت بە چارەنووسی سوقرات بڕیاری ئەدا، لە ڕاستیدا سەبارەت بە خۆی بڕیاری دەرئەکرد، یان دەتوانین بڵێین

تۆسقاڵێك لە "ڕۆح"ی خۆی پیشان ئەدا. خەڵکی ئەسینا لەمبارەوە، بەمجۆرە بڕیاریان دەرکرد کە، یان سیستمی سیاسی شارەکەیان شوێنێکی باشە بۆ ئەو هاووڵاتییە ئاقڵ و دیندارە، یان ئەسینا ناتوانێت شێوەی ژیانی سوقرات تەحەمول بکات. کاتێکیش کە دادگای ئەسینا (کە پێکهاتبوو لە ٥٠٠ هاووڵاتی ئەسینایی) حوکمی مەرگی بۆ سوقرات دەرکرد، لە ڕاستیدا حوکمی مەرگی خۆی دەرکرد.

هەرلەبەرئەوە بوو کە ئەفلاتوون بۆ پیشاندانی بێنەزمی کۆمەڵگای ئەسینا، تراژیدیای ژیان و دادگایی کردنی سوقراتی لە شێوەی شانۆیەکی ئەدەبیدا خستەڕوو. ئەو لەنامیلکەی "داکۆکینامەکەی سوقرات- پۆزش" دا، ئیستدلالە حقۆقییەکانی سوقراتی بە جوانترین شێوە پیشان داو تیایدا کۆمەڵگای ئەسینای بە تاوانبار لە قەڵەم دا.

خیتابە دیفاعییەکەی سوقرات، بە شێوەی تەنزێکی ڕێكوپێك نووسراوە هەر قۆناغێکی دادگایی کردنە دوو ڕەهەندی هەیە. لە ڕەهەندە سادەکەیدا، ئەسینا سوقرات دادگایی دەکاو حوکمی مەرگیشی بەسەرا ئەدا. بەڵام لە ڕەهەندێکی پڕ ناوەڕۆکتر و قووڵتردا، سیستمی ئاکاری جیهان ــ کە ڕۆحی سوقرات، جیلوەیەکی ئەو ڕۆحەیە ــ دەس ئەکات بە دادگایی کردنی ئەسینا و وەك شارێکی پڕ لە فەساد و خراپکاری دەیبینێ.

لە بەشی یەکەمی نامیلکەکەدا ئەسینایییەکان، سوقرات بە "بێدینی" و "گومڕاکردنی لاوان" تاوانبار دەکەن. سوقرات بەمجۆرە وەڵامیان ئەدایەوە کە ئەسینا لەبەرئەوە تاوانباری دەکا کە تەحەمولی حەقیقەتی نییە" حەقیقەتێك کە سوقرات هەموو ژیانی خۆی لە پێناوی بەدەستهێنانیدا تەرخانکردووە. ماوەیەکی زۆر بەرلە دادگایی کردنی سوقرات، "هاتف"ی کەنیسەی "دۆلفی" وتبووی کە سوقرات ئاقڵترین کەسە. سوقرات کە پێشتر دەرکی بە نەزانینی خۆی کردبوو، تووشی سەرسووڕمانێکی زۆربووبوو کە داخۆ مەبەستی "وتاربێژ" لەو قسەیە چی بووە!؟ بەڵام بە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەو دەرەنجامە گەییشتبوو کەمەبەستی وتاربێژ لەوەی کە ئەوی وەك نموونە هێناوەتەوە، ئەوە بووە کە "زاناترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە وەك سوقرات بزانێ کە هیچ نازانێ"[٧].

سوقرات ئەیوت" هەر لەبەر ئەو مەسەلەیە بەناو شاری ئەسینادا دەگەڕام و تووشی هەرکەسێك ببوومایە کە بە کەسێکی زانا دەهاتە بەرچاو، دەسم بە تاقیکردنەوەی ئەکرد. بەڵام پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەو دەرەنجامە ئەگەیشتم کە زانا نییە و منیش لەبەرخاتری ئەوە کە فەرمانی خوا جێبەجێ بکەم، بە خودی ئەو کەسەشم ئەسەلماند کە زانا نییە. سوقرات پێی لەسەر ئەوە دائەگرت کە بە ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرە، لە ڕاستیدا هەم خزمەتی "بانگەوازی ئیلاهی" (Daimon)م کردووە،

هەمیش خزمەتی خەڵکی ئەسینا. سوقرات بۆ کۆمەڵگەی ئەسینا لەمێشوولەیەك دەچوو کە لە ڕێگەی پێوەدانەوە، دەبوە هۆی بێدار کردنەوە و ڕاچڵەکاندنی خەڵکی بە گشتی و ئەسینایییەکان بە تایبەتی. کەواتە زۆر ئاساییە کە خزمەتەکانی ئەو، لە ناو ئەو کەسانەدا کە توانای تەحەمول کردنی حەقیقەتیان نییە، هیچ خۆشەویستییەك دروست ناکات. سوقرات دەڵێ بە بیروڕای من ئەوان هەرگیز دان بەو مەسەلەدا نانێن کە من، ئەوان بەو جۆرە دەخەمە بەرچاو کەهەن [حەقیقەتی بوونی خۆیان پیشان ئەدەم] و ئەوەش دەسەلمێنم کە سەرەڕای ئەوەی کە لافی لێدەدەن هەموو شتێك دەزانن، بە پێچەوانەوە هیچ نازانن.

سوقرات بۆ ئەوەی کە بە تەواوەتی تاوانبار بوونی خۆی بسەلمێنێت، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لەبەرئەوە خۆی تێکەڵی سیاسەتی ئەسینا نەکردووە، لایەنگری حەقیقەت بووە. سیاسەت بەو شێوەیەی کە لە شاری ئەسینادا بەڕێوەدەچوو بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ حەقیقەتدا یەکیان نەدەگرتەوە. هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە سوقرات دژایەتی سیاسەتی ئەسینای دەکرد. ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە هیچ مرۆڤێکی حەقیقەتخواز نەیئەتوانی لە دەست سیاسەتی ئەسینا بە سلامەت ڕزگاری بێت و گیان دەرباز بکات.

سوقرات ئەیوت" ئەی خەڵکی ئەسینا ئێوە باش دەزانن کە ئەگەر من لە کاروبارە دەوڵەتییەکاندا بەشداریم بکردایە، لە

مێژبوو تیاچووبووم، بە بێ ئەوەی کە هیچ قازانجێکم بەخۆم، یان بەئێوە بگەیاندایە بێت. ئەی خەڵکی ئەسینا من حەقیقەتەکان ئەڵێم! لێم زیزمەبن! کەسێك کە دژایەتی زۆرینەی خەڵك بکات و شەرافەتمەندانە رێگە لە ئەنجامدانی کارگەلی ناحەق و نایاسایی لە ئەسینا، یان هەر شوێنێکیتر بگرێت، حەتمەن گیانی خۆی لەدەس ئەدات.

پاش ئەم بەرگریە جەنجاڵئامێزە، سوقرات بە تاوانبار ناسرا. بە پێی رێورەسمەکانی ئەو سەردەمەی ئەسینا، ئەو دەیتوانی یان حوکمی دادگا پەسەند بکا، یان داوای سزادانێکی تر بکات. وەهەر لەم قۆناغەدا دژایەتی راستەقینەی نێوان حەقیقەت ـ کە سوقرات نموونەیەتی ـ و گەندەڵی ئەسینا درێژە پەیدا ئەکا.

سوقرات لایخۆی بەمجۆرە بیری ئەکردەوە کە ئەگەر بڕیارە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە سزابدرێت، دەبێ لیاقەتی ئەو سزادانەی هەبێت، لەبەر ئەوەش کە خزمەتی ئەسینای کردووە، ئەبێ سزادانەکەش، باش و گونجاوبێت. هەر بۆیە پاش بیستنی حوکمی لە سێدارەدان لە لایەن "دادوەر"ەوە، پێشنیاری کرد کە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو پیاوەتییەی دادوەرەکە، لەیەکێك لە گەورەترین هۆڵەکانی شاردا میوانییەك تەرتیب بکەن. ئەمە شانازییەك بوو کە بەو قارەمانانەیان دەبەخشی کە لە یارییەکانی ئۆڵەمپیکدا سەرکەوتنیان بەدەست بهێنایە. پێشنیارەکەی

سوقرات سەرەتا بەشتێکی گاڵتەجاڕی دەهاتەبەرچاو، بەڵام لە راستیدا تەواو پڕماناو بایەخداربوو. لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامێکی گونجاوو بەجێ بوو. سوقرات ئەیوت" کاتێك باوەڕم بەوە هەیە کە کارێکی ناحەقم نەکردووە، چۆن ئەتوانم لە دژی خۆم قسەبکەم و بەبێ ئەوەی کە تووشی هیچ تاوانێك بووبم، بۆ خۆم پێشنیاری سزادان بکەم؟ بۆ چی ئەبێ کارێکی وابکەم!؟

ئەنجومەنی داوەرانی ئەسینا کە پێكهاتبوو لە ٥٠٠ کەس، سەرەنجام سوقراتی بە مەرگ تاوانبار کرد. ئەفلاتوون جارێکیتریش بە ئاشکرا ئەوە پیشان ئەدا کە مەحکووم بوونی سوقرات، لە راستیدا مەحکووم بوونی شاری ئەسینایە. ئەسینا بە راگەیاندنی لە سێدارەدانی سوقرات، لە راستیدا تێکشکانی ئاکاریی خۆی راگەیاند. سوقرات لە نامیلکەکەی خۆیدا ئاماژە بەم مەسەلە ئەکات و ئەڵێ: "بەڵام ئەی هاوڕێیان! نەترسان لە مەرگ کارێکی سەخت نییە. رزگار بوون لە "شەڕ" زۆر لەوە دژوارترە، چونکە شەڕ لە مەرگ زیرەکتر و زرنگترە. ئێستا کە من پیر وبێتوانا بوومە، رووبەڕووی مەرگ دەبمەوە، بەڵام نەیارەکانم بە هەموو زرنگییانەوە، کەوتوونەتە داوی بەڵاو نەهامەتێکی یەکجار گەورەتر و کوشندەترەوە، واتە "شەڕ". لە کۆتایی ئەم دادگاییکردنەدا من بە هۆی دەنگەکانی ئێوەوە بەمەرگ مەحکووم کرام، بەڵام "حەق و حەقیقەت" زوڵم و ستەمەکانی ئەوانی لەقاو دا. کەواتەهەردوولامان تەسلیمی ئەو قەدەرە بووینە. پێدەچێت

شتی وا هەر دەبوایە رووی بدایەو [واتەچارە نووسمان وابووە] پێم وایە بە حەقی خۆمان گەییشتووین.

دەتوانین بڵێین کە تیۆرە سیاسییەکانی ئەفلاتوون بە یەکێك لەم زەمینانەی خوارەوە دەست پێدەکەن ــ واتە بونیادە فەلسەفییەکانیان لەسەر یەکێك لەم زەمینانەدا دامەزراوە ــ ئەو تیۆرانە پشتیان بە جیهان ناسی و مەعریفەناسی، یان بە مرۆڤ ناسی فەلسەفییەوە بەستووە (واتە روانگەی ئەو سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ). گریمانە بونیادی و فەلسەفییەکانی ئەو، پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. بەڵام لە راستیدا تیۆرە سیاسییەکانی ئەفلاتوون ـ واتەبونیادی لۆژیکە پراکتیکییەکەی ــ لە نامیلکەی "داکۆکینامەکە سوقرات"ەوە دەس پێدەکەن. مەبەستی ئەفلاتوون لە ڕاڤەکردنی سیستەمی سیاسی، ئەوە بوو کە هەستی بەلێکدژییەکی گەورە کردبوو لە نێوان "سیستەمی دەوڵەتشاری ئەسینا" و "نەزمی راستەقینە و هاوسەنگی و دادپەروەری و یەکپارچەبوون ــ کە رۆحی سوقرات یەکێك لە نموونەکانیەتی ــ". ئەم مەسەلەیە تەواو بێزاری کردبوو و مێشکی پێوە سەرقاڵ دەبوو. ئەفلاتوون بە هۆی بینینی بێنەزمی ئەسیناوە کە لە نامیلکەی داکۆکینامەکەیدا روونی کردۆتەوە، ناچار بوو وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکانی کتێبی "کۆمار" بداتەوە": دادپەروەری چییە؟ کۆمەڵگای بەختەوەر کامەیە؟ لە خوارترین پلەدا، کام سیستمی سیاسییە کە باشترین

هاوولاتی خۆی لە سێدارە نادا" وەك ئەسینا کە سوقراتی لە ناو برد؟ وە لە بالاترین پلەدا، کام سیستمی سیاسی، نیشتمانی راستەقینەی خەڵکانی چاکە؟

بە کورتی، ئەفلاتوون وەك زۆربەی تیۆرسێنە سیاسییەکان، لێکۆڵینەوەکانی خۆی بە "بینینی بیّنەزمی" لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەس پیّدەکا. بینینی "ناڕاستییەکان" کێشەی فکری ئەورووژێنێت و دەس ئەخاتەسەر ئەو کێشە و گرفتانەی کە پێویستیان بە روون کردنەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا بینینی بیّنەزمییەکان مرۆڤ هان ئەدا بە دوای دۆزینەوەی رێگەچارەدا بگەڕێت. بینینی بیّ نەزمی هەم ئەقڵ ئەجووڵێنێت و هەم ئیحساس.

هەندیّ لە تیۆرسێنەکان، زیاتر لەوانیتر سەبارەت بە بینینی بیّ نەزمی بەڕاشکاوانەتر ئەدوێن. بۆ نموونە ئەفلاتوون بە شێوەیەکی پێچەوانەی میتۆدە باوەکان، لێکۆڵینەوە لە سەر "بینین"ەکانی خۆی ئەکات، چونکە بینینی بیّنەزمی بناغەی یەکێك لە نامیلکەکانێتی. رەنگە هەندیّ لە بیرمەندانی دیکە، هۆکاری سەرەکی و هەروەها مەبەستی خۆیان لە راڤەکردنی نەزمی سیاسی، هەرگیز روون نەکەنەوە، یان لە دووتوێی بەشێکی بچووکی نووسینە کەمتر گرنگەکانیاندا بیشارنەوە. بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بە باشترین شێوە لە مەبەستی مارکس و تێگەیشتنی ئەو لە بیّ نەزمییە سەرەکییەکانی

کۆمەڵگاکەی تیٚبگات، دەبیٚ بگەڕێتەوە بۆ نووسینە کۆنترەکانی وەك "دەس نووسە فەلسەفی و ئابوورییەکانی ساڵی ١٨٤٤". تەنانەت رەنگە مرۆڤ ناچار بیٚت کە بارودۆخی "بابەتی" و هەروەها دۆخی ژینگەی تیۆرسیٚنیش بخوێنیٚتەوە، بۆ نموونە بەمەبەستی خوێندنەوە لەسەر مەکیاڤیلی، دەبیٚ لە ئاژاوە و جەنجاڵە سیاسییەکانی ئیتاڵیای سەردەمی ژیانی ئەو تیٚبگەین.

تەنانەت ئەگەر پیٚویست بە راڤەکردن و لیٚکۆڵینەوەش بکات، دەبیٚ دەرك بەو تیٚگەیشتنە سەرەکییانەش بکەین کەهاندەری تیۆرسیٚنەکان بوونە. ئەگەر تیۆرسیٚن دەرکی بە مەسەلەیەك نەکردبایە، هەرگیز زەحمەتی نووسینی بە خۆی نەئەدا. وە ئەگەر ئەم مەسەلەیە بە تەواوەتی دەرکی پیٚنەکریٚت، لەوانەیە ئەو ریٚگە چارەیەش کە تیۆرێکی کامڵ و هەمەلایەنە ئەخاتەڕوو، دەرکی پیٚنەکریٚت.

## وتاری سێهەم

# دەستنیشانکردنی کێشە

تەنها زەینی مرۆڤێکی نائاسایی دەتوانێ دوای بینینی بێنەزمی، ئۆقرە بگرێت. لەوەها حاڵەتێکدا، دڵ و زەینی مرۆڤی ئاسایی و تەندروست، هانی ئەدەن زیاتر خۆی بە خوێندنەوەوە سەرقاڵ بکات. "بینین" و هەروەها ویستەکانی زەین، دەبنە هۆی سەرهەڵدانی لێکۆڵینەوەی زیاتر. یەکەم ڕێگەچارەیەك کە لە وەڵامی "کێشەکە لە چیدایە؟" دەخریتەڕوو، سەرلێشێواوییەکی تازە دەورووژێنێ. وەڵامێك کە لە قۆناغی بینینی بێنەزمیدا ئەدرێتەوە، بۆ خۆی دەبێتە هەوێنی دروست بوونی پرسیارگەلێکی‌تر.

ئەو هەیەجانانەی کە هەر لە سەرەتاوە تیۆرسێنیان ناچار بە لێکۆڵینەوە کردبوو، هێشتا دەوریان هەیە چونکە لەو قۆناغەدا هێشتا ڕێگەچارەیەك بۆ چارەسەرکردنی بێنەزمی

نەدۆزراوەتەوە. تەنها کێشە سەرەکییەکە دەستنیشان کراوە و هیچیتر. بە تەنها بینینی "ناڕاستییەکان" ڕێنماییەکی ئەوتۆمان ناخاتە بەردەست. ئەو دڵەڕاوکێ ڕاستەقینەیەی کە تیۆرسێنی ناچار بە تێڕامان کردبوو، هێشتا نەسڕاوەتەوە. ئەو دەبێ تا دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك، درێژە بە لێکۆڵینەوەکانی بدات. هێشتا ئەنگیزە فکرییەکانی لێکۆڵینەوەش بە تەواوەتی حزووریان هەیە. کاتێ تیۆرسێنیك بارودۆخێکی بە نالەبار کەوتەبەرچاو، "لۆژیك"ی بینین حوکم ئەکات کە لێکۆڵینەوە لەسەر دۆخی "بینین"یش بکرێت. لەم قۆناغەدا کتوپڕ ڕووبەڕووی دوو پرسیار دەبینەوە:

یەکەم" ئەگەر بارودۆخەکە نالەبارە، هۆکارەکانی چین؟
دووهەم" بارودۆخێکی لەباری سیاسی چ تایبەتمەندیگەلێکی هەیە؟ بەواتایەکیتر، ئەگەر ئەم بارودۆخە نالەبارە، ئەی بارودۆخی "لەبار" کامەیە؟ پرسیاری دووهەمیان لەوتاری دواییدا قسەی لەسەر دەکرێت. لەم وتارەدا قسە لەسەر کێشەکان و ئەو ڕەوتە ئەکەین کە تیۆرسێن لە کاتی دۆزینەوەی هۆکارەکانی ڕێکنەخستنی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

## هۆکارەکان و چارەسەرەکان

کێشە فکرییەکانی ئەم قۆناغە، لە بنەڕەتدا هەمان ئەو کێشانەن کە لە "زیان ناسی"دا لە هەموو جۆرەکانیان، دەخرێتەڕوو. تیۆرسێنیك کە لە کارکردی کۆمەڵگای سیاسیدا کەم و کوڕییەکی بنییوە، زیاتر لە پزیشکێك ئەچێت کە نیشانەکانی نەخۆشییەکەی دیبێتەوە. هیچ کام لەم دوانە [واتە تیۆرسێن و پزیشك] ناتوانن لەم قۆناغەدا بوەستن و دەستلەسەردەست دابنیشن. بە تەنها دەستنیشانکردنیهۆکارەکان بەس نییە بەڵکوو ئەبێ سەرچاوە سەرەکییەکانی نەخۆشییەکە بدۆزرێنەوە. ئەگەر قەراربێت کێشەکە لە رووی تیۆرییەوە بە تەواوەتی دەرکی پیێبکرێت و هەروەها لە رووی پراکتیکیشەوە چارەسەر بکرێت، پێویستە هۆکارەکانی مەسەلەکە روون بکرێتەوە. بە کورتی، تیۆرسێنی سیاسی وەك پزیشکێك رووبەڕووی ئەرکی "دەستنیشانکردنیکێشە" بوەتەوە.

تیۆرسێن لەم قۆناغەی لێکۆڵینەوەدا، ئەبێ رۆڵی "راڤەکار"ێك بگێڕێت. ئەو بەناچار دەبێ قۆناغی پۆلێن کردنی پێوەندی نێوان هۆکار و بەرهۆکارەکانی ئەم دنیا گرژۆئالۆزە ببڕێت، چونکە تا ئەو کاتەی هۆکارەکانی مەسەلەکە دەستنیشان

نەکرێن، ناتوانین بە شێوەیەکی راستەقینەش دەرکی بکەین. لە لایەکی تریشەوە. تیۆرسێن بە بێ ڕوونکردنەوەی هۆکارە راستەقینەکان، ناتوانێت پێشنیارگەلێکی گونجاو بۆ چارەسەرکردن، یان دامرکاندنی کێشەکە ئاراستە بکات. یەکەم پرسیارێك کە لە سەرەتای قۆناغی دەستنیشانکردندا رووبەرووی تیۆرسێن دەبێتەوە، یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی تیۆرە سیاسییەکانە. ئەو پرسیارەش یەگجار سەختەو وەڵامدانەوەشی کارێکی ئاسان نییە. پرسیارێکە کە قوتابخانە گرنگەکانی بیری سیاسی لە یەکدی جیا دەکاتەوە. پرسیارێکە کە ئەگەر وەڵامی بدرێتەوە، بە شێوەیەکی بونیادی رێگەچارە پێشنیارکراوەکانی هەر تیۆرێکی سیاسی بە ئاقارێکی باشدا دەبا.

ئەتوانرێ ئەم پرسیارە گرنگە سەرەتاییە، بە شێوەیەکی تازەتریش بخرێتە ڕوو، بەڵام بە وردی ڕوون بکرێتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا ئەو کێشە سیاسییەی کە خراوەتەڕوو، ریشەی سیاسی هەیە؟ ئایا هۆکارەکانی کێشەکە بەراستی سیاسین، یان نە؟

ئەم پرسیارە چارەنووسسازە خۆی دابەش ئەبێ بە دوو پرسیار، چونکە هۆکاری سیاسی، هۆکارێکی "گشتی"یە، نەك "تاکەکەسی"" هەروەها "دەسکردە"، نەك "سروشتی".

کەواتەتیۆرسێن دەبێ لەوە تێبگات کە ئایا ریشەی کێشەکە هیچ پێوەندییەکی بە کۆمەڵگاوە هەیە؟ ـ کەواتە گشتییە ـیان تەنها رەنگدانەوەی زەینی خۆیەتی؟ پاشان، ئەگەر بەودەرەنجامە گەیشت کە کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە، ئەبێ ئەوەش دەستنیشان بکات کە ئایا ئەو کێشەیە بەرهەمی بارودۆخێکە کە مرۆڤ بتوانێت بیگۆڕێت ـ واتە، هۆکاری دەسکرد ـ یان هۆکارەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ "دیاردە" سروشتییەکان؟

لە لاپەڕەکانی دواتردا، باس لەوە دەکەین کە بۆچی قۆناغی دەستنیشانکردنقۆناغێکی دژوارە و چۆن دەبێتە سەرچاوەی جیاوازی نێوان قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی تیۆرە سیاسییەکان. رەنگە تا ئێستا گرنگیی ئەم پرسیارە و پێوەندی لەگەڵ رێگەچارە کۆتاییەکانی تیۆرسێن، روون بووبێتەوە. چونکە ئەگەر هۆکارەکانی مەسەلەکە لە بنەڕەتدا سیاسی نەبن ـ واتە هۆکاری گشتی و دەسکرد نەبن ـ رێگەچارەی مەسەلەکەش ناتوانێت سیاسی بێت. هەڵبەتە هەرچەند هەندێ جار هۆکارەکانی مەسەلەکە سیاسی نین، بەڵام پێدەچێت رێگەچارەی سیاسیش زەروری بێت. بەڵام رێگەچارەیەکی لەوجۆرە ناتوانێت چارەسەری مەسەلەکە بکات.

# مەسەلە گشتییەکان لەبەرانبەر مەسەلە تاکەکەسییەکاندا

سەرەنج بدەنە مەسەلەی یەکەم" واتە کێشەیەك کە لەکاتی دەستنیشانکردنی "سیاسی" بوون، یان سیاسی نەبوونی ریشەی مەسەلەکە ئەخرێتەڕوو: ئایا ئەم کێشەیە مەسەلەیەکی گشتی و کۆمەڵایەتییە، یان تاکەکەسی؟. ئایا کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ باری خراپی سەرجەم کۆمەڵگا، یان مەسەلەیەکی چارەسەرنەکراوی تاکەکەسییە؟ ئایا ریشەی کێشەکە، ئەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی سیاسی کۆمەڵگا، یان لە ناکۆکییە دەمارییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە؟ دیارە ئەم پرسیارانە وەڵامگەلێکی جۆراوجۆریشان ئەبێت. ئەگەر کێشەکە، پێوەندی بەسیستمی سیاسییەوە هەبێت، "پەرچەکرداری سیاسی" وەڵامێکی گونجاوە، بەڵام ئەگەر پێوەندی بەتێکچوونی مێشکی تاکەوە هەبێت، کەواتە ئەوە مەسەلەی تاکەکەسی تیۆرسێنە، نەك بابەتێکی سیاسی. ئەوە تیۆرسێنە کە ئەبێ واز لەکارەکانی بێنێت و گیان و دەرونی خۆی دەرمان بکات.

داوەریکردن سەبارەت بەم مەسەلە کارێکی سادە نییە. بە هیچ شێوەیەك ناتوانین ئەوە دەس‌نیشان بکەین کە ئایا مەسەلەیەك رەگێکی شەخسی هەیە، یان کۆمەڵایەتی. چونکە تاك و کۆمەڵگا پێوەندییەکی یەگجار زۆر و هەمەلایەنەیان لەگەڵ

یەکدیدا هەیە. کۆمەڵگا بریتییە لە سیستمی پێوەندییەکانی نێوان تاکەکان و، تاکەکانیش بە هۆی "کارلێک کردن"ە کۆمەڵایەتییەکانەوە گەشە ئەکەن. ناشتوانین بە ئاسای سنوورەکانیان دەستنیشان بکەین و هەروەها ئەوەش دەستنیشان بکەین، کە پشێوی، سەرچاوەی تاکەکەسی هەیە یان کۆمەڵایەتی؟ ئەو شتەی کە بە نموونەی مەسەلە شەخسییەکان و هەروەها سەرلێشێواوییە رۆحییەکان لە قەڵەم ئەدرێت، رەنگە لەراستیدا بە هۆی سەرمەشقە کۆمەڵایەتییە نامرۆڤی و ئینحرافییەکانەوە هاتبێتە ئاراوە. تاکەکان، تا رادەیەکی زۆر شوناسی خۆیان لە رێگەی وەرگرتن و بەدەروونی کردنی رۆڵە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەدەستئەهێنن و پاشان بە هۆی بینینی کۆمەڵگاوە خۆیان دەناسن. ئەگەر رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان تژی لەرەهەندگەلی نێگەتیڤ، تێگەیشتنی مرۆڤیش بۆ خۆی نێگەتیڤ ئەبێت. نووسەری رەشپێست، جیمز بالدوین، بیرەوەرییەکانی سەردەمی لاوێتی خۆی بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە. "هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان ئەدا تاکوو رەنگی پێستمان پاک بکەنەوە. هێندەیان ئەشۆردین کە پێستمان بریقەی ئەدایەوە. پێم وایە کە منداڵەرەشپێستەکان، یان بەلانی کەمەوە ئەم وەچەیەی من، زووتر لە منالانی تر و هەروەها بە ئازارێکی زیاتریشەوە بە "سابوون" ئاشنابوون. منالێکی وا، بەزووترین کات دەرکی بەوە دەکرد کە رەنگی پێستی "نەنگ"ییەکی تاکەکەسییە. ئەگەریش

ئەو نەنگەیەی قبووڵ بکردایە لە رووی رۆحییەوە، رەنگە نەتوانێ باوەڕی بە خۆی بوایە. ئەگەریش قبووڵی نەکردایە، ئەبوایە زیاتر لە پێویست تووڕە بێت کە لە هەر دوو حاڵەتەکە کێشە رۆحی و "دەروونی"یەکانی، بە ئاشکرا بەرهەمی پشێوییە سیاسییەکان بوون.

نموونەیەکی تر، سەرەنجبدەنە پێکهاتەی رۆحی مرۆڤی هاوچەرخ. مرۆڤی هاوچەرخ لە هەندێ کۆمەڵگادا، هەموو ئەو شتانەی کە ئەریك فرۆم بە "هەڵوێست وەرگرتنی رەمەکی و بازاری" ناودێری کردووە، قبووڵ کردووە. ئەریك فرۆم، بە هۆی لۆژیکێکی هاوچەشنی لۆژیکەکەی مارکس، قسە لەسەر "بەخۆنامۆبوون" دەکا. بە بیروڕای ئەو، مرۆڤێکی لەوجۆرە لەوەی کە خۆی وەك "کاڵا" دەبینێ، هەست بەئازارێکی زۆر ئەکات:

حاڵەتە مرۆییەکان وەك هاوڕێیەتی، خاکەڕایی و دلۆڤانی، گۆڕاون بە "کاڵا" و بەرهەمگەلێکی "بەستەبەندی کراو" کە لە بازاری کەسایەتیدا (شخصیت) بە باشترین نرخ ئەفرۆشرێن. ئەگەر تاکێك نەتوانێت خۆی بگۆڕێت بەسەرمایەیەکی پڕبەها، هەست بە هەڵشکان دەکا. بەڵام ئەگەر لەو کارەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە مرۆڤێکی سەرکەوتووە. دیارە نرخ و بەهای مرۆیی ئەمرۆ، گرێدراوە بە هۆکارە دەرەکییەکانەوە" واتە داوەریکردنە جۆراوجۆرەکانی بازار کە تەواو وەك "کاڵا"یەك

بڕیاری لەسەر ئەدەن. ئەم مرۆڤە "بەخۆنامۆیە" کە هەڕاج دەکرێ، دەبێ بەشێکی یەگجار زۆری بەها مرۆییەکانی خۆی ـ کە تایبەتمەندی سەرەکی مرۆڤن، تەنانەت لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانیشدا ـ لە دەس بدات.

لە لایەکی تریشەوە، ڕەنگە ئەو مەسەلانەی کە بە ئاشکرا لە پێکهاتەی ڕۆحی تاك، یان گرووپەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە هەڵە بە دیاردەگەلێکی "هەڵقولاوی" دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە قەڵەم بدرێن. ئەوە دیاردەیەکە کە دەروونناسان بە "لەکۆڵخستنەوە" ناودێری دەکەن. بۆ نموونە ئەو کەسانەی کەبەردەوام هەست بەوە دەکەن کە هەمیشە لە لایەن کەس یان کەسانێکەوە لە دژیان پیلان ئەگێڕدرێت، ڕەنگە بۆ نائەمنی و دڵەڕاوکێ دەروونییەکانیان بە شێوەیەکی "بابەتی" پاساوبهێننەوە. ئەوان هەست بە مەترسی دەکەن کەواتە ئەومەترسییە ئەهێننەوە سەر "پیلانگێڕی نێودەوڵەتی نەتەوەیی یەهوود" یان پیلانی فاشیستی بنەماڵەی ڕاکفلێر و بە مەترسییەکی سیاسیشی لە قەڵەم ئەدەن.

بەمجۆرە مەسەلە ڕۆحییەکان لە ڕێگەی پڕۆگرامەکانی "گواستنەوە" و "جێگۆڕکێ کردن"ەوە دەچنە ناو دنیای سیاسەتەوە. گواستنەوە لە کاتێکدا ئەنجام ئەدرێت کە مرۆڤ لەگەڵ کەسێکدا کە قەت نایناسێت، وا هەڵسوکەوت بکات کە وەك بڵێی دەیناسێت. زۆربەی کات ئەم حاڵەتە لە کاتێکدا

روودەدا کە مرۆڤ ئەو هەستەی کە بەرانبەر بنەماڵەی خۆی هەیەتی، بگوێزێتەوە بۆ کەسێکی سێهەم. باشترین نموونەی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە مرۆڤ، دەروونناس، یان مامۆستا، یان قەشە بە باوکی خۆی بزانێت، یان کەسێك کە پلەوپایەیەکی لەسەرتری هەیە، وەك دایك و باوك یان گەورەی بنەماڵە چاوی لێبکات. لەبەر چەندین هۆی ئاشکرا، ئەم حاڵەتە زیاتر سەبارەت بە پیاوانی دەوڵەت ڕوودەدات. ڕێزگرتنی لەڕادەبەدەر و هەروەها دوژمنایەتیکردنی لە ڕادەبەدەر کە تەقریبەن بەرانبەر هەموو پیاوە گەورەکانی دەوڵەت ـ بۆ نموونە لە ئەمریکادا بەرانبەر سەرۆك کۆمار ـ ئەنجام دەدرێ، تا ڕادەیەك لە مکانیزمی دەروونناسییەوە سەرچاوە دەگرێ. تەنانەت ڕەنگە تیرۆریستێکی سیاسی کە حەزی کوشتنی باوکی بەسەرکوتکراوی تیاماوەتەوە، دەس بکاتە تاوان کردن. [واتە کاتێ کە نەیتوانیوە باوکی خۆی بکوژێت، ئەو جینایەتە بەسەر کەسانیترا ئەنجام ئەدا]. ڕۆحی ناپاکی شەیتانی ڕەنگە دزە بکاتە ناو دنیای سیاسەتەوە.

لە حاڵەتی "جێگۆڕکێ کردن"یشدا، هەندێ لەهەستو کردەوەکانی بە شێوەیەك جێگۆڕکی پێدەکا کە ڕەنگە دەرەنجامێکی سیاسی لێ بکەوێتەوە. تووڕەبوون لە هاوسەرێکی چەنەبازو بۆڵەبۆڵکەر، یان سەرۆکێکی بەهانەگیر، یان وەڕەز بوون لە شکستەکانی ژیان، زۆربەی کات دەبێتە هۆی ئەوەی کە

مرۆڤ بە قیڕاندن، تووڕەبوونی خۆی بەسەر ئەوانی‌تردا بڕێژێت. ئەم مکانیزمە دەروونناسییانە، رۆڵی "هێزی هاوپشتی" دەبینن. ئەڵبەتە تەنها لە کاتێکدا کێشەی سیاسی دروست دەبێت کە بەشێك لە تاکەکانی کۆمەڵگا، یان نەتەوەکانی‌تر هێرشیان دەکرێتە سەر. لەو حاڵەتەدایە کە کێشە سیاسییەکانی جەنگەکان و خۆپیشاندانە رەگەزییەکان بەهۆی هۆکارە رۆحییەکانەوە سەرهەڵدەدەن، یان ئەو کێشانەی کە لە ئارادان، روولەزیاد بوون دەکەن.

کەواتە دەبینین تاك و کۆمەڵگا بە تەواوەتی و لە رێگەگەلێکی جۆراوجۆرەوە کاریگەری لەسەر یەکتری دادەنێن. بێ‌نەزمییە کۆمەڵایەتییەکان هەندێ کێشەی رۆحییان لێ‌دەکەوێتەوە و بە پێچەوانەشەوە. بەڵام دۆزینەوەی هۆکارەکان کارێکی ئاسان نییە. تیۆرسێنی سیاسی، سەرەڕای هەموو کێشە و گرفتەکان دەبێ لەقۆناغی دەستنیشانکردنی هۆکارەکاندا، سەبارەت بە بابەتی ئاڵۆزی هۆکاروبەرهۆکار، داوەرییەکانی بخاتەڕوو. ئەو وەڵامانەی کەلەم قۆناغەدا دەخاتەڕوو، رەنگە بۆ سەرجەم تیۆرەکەی چارەنووس‌سازبن.

یەکەم ئەرکی تیۆرسێن ئەوەیە دڵنیابێت لەوەی کە ریشەی کێشەکە سیاسییە نەك تاکەکەسی. ئەو دەبێ دڵنیابێ لەوەی کە تێگەیشتنەکانی ئەو لە بێ‌نەزمی، بە تەنها بەرهەمی "لەکۆڵ خستنەوە" یان "گواستنەوە" وەیان "جێ گۆڕکێ کردنی رۆحی"

نییه. ناکۆکییه گرنگەکانی ڕاڤه و لێکۆڵینەوه سیاسییەکانی "ڕەقیب" لێرەوه دەس پێ دەکەن" بۆ نموونه سەرنج بدەنه چەمکی نامۆ بوون کەله تیۆرەکانی مارکس و هێگڵدا ڕۆڵێکی سەرەکی ئەبینێ. لای هێگڵ، نامۆ بوون ـواته بەخۆنامۆ بوون ـ دیاردەیەکی جیهانییه. لای هێگڵ له ڕاستیدا سیاسەت داستانی سەرکەوتنی خوا بەسەر نامۆ بوونی خۆیدا بوو له مێژوودا. نامۆبوون دیاردەیەکی حەقیقی بوو که له "دەرەوە"و لەدنیای "بابەتی"دا بوونی هەبوو. له لایەکی ترەوه هەندێ له ڕەخنەگرانی هێگڵ، ئەویان به "لەکۆڵخستنەوە"ی دەرونی تاوانبار کردووه. ئەورەخنەگرانه لەو باوەڕەدان که له دوایین ڕاڤەکاریدا، وێنا کردنەکەی هێگڵ له خوایەکی نامۆ، که هەوڵ ئەدات به "بێ کۆتایی بوون"، "ئازادی ڕەها" و "زانابوونی ڕەها" بگات، له ڕاستیدا له کۆڵخستنەوەی حاڵەته ڕۆحییەکانی خۆیەتی. ئەوان دەڵێن ئەو شتەی که هێگڵ به شڵەژاوێتی سیاسی گشگیرو جیهانی لەقەڵەم ئەدا، له ڕاستیدا دەگەڕێتەوه بۆ شڵەژاوێتییه بونیادییەکانی ڕۆحه گرژو ئاڵۆزەکەی خۆی.

پرۆفیسۆر ڕۆبێرت تاکر که یەکێکه لەو ڕەخنەگرانە، لەو باوەڕەدایه که تەنانەت هەر دوو قوتابییه بەناوبانگەکەی هێگڵ، واته فیۆرباخ و مارکسیش سەبارەت به نامۆبوون، هۆکارگەلێکی نادروستیان دەستنیشان کرد. فیۆرباخ نامۆبوونی بەدەرئەنجامی ئاین له قەڵەم ئەدا و ئەیوت" مرۆڤەکان وێنا یۆتۆپیاییەکانیان

لەناوبوونەوەرێکدا بەناوی "خوا" ئەبیننەوە و هەربۆیە بەخۆیان نامۆدەبن. مارکس پێیوایە نامۆبوون لە سەرمایەدارییەوە سەرچاوەی گرتووە و دەڵێ: مرۆڤ بە هۆی پارەپەرەستی و دابەش کردنی کارەوە ـ کە لە ئاکامەکانی سەرمایەدارییە ـ هەم بەخۆی نامۆ ئەبێ و هەم بە مرۆڤەکانی تریش. بە بیروڕای تاکر هەردوو تێگەیشتنەکە نادروستن. لەو روەوە دەڵێ:

هەردووکیان بە هەڵەداچوون. نەك تەنها لە مەسێحییەت و سەرمایەیەداری خراپ تێگەیشتوون بەڵکوو تەنانەت سروشتی بەخۆنامۆبوونیشیان دەرك نەکردوە. بەخۆنامۆ بوون بەڕواڵەت، نەواقعیەتێکی ئاینییە، نەواقعیەتێکی ئابووری، بەڵام دەکرێ شێوە دەربڕینێکی ئایینی، یان ئابووری لەخۆبگرێت، وەك چۆن دەشکرێ جەنگ، یان هەر تەقەلایەکی تری مرۆڤی، شێوە دەربڕینی سیاسی لە خۆبگرێت. کەواتە رەنگە مرۆی بە خۆ نامۆبوو بە تەواوەتی خوازیاری کۆکردنەوەی سامان بێت و هەر بەم هۆیەشەوە، رەنگە ژیانی ئابووری، "مەزهەب"ی پراکتیکی پارەپەرستی و هەروەها قەڵەمڕوەی "کاری نامۆ" بێت. بەڵام نامۆ بوونی ئەم مرۆڤە، بەشێکە لە واقعییەتێکی ئابووری: نامۆ بوون، لە بنەڕەتدا بەشێکی "جیانەبوەوەی"ی ژیانی تاکە کەسییە، واتەدیاردەیەکی رۆحی ـ یان وەك ئەمڕۆ ئەڵێن ـ دیاردەیەکی رۆحییە. ئەمە نەخۆشییەکی رۆحییە کە، لەخودی مرۆڤ و

ململانێ کردنی لەگەڵ خۆی و خوادا و هەروەها لەتەقەلاکانی بۆ کامڵبوون و "سوپەرمان" بوونەوە سەرچاوە دگرێ. کەواتە نامۆبوون، خاڵی بەرانبەری لە خۆبایی‌بوون و خۆپەرستییە. کەواتە نامۆ بوون لە خودی مرۆڤدا نییە. مرۆڤ بە نامۆیی لە دایك نابێت. بەڵام قابلییەتی نامۆبوونی تیایە. ژمارەی ئەو کەسانەی کە بە خۆیان نامۆن، هەر چەند زیادیش بن، دیسانەوە نامۆبوون هەمیشە مەسەلەیەکی تاکەکەسییە.

مارکس و فیۆرباخ و تاکر، هەر سێکیاندان بە نامۆبوونی مرۆڤدا ئەنێن، بەڵام بە شێوازگەلێکی جۆراوجۆر ریشەی کێشەکە دەستنیشان ئەکەن. راڤەکاری و لێکۆڵینەوە جیاوازەکانی مارکس و تاکر بە تایبەت، زیاتر بابەتەکە روون دەکەنەوە. مارکس نامۆبوون بە کێشەیەکی سیاسی و ئابووری و هەڵقولاوی سیستمی سیاسی دەزانێ. لە لایەکی‌ترەوە تاکر نامۆبوون بە کێشەیەکی رۆحی و رەوانی و هەڵقولاوی داواکارییە هەرە زۆرەکانی نەفس، لە قەڵەم ئەدات.

دەرەنجامە دارێژراو و پراکتیکییەکانی ئەم تێگەیشتنە جیاوازانە، بەئاشکرا جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. ئەگەر سیستمی ئابووری بۆتە هۆی نامۆ بوون، ئەوا ئاشکراترین رێگە چارەش گۆڕانی سیستمی کۆمەڵایەتییە. وەك مارکس ئەڵێ" تەنها ئامانج، شیکردنەوەی جیهان نییە، بەڵکوو گۆڕینی. تەنها،

گۆڕینی سیستم و هەروەها بڕیارگەلێکی تایبەتی سیاسی، دەتوانن بەسەرکەوتوویی مەسەلەکە چارەسەر بکەن. بەڵام ئەگەر تێگەیشتنەکەی تاکر راست بێت، کەواتە بەرنامە سیاسییەکەی مارکس هیچ پێوەندییەکی بە مەسەلەکەوە نییە. ئەگەر نامۆبوون یەکێك بێت لە کێشە رۆحییە بێ ئەملاو ئەولاکانی مرۆڤ، ئیدی لەو حاڵەتەدا تەقەلادان بۆ گۆڕینی سیستەمی سیاسی هیچ فایدەیەکی نابێتو، وەکوو ئەوە وایە کەنەخۆشی دڵ بە "لەگەچ کردن" چارەسەربکرێت. لە دیدی تاکرەوە، باشترین رێگەچارە گۆڕینی جیهان نییە، بەڵکوو پێڕەوی‌کردنی رێنماییەکەی سۆقراتەکە ئەیوت "خۆت بناسە". تێگەیشتنی یەکەم، شۆڕشی لێ دەکەوێتەوە و تێگەیشتنی دووەم، جۆرە پەشیمانییەك و هەروەها چاك کردنی رەوتی ژیان.

ئەم جیاوازبوونانەی دەستنیشان کردنی هۆکارەکان، واتە ئایا بێ‌نەزمی کۆمەڵایەتی، هۆکاری سیاسی هەیە، یان هۆکاری تاکەکەسی و دەرونی، بوە هۆی سەرهەڵدانی چالاکی سیاسی خوێندکارانی ئەمریکا لە دەیەی ١٩٦٠دا، یەکێك لە قوتابییە توندڕەوو بە ناوبانگەکان، لە تاوانبارکردنی سیستمی سیاسیدا ئەیوت "ئێمە خوێندکاران، ئێوە" واتە سیستمی [سیاسی] بە بەرپرسیاری کێشەکانمان دەزانین". هەروەها ئەیوت "ململانێ دەرونییەکان و هەروەها کێشە رۆحییەکانی لاوان، بەهۆی

تەقەلادانیان بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو سیستمە دژە مرۆییەکە بەها مرۆییەکان سەرکوت ئەکات، هاتوونەتە ئاراوە". وەڵامی ئەو تاوانبارکردنەش بەم جۆرە درایەوە کە "ئەمانە قسەی قۆڕن! ئێوە ئازارە رۆحییە لەڕادەبەدەرەکانتان کە بەشێکە لە پرۆسەی باڵق بوون و کامڵبوونی رۆحی، بەسەر ئێمەدا دەشکێنن و بە تاوانی ئێمەی ئەزانن! "رەخنەگرێکی تریش دەڵێ "ئەم لاوە توندڕەوانە باڵغ بوونیان گۆڕیوە بەئایدۆلۆژیایەك و لە مەسەلەیەکی رۆحی، مەسەلەیەکی سیاسییان دروست کردووە". دیسانەوە دەبینین کە دەرەنجامەکانی ئەم تێگەیشتنە جۆراوجۆرانە، بە ئاشکرا لەگەڵ یەکدیدا فەرقیان هەیە. ئەگەر لێکدانەوەکانی دەستەی یەکەم دروست بێت، تەنها رێگەچارە "گۆڕینی سیستمی سیاسییە"، بەڵام ئەگەر لێکدانەوەکانی دەستەی دووهەم دروست بێت، وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، واتە "باڵغ بوون وتەکامول!"

بە پێی قسەیەکی عەوامانە: "ئایا بەشێکە لە مەسەلەی "بوون" (وجود) یان بەشێکە لە رێگەچارە؟". رەنگە ئیدی تا ئێرە ئەوەمان بۆ روون بووبێتەوە کە ئەم مەسەلەیە بەوەگرێدراوە کە چۆن لە کێشەکە بڕوانین؟ ئەم داوەریکردنە گرنگ و فریودەرانەیە، یەکێك لە قۆناغە چارەنووسسازەکانی لێکۆڵینەوە لە سەرتیۆرە سیاسییەکانە.

# هۆکارە سروشتییەکان لەبەرانبەر هۆکارە دەسکردەکاندا

یەکێکی تر لە کێشەکانی قۆناغی دەسنیشانکردنی هۆکارەکان (کە تا رادەیەك دوبارەیشە) پێوەندی بەو دووهەمین پرسیارەوە هەیە کە پێشتر خرایەڕوو: ئایا سەرچاوەی بێنەزمی، هۆکارە سروشتییەکانن یان هۆکارە دستکردەکانی مرۆۆ؟ ئایا کێشەکە لە هۆکارە سروشتییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە لەو حاڵەتەدا مرۆۆ ناچارە ژیانی خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت؟ یان کێشەکە، لەو مەسەلانەی ژیانە، کە لە خودی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە و هەر بۆیە دەتوانێ چاکسازییان تیابکات و بیانگۆڕێت؟ ئایا هۆکارەکان و هەروەها نارەزاییە مرۆڤی و کۆمەڵایەتییەکان بەشێکن لە سروشتی شتومەکەکان؟ یان بەشێکن لەو هۆکارە ژینگەییانەی کە مرۆۆ دەتوانێ کۆنترۆڵیشیان بکات؟

ئەو نیایشە بەناوبانگەی کە بەهی "راینهۆڵدنیبۆر"ی لە قەڵەم ئەدەن، بۆ ئەم قۆناغەی لێکۆڵینەوەکانی تیۆرسێنەکان، تەواو گونجاوو بەجێیە: خوایە، ئەو ئازایەتییەم پێ ببەخشە کە بتوانم هەموو ئەوشتانەی کە لەبەر دەستم دان بیانگۆڕم. ئەو سەبرەشم پێببەخشە کە ئەگەر نەمتوانی ئەوشتانە بگۆڕم. هەر هیچ نەبێ ئەو وەزعە تەحەمول بکەم، حیکمەتیشم پێببەخشە تا

بتوانم جیاوازی ئەو دوانە دەرك بكەم. ئەوەی سێهەمیان [واتە حیكمەت] بۆ تیۆرسێنەكان شتێكی ئێجگار پێویستە. تیۆرسێن نابێ زیاد لە پێویست ئازایەتی لە خۆی پیشان بدات. هۆبس كە بە هۆی ترسانی دایكی لە هێرشی "ئارمادای ئیسپانیا". بەر لە "نۆمانگان" لەدایك بووبوو، ئەوەی قبوول بوو كە "ترس" یەكێكە لە هاوڕێ هەمیشەییەكانی" تیۆرسێن نابێ هێندەش سەبوورو سینگ فراوان بێت: ژمارەیەكی زۆری تیۆرسێنەكان بە حەزو تاسەیەكی زۆرەوە خوازیاری گۆڕان و گۆڕانكاری بوونە. بەلام ئەو تیۆرسێنەی كە لافی ئەوە لێدەدا لە "چەند" و "چون"ی هەلومەرجە سیاسییەكانی مرۆڤ بە ئاگایە، ئەبێ "حیكمەتی ناسینی جیاوازییەكانی" نێوان ئەو كێشە سیاسییانەی كە قابیلی چارەسەركردنن و هەروەها ئەوانەش كە بەشێكن لە چارەنووسی مرۆڤ، هەبێت [واتە دەبێ توانای ناسینی ئەو جیاوازییانەی هەبێت]. ئەگەر تیۆرسێن لەم قۆناغەی لێكۆلینەوەدا بەهەلەدا بچێت، لە جیاتی ئەوەی كە لە كێشە سیاسییەكان كەم بكاتەوە، بە پێچەوانەوە زیاتریان ئەكات. لە لایەكی تریشەوە، ئەگەر هەندێ لەو كێشانەكە قابیلی چارەسەركردن نین، بە هەلە دەسنیشان بكات پێڕەوانی تیۆرەكەی خۆی تووشی سەرلێشێواوی كردووە و هیچیشیان دەس ناكەوێت. خەیالەكانی ئەو، هەندێ حەماقەتی سیاسییان لێ دەركەوێتەوە. پێڕەوانی ئەو، لە "كانووت"ی پاشا دەچن كە

ڕۆژێکیان لە قەراخ دەریادا، فەرمانی ڕاگرتنی "مەد" (هەڵکشان)ی دەکرد. کانووت لە ئاوی دەریاکەدا نوقم بوو، بەڵام ئەو گەلۆرییە سیاسییانەی کە بە هۆی هەندێ "دەستتێنیشان کردنی لەو جۆرە"وە، سەرهەڵ ئەدەن، ڕەنگە هەموو خەڵك بەرەووتان و نابوودی بکێشێت.

لە لایەکی ترەوە، ئەو ڕاڤەو لێکۆڵینەوەیەی بە هەڵە وای لە قەڵەم ئەدا کە "شەڕە ڕەسەنەکان" قابیلی چارەسەکردن نین، زیانگەلێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە. تیۆرسێنگەلێك کە مەسەلە ئاساییەکان [واتە ئەو مەسەلانەی کە بەهۆی هەڵس وکەوتە کۆمەڵایەتییەکانەوە قابیلی چارەسەرکردنن] بە کێشەگەلێکی سروشتی و "لە دەرەوەی دەسڕەسی مرۆڤ" لە قەڵەم ئەدەن، مرۆڤ تووشی گیروگرفت گەلێك دەکەن کە هیچ زەروورەتێکیان نییە. ئەوان بە نائومێدی و دڵساردییەوە قسە لەسەر ریفۆرمە گونجاوو دڵخوازەکان ئەکەن و ئەگەر گوێ لە قسەکانیان بگیردرێت ڕەنگە ڕووبەڕووی زەرەرو زیانێکی زۆر ببینەوە.

بەگشتی تیۆرسێنە سیاسییە مەحافیزەکارەکان زۆربەی کات ناڕەزاییە مرۆییەکان بە هەڵقوڵاوی هۆکارگەلی سروشتی دەزانن وەك لەکەم و کۆڕیگەلی سیاسی. ڕەنگە ئەم قسەیە ئەگەر بە شێوەیەکی پێچەوانەی ئەو ڕستەیەی سەرەوە دەربېڕدرێت، باشتر مەبەستەکە بگەینێت. تیۆرسێنیك کە سەرچاوەی هۆکارە گرنگەکانی ناڕەزاییە مرۆییەکان ئەگەڕێنێتەوە بۆ هۆکارە

سروشــــتییەکان، ڕەنگـــە جیهـــانبینییـــەکی سیاســـی مەحافیزەکارانـــەتری هـــەبێت لـــەو کەســـەی کـــە دیـــاردە کۆمەڵایەتییەکان، بە هۆکاری سەرەکی کێشەکان لە قەڵەم ئەدات. ئەمـــە پێوەندییـــەکی تـــەواو لۆژیکییـــە. چـــونکە ئەگـــەر خـــەڵك وەڕەزبێت بە دەست ئەو دیاردانەی کە لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤ دان، بەختـەوەرکردنیان لـە ڕێگـەی سیاسـەتەوە کـارێکی ئاقڵانـە نییـە. هەڵبەتـە ئەگـەر کـەم و کوڕییـە سیاسـییەکان خـەڵك ئـازار بـدەن، هـەڵگرتنی هەنـدێ هـەنگاو لـە بـواری سیاسـەتدا کـارێکی باشـە بـۆ ڕزگـار کردنیـان لـەو ئازارانـە. بـە واتایـەکی‌تـر هـەموو مـەحافیزەکارێکی ئاقڵ لەگـەڵ "پـیتر بێرگـر"دا هاوبیروڕایـە. ئـەو ئەڵێ: مرۆڤ لەبەر چەندین هـۆی جۆراوجۆر لـە ڕەنج و ئازاردایە. زۆربـــەی ئـــەو هۆکارانـــە، بـــەهۆی ڕێگەچـــارە سیاســـییەکانەوە چارەسەر نابن. یەکێك لەکەموکوڕییە هەرە گەورەکانی سـەردەمی هاوچـەرخ، واتـە سـەردەمی "پـان پولیتیکـالیزم" تـێنەگەیشـتنی مرۆڤە لەم مەسەلەیە. ئەم تێنەگەیشتنە لە دواهەمین ڕاڤەکاریدا، ئـەوە دەگـەینێ کـە مـرۆڤ پـارێز ئـەکات (وە لەوانەیـە پـارێزێکی ئاگایانـە) لـە قبـووڵ کردنـی ئـەو واقعییەتـە کـە هـەر ئـەبێ ڕۆژێـك بمرێت.

خـاڵی بەرانبـەری ئـەو مەسـەلەیەش، دەستنیشـانکردنێکی سـەرەکییە کـە "سیسـتم" تاوانبـار دەکـا. "ڕیچـارد نۆهـاوس" بیروڕایـەکی پێچـەوانەی "برگـر"ی هەیـە: ئـەو ئەڵێ: هـەموو ئـەم

کێشـــانە، دەرەنجـــامی گەندەڵییـــەکی بنـــەڕەتین.... مەســـەلەکە لێرەدایـــە کـــە خراپـــەکردن بەشـــێکی "ذاتـــــــي" شـــێوە ژیـــانی ئەمریکییـــە، نـــەك بەشـــێکی "عـــارضـــي"....کەواتـەسیستم دەبــێ بگۆڕدرێت.

هـــەر بـــە پێـــی ئـــەم رەوشـــی دەسنیشـــان کردنـــە، "رادیکاڵـــەکانیش" تـــاوانی کێشـــە تاکەکەســـییەکان دەخەنـــە ئەستۆی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان. لـە راستیدا دەستنیشانکردن رادیکاڵەکان، جیاوازی نێوان تـاك و کۆمـەڵگا ئەگەینێتـە کـەمترین ئاسـتی خـۆی، بـۆ نموونـە هێربێـرت مـارکۆزە دەڵـێ: سـنوورە پەسـەندکراوەکانی نێـوان دەرونشناسـی و فەلسـەفەی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی، بـە هـۆی بـارودۆخی مرۆڤـی هاوچـەرخەوە، مانـاو بەهای خۆیان لە دەست داوە.

هـەر لەبەرئەوەشـە کـە ڕەنگـە کێشـە رۆحییـەکان بـە نموونـە گەلێکی پشێوییە بونیادییە سیاسییەکان لە قەڵەم بدرێن: کەواتـە کێشە رۆحییەکان ئـەگۆڕدرێن بەکـەموکوڕیگـەلێکی سیاسـی. بـێ نـــەزمی تاکەکەســـی، زیـــاتر لـــە جـــاران کـــەموکوڕییـــە گشـــتی و کۆمەڵایەتییـــەکان ئەخاتـــەڕوو و چارەســـەرکردنی بـــێنـــەزمی تاکەکەســـی، زیـــاتر لـــە جـــاران بـــە شـــێوەیەکی راســـتەوخۆ بـــە چارەسەرکردنی گشتی بێنەزمی سیاسییەوە وابەستە ئەبێت.

بـــە پێـــی ئـــەم لێکدانەوەیـــە، کـــاتێ خـــەڵك نـــازانن هـــۆی کێشـــەکانیان لـــە بنەڕەتـــدا سیاســـییە، ئـــەم نائاگاییـــە، لـــە

کەمتەرخەمی زەینی ناخودئاگایانەوە سەرچاوە دەگرێت. لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەم دیاردەیە نموونەیەکی "شۆردنەوەی مێشك" بێت لە لایەن سیستمی سیاسییەوە. بۆ نموونە مایکل لیرنێر، کە سۆسیالیستێکی ئەمریکییە، دەڵێ:

ئەوە بە خەڵکی ئەمریکا تەڵقین دەکرێ کە کێشەکانیان ریشەی کۆمەڵایەتییان نییە، بەڵکوو تاکەکەسین و ڕەنگدانەوەی کێشە رۆحییەکانی خۆیانن. هەروەها فێری ئەوەکراون کە کاتێك لە ژیانیاندا کێشەیەك هاتە ئاراوە، دەبێ بە هۆی ڕێگەچارە کۆنە ئایینییەکانەوە، وەیان لەڕێگەی راڤەکاری و شیکاری رۆحی و هەروەها شێوازە سادە بەکۆمەڵەکانەوە، خوێندنەوە لەسەر دەروونی خۆیان بکەن.

لەمجۆرە راڤەکاری و لێکۆڵینەوانەدا، چ لە رووی لۆژیکی و چ لە رووی ئیحساسییەوە، ئایین "تلیاکی کۆمەڵانی خەڵك"ە. ئەم شێوازە، سەبارەت بە بارودۆخی گرژو ئاڵۆزی مرۆڤ، لێکدانەوەیەکی نادروست و گومڕاکەر بەدەستەوە ئەدات.

لە لایەکی ترەوە تیۆرسێنە مەحافیزەکارەکان، شێوە دەستنیشانکردنیرادیکاڵەکان بەشتێکی سادەو بێ نرخ و گومڕاکەر لەقەڵەم ئەدەن. بەبیروڕای ئەوان، خستنی کێشە تاکەکەسیەکان بە ئەستۆی کۆمەڵگا، چ لە رووی ئاکاری و چ لە رووی فکرییەوە کارێکی ناڕەوایە. ئەم رەوشە لە رووی فکرییەوە هەڵەیە، چونکە لێکدانەوەیەکی نادروست و ئاسایی سەبارەت بە

رۆحی مرۆڤ بەدستە ئەدات، هەروەها لە رووی ئاکاریشەوە هەڵەیە چونکە تاك، کۆمەڵگا ئەگۆڕێت بە ئامرازێك کە هەڵەکانی دەخاتە ئەستۆی. هەندێ لە پێکادانە کلاسیکەکانی تیۆرسێنە سیاسییەکان لە تەوەری دەسنیشان کردنی هۆکارەکاندا دەخولێنەوە.

## کێشەی نەزانین: تۆماس پاین لەبەرانبەر ئیدمۆند بریسك دا

بۆ نموونە، لە دوایین ساڵەکانی سەدەی هەژدەهەمدا (سەردەمی شۆڕشەکانی فەرەنسە و ئەمریکا) کێشمەکێشێکی گەورە لە نێوان دووتێڕوانینی جیاوازی ئەو سەردەمەدا هاتە ئاراوە. ئیدمۆندبرێك، لە کتێبەکەیدا بە ناوی "هەندێ تێڕامان سەبارەت بەشۆڕشی فەرەنسە" ـ هەروەك لە وتاری پێشوودا باسمان کرد ـ لیبراڵیزمی سەردەمی رۆشنگەری، بەهۆکاری قەیرانی سیاسی فەرەنسە لەقەڵەم دا و هێرشی کردە سەر تۆماس پاین کە ترسی هێرشەکانی برێك دایگرتبوو، لە وەڵامی "ئەو لێکدانەوە نادروست و قیزەونانەی کە سەرجەم کتێبەکەی برێکیان تەنیبووەوە" کتێبی "ماڤ مرۆڤ"ی نووسی.

برێك و پاین سەبارەت بە زۆر مەسەلە، بیروڕایان یەکی نەئەگرتەوە. هێنانەوەی تەنها یەکێك لەو جیاوازییانە، واتە مەسەلەی "نەزانین"ی چینی خوارووی کۆمەڵگا، بابەتەکامان بۆ

روون دەكاتــەوە. برێــك و پــاین ئــەوەیان قبــوولْ بــوو كــە لــە كۆمەڵگاكانی ئەو سەردەمەی ئەوروپادا، ژمارەیەكی زۆری خـەڵك نەخوێندەوار و "نائاگا" بوون. بەلاّم جیاوازییـان لـەوەدا بـوو كـە هـەركامیان وەلاّمێكیـان بـەو پرسیارە ئەدایـەوە كـە "هۆكارەكـانی ئەم بارودۆخە چین"؟

وەلاّمەكـەی برێك شتێكی تازە نـەبوو. لـە راسـتیدا ئەرسـتۆ چـەندین سـەدە پـێش ئـەو وتبـووی كـە تاقمێـك لـە خـەڵك "لـە بنەڕەتـدا كۆیلـەن". بـە پێـی ئـەم لێكدانەوەیـە، مرۆڤـەكان بـە توانـاییگـەلێكی جۆراوجـۆری خۆڕسـكییەوە بـەدنیـا هـاتوون. هەندێكیان بەهرەو دەسـەلاّتێكی خۆڕسكیان هەیـەو بە هۆی ئـەو قابلییەتە نزمەی كە هەیانە، هەرگیز ـ بە مانا گشتییەكەی وشە ـ نـاتوانن عـەقلاّنی بن. تەنانـەت ئەگـەر قابلییـەتی خوێنـدن و بـە ئاگابوونیشـیان هـەبێت، پێگـەی چینایەتییان لـە ژیانـدا نایـەڵێت پلەوپایەگــەلێكی بــالاّتر و پڕبایــەختر بەدەســت بهێــنن. ئــەم پێگەیانــە، سروشــتی و نــەگۆڕن. بــەكورتی، هۆكارەكــانی ئــەم رەفتـارە قێـزەون و نـەزانكارییانـە لـە هـەناوی خـودی تاكەكانـدا شاراوەتەوە.

بــەم هۆیەشــەوە، ئــەم رێگەچــارە كۆمەلاّیەتییانــە كــە بــۆ لــەناوبردنی ئــەو نایەكســانییە سروشــتییانە دەخرێنــەڕوو، دەرەنجامگەلێكی گومڕاكەریان لێ ئەكەوێتەوە: برێك دەڵێ:

باوەڕبكـەن ئەوانـەی كـە خوازیـاری یەكسـانی و بەرابـەرین، هەرگیز ناتوانن یەكسانی بەرقەراربكەن. لە هـەموو كۆمەڵگاكانـدا،

گرووپێك لە هاوڵاتیان، لەسەرووی ئەوانی ترەوەن. ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێت یەکسانی بەرقەرار بکەن، تەنها ئەو سیستمە سروشتییەی کە لەئارادایە تێك ئەدەن و هیچی‌تر. پێکهاتە سروشتییەکەی کۆمەڵگا دەبێ لەسەر زەوییەکی پتەوو موحکەم دامەزرێت، لە کاتێکدا ئەوان خشت لەسەر هەوادا لێ‌ئەدەن" واتە کارێکی بێهودە ئەکەن.

"پاین"یش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە کە دواتریش وەڵامێکی تری لێ کەوتەوە. ئەو وتی: ئەوە چۆنە ئەم پیاوە قیزەون و نەزانانە لە وڵاتە کۆنەکاندا هێندە زۆرن؟ هەر کە ئەم پرسیارە ئەخرێتەڕوو، مرۆڤ بەو وەڵامە دەگا کە خراپکاری و نەزانی، ئاکامی حەتمی پێکهاتەی نوقسانی حکوومەتگەلی سەرجەم وڵاتە ئەورووپاییەکان، بە تایبەت بەریتانیا. کەواتە هەندێ لە خەڵکی پلەو پایەگەلێکی باڵایان پێ‌ئەسپێردرێت و هەر بەهەمان شێوەش، لە پلەو پایەنزمەکاندا رائەگیردرێن، تا ئەو رادەیەی کە هەموو سیستمی "سروشت" تێك دەچێ.

بە کورتی، پاین کۆمەڵگا بە هۆکاری نەزانی و کردەوە وەحشییانەکان لە قەڵەم ئەدات. کەموکوڕی لە سیستمی حکوومەتیدا، ئەم دەرەنجامە نالەبارانە ئەهێنێتە ئاراوە. ئەگەر حکوومەتەکان هێندە بە نارێكوپێکی دروست نەبوونایە، توانایییەکانی خەڵکیش بەو جۆرە بە فیڕۆ نەئەچوون. لە لایەکی

ترەوە، برێك، نەزانی خەڵك بە مەسەلەیەكی سروشتی لە قەڵەم ئەدا. ئێمەش نابێ كۆمەڵگا بە تاوانبار بزانین. بەڵكوو هێندەی بۆمان بكرێت دەبێ خۆمانی لەگەڵدا بگونجێنین. هەر تەقەلایەك بۆ بەرقەراركردنی یەكسانییەكی هەمەلایەنە، لە بەر ئەوەی كە حەقیقەتی سادەی "وجوودی" مرۆۋ لەبەرچاو ناگرێت، تەنها كارەساتگەلی سیاسی لێدەكەوێتەوە و هیچیتر.

## كێشەی شەڕاشۆیی: دەستنیشانكردنێكی ڕەشبینانە

نموونەیەكی تر، باسەرنج بدەینە بابەتی "شەڕاشۆیی" لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا. شەڕاشۆیی لە كوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ بۆچی هەندێ كەس لە ڕەفتارەكانیاندا، پەنادەبەنەبەر شەڕئاشۆیی و خراپكاری؟ ئایا مرۆڤەكان "بەفیترەت" شەڕاشۆن؟ یان ئەوە كە شەڕئاشۆیی بەرهەمی ئەو دیاردە دەسكردە كۆمەڵایەتییانەن كە قابیلی گۆڕانیشن؟

هەندێ لە تیۆرسێنە گەورەكان، تێگەیشتنێكی ڕەشبینانەیان هەیە. ئەوان دەڵێن شەڕاشۆیی بەشێكە لە سروشتی مرۆڤ. ئاوات و خولیا سروشتییەكان، مرۆڤەكان بە ناچار تووشی پێكادان دەكا. كاتێ مرۆڤ ئەبینێت ئەوانی تر، هیچ بەهایەك بۆ ئاوات و هەستەكانی قایل نابن، بە توندوتیژی و شەڕاشۆیی وەڵامیان ئەداتەوە. ئەم كێشەیە لەلایەن دەوڵەتەكانەوە دروست نابێت بەڵكوو دیاردەیەكی سروشتییە

کە مرۆڤ دەبێ هێندەی بۆی بکرێت خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت. لە راستیدا، یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی حکومەتەکان لێرەوە دەستپێدەکا. ئەوان دەبێ "نەزم و یاسا" بەرقەراربکەن. ئەوان ئەبێ یاساگەلێك دابنێن و بەرنامەگەلێك دابڕێژن کەلە شەڕاشۆیی مرۆڤ و گەشەکردنیشی کە ئەبێتە هۆی داگیرساندنی جەنگگەلێك کە کۆمەڵگاکان لە ناودەبا، بەرگری بکەن.

تەنانەت هەندێك لە بیرمەندانی زانستی خواناسی (تیۆلۆژی) کە لەبارەی سیاسەتەوە شتیان نووسیوە، تێگەیشتنیکی لەو جۆرەیان هەبوو. بۆ نموونە قەشە ئاگۆستین و مارتین لوسەر، کە لە هەموویان بەناوبانگترن، شەڕاشۆیی بە ئاکامی تاوانبارییە سروشتییەکانی مرۆڤ لە قەڵەم ئەدەن. مرۆڤی گوناهکار مرۆڤێکی یەکجار خۆپەرستەو خۆی زیاتر لە هەموو کەسێکی تر خۆش دەوێ‌و داخوازییە تاکەکەسیەکانیشی لەسەروو هەموو داواکارییەکانی ئەوانی‌ترەوە دادەنێ. مرۆڤێك کەنوقمی هەستی "خۆبەزل زانین" بووە، زۆر حەزدەکا بەسەر ئەوانی تردا زاڵ ببێ و چێژ لەو کارەشی وەردەگرێ. مرۆڤ لە بەر ئەوەی کە وەك بوونەوەرێکی "پیرۆز" لە دایك نەبووە، واتە "خواپەرستی" نەخستۆتە جێی "خۆپەرستی"یەوە، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بێت. "کۆمەڵگای مرۆڤە پیرۆزەکان" (قدیسەکان) واتەکۆمەڵگایەك کە تاکەکان تیایدا لە دایك بوونێکی رۆحانییان هەبووە جگە لە "مەشیئەتی خودایی"

پێویستی بە هیچ دەسەڵاتێکی تر نییە. کۆمەڵگا مرۆییەکان هەمیشە پێویستیان بە حکوومەتێکی بەهێز هەیە تا ئەو خەڵکەی کە حەزیان لە شەڕئاشۆیی و قەلاچۆ کردنە کۆنترۆل بکات. لوسەر، بەڕاشکاوانەتر دەڵێ: "جیهان هێندە خراپکارە کە بەکەڵکی مرۆڤە ئاقڵەکان و هەروەها حاکمە دیندارەکان نایەت. قربۆق، بۆ خۆراکی لەکلەك نەبێت، بەکاری هیچ نایەت.

هۆبس و فرۆید هەردوکیان تێگەیشتنیکی وەك یەکیان هەیە سەبارەت بە شەڕاشۆیی، هەڵبەتە تێگەیشتنیکی سروشت خوازانە و دوور لە رەهەندە ئایینییەکان. بە بیروڕای ئەوان، شەڕاشۆیی دەرەنجامی سروشتی پێکهاتەی دنیا و هەروەها چالاك بوونی رۆحی مرۆڤە.

بەڕای هۆبس، سروشت مرۆڤەکان لەیەك دوور دەخاتەوەو ئەو توانایەیان تیا ئەهێنێتەئاراوە کە بتوانن هێرش بکەنە سەر ئەوانی دی. مرۆڤ وەك پێویست ناچارە بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییە سروشتییەکانی خۆی، دەسەڵات بەدەست بهێنێت. ئارەزووی زاڵبوون بەسەر ئەوانی دیکەشدا، بەشێکە لەو دەسەڵات خوازییە. مرۆڤ بە پێی غەریزە، دەیەوێ بەسەر ئەوانیتر دا زاڵ بێت و ئەو کارەشی چەندین هۆی جۆراوجۆری هەیە. یەکەم" بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتخوازی ئەوانیتر و رێگرتن لە زاڵبوونیان پێویستی بەدەسەڵات هەیە. دووهەم، لەبەرئەوەی کە سامانی دنیا هێندە زۆرنییە کە لە نێوان هەموانندا

وەك پێویســت دابــەش بکــرێ. مەبەســت لــە دەســەڵاتخوازی، بەدەســتهێنانی دەســەڵاتە. هــەروەك هــۆبس ئــەڵێ "زۆربــەی مرۆڤەکان لەیەككاتدا شتێکیان دەوێ کەناکرێ لە نێوان هەمواندا دابەش بکرێت، یان بەکۆمەڵ کەڵکی لێ وەربگیردرێت". سێهەم" ئەوەی کەمرۆڤ خۆی لە خۆیدا پلەو پایە پەرستە. مرۆڤ عاشقی شکۆوگەورەیی و مەزنایەتییە. لەو روەوە کە سەروەری کردن بەسەر ئەوانی‌تردا، لە پێداویستییەکانی پایەبەرز بوونە، کەواتە هەموان ناتوانن پایەبەرز بن. هۆبس لەبارەی پلەوپایەوە ئەڵێ:

لەبــەر ئــەوەی کــە پایەبــەرز بــوون مانــای "باشــتربوون" ئەگــەینێت و ئــەم حاڵەتــەش لــەکاتێکدا مانــاو بــەهای ئــەبێت کــە لەگەڵ پلەو پایەخوازەکاندا بەراورد بکرێت. واتە ئەگەر هـەموان پایەبەرز بن، کەواتە کەس باڵامەقام نییە.

کەواتــە هەســتە سروشــتییەکانی مــرۆڤ، راســتەوخۆ کێشــەگەلێکی سیاســییان لــێدەکەوێتــەوە. بــەهــۆی ســنورداریی ئیمکانات مادییەوە، پێوەندی عاتیفی نێوان مرۆڤەکان لەکەمترین ئاســتی خۆیدایــە و هــەروەها مــەیلی دەســەڵاتخوازیشــیان تێداهەیـە. مرۆڤـەکان بـەفیترەت، بوونەوەرگـەلێکی کۆمەڵایـەتی و ئاشــتیخوازنین. ئــەوان بــۆ بەدەســت هێنــانی پلەوپایــەو بەرژەوەندییــەکانیان، کۆمــەڵگا پێــك ئــەهێنن و ئــەم دوانــەش [پلەوپایەو بەرژەوەندی] لە رێگای زاڵ بوون بەسەر ئەوانی تردا باشتر بەدەست ئەهێنرێن، وەك لە رێگای هاوکاری کردن لەگەڵ

یەکتری‌دا. بە کورتی، مرۆڤ بەفیترەت شەڕئاشۆیەو هەمیشە ئەو خەسڵەتەی لەگەڵدایە. هەر بەم هۆیەشەوە هۆبس دەڵێ "خەڵك تا دەسەلاتێکیان بەسەرەوە نەبێت، لە پێوەندییەکانیان رازی نین (بەترس و دڵەڕاوکێ‌یەوە ژیان ئەبەنەسەر).... هەر بۆیە ئەگەر دەسەلاتێکیان بەسەرەوەنەبێت تاکوو کۆنترۆڵیان بکات، لە بارودۆخێکدا ئەژین کە وەك حاڵەتی جەنگ وایە، واتە جەنگی مرۆڤ، لە دژی مرۆڤێکی‌تر". مرۆڤ تەنها لەرێگەی بڕیارگەلی کۆمەلایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێزەوە دەتوانێ لەو بارودۆخە نەخۆشە کە سروشت بۆی هێناوەتە ئاراوە، خۆی رزگار بکات.

تێگەیشتنی فرۆید لە وەزعی مرۆڤ، بە تەواوەتی وەك تێگەیشتنەکەی هۆبس وایە. مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی شەڕاشۆیە. نەفس "وەك قازانێکە کە هەمیشە لە کولاندایە" هەموو مناڵێکیش دەتوانێ ببێتە ملهوڕێك کە وێڕای خۆشحاڵی، بەمەبەستی جی‌بەجێ کردنی داواکارییەکانی خۆی، ئەوانی تر لەناوببات، یان وایان لی‌بکات گوێ ڕایەڵی بن.

مرۆڤ "خۆبەزل زان" لە دایك دەبێ: "پێم بدە!"، "باوکە گوێم لی‌بگرە!" لە قسە رۆژانەکانی منالانن. کاتێ منالان باوکی خۆیان بەدوژمنێك ئەزانن بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی دایك، لەوکاتەدا حەز بەمەرگی باوکیان دەکەن. فرۆید ئەمەی بە "گرێی ئۆدیپ" ناودێرکرد. بەتەنها "بی‌هێز بوونی سروشتی" و

هێزە کۆنترۆلکەرەکانی کۆمەڵگا دەتوانن رێگە لە جێبەجێ کردنی ئەم داواکارییە سروشتی و دیکتاتۆرییانە لە لایەن مرۆڤەوە بگرن.

ئەم "گری"یانەو هەروەها مەیلی شەڕاشۆیی بە هیچ شێوەیەك لەنێو ناچن، بەڵکوو تەنها بە هۆی هەڕەشەکانی هێزێکی سەروو کۆمەڵایەتی، یان دەسەڵاتی "super ego" وە قابیلی کۆنترۆڵ کردنن. مرۆڤ بە شێوەیەکی فیتری حەزدەکا بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بێت. ئەگەر بارودۆخەکە گونجاوو لەبار بێت، ئەو داواکارییانەش سەرهەڵ ئەدەن، بۆ نموونە، لەشکرە سەرکەوتووەکان هەمیشە بن دەستەکانیان قەلاچۆدەکەن و دەس‌درێژیشیان ئەکەنەسەر.

فرۆید لە کتێبەکەیدا "شارستانییەت و ناشیرینییەکانی"، وێنایەکی جوان و پڕ ناوەڕۆك لەم تێگەیشتنە نالەبارەی کە سەبارەت بە رۆحی مرۆڤ لە ئارادایە، ئەخاتەڕوو:

مرۆڤەکان بوونەوەرگەلێکن کە بەفیترەت شەڕاشۆیی لە بوونیاندا هەیە و بەشێکی زۆریشی داگیرکردووە. دەرەنجامەکەشی ئەوەیە کەدراوسێ، نەك تەنها هاریکار، یان وەك کالایە، بەڵکوو کەسێکە کە مرۆڤ، شەڕاشویی و تووڕەبوونی خۆی بەسەرا ئەڕێژێت و بە بێ‌هیچ پاداشپێدانێك ئەیچەوسێنێتەوە و قەلاچۆی دەکاو هەروەها کەسایەتی پامال دەکاو بەبێ پرس پێ‌کردن، داراییەکانی زەوت ئەکاوتووشی

گێچەڵیشـی دەکـاو ئەشکەنجەشـی دەکـاو دوایـیش دەیکـوژێ. "مـرۆڤ گـورگی مرۆڤـە"" بـە پێـی هـەموو ئـەو ئەزموونانـەی کـە لـەمێـژوودا دووبـارە بوونەتـەوە، کـێ ئـەوێرێ گومـان لـەو قسـەیە بکات؟!

بـەهۆی ڕووبەڕووبونـەوە لەگـەڵ ئـەو هـەموو هۆکـارە ڕووخێنـەرو بەهێزانـەدا "کۆمەڵـگا شارسـتانییەکان هەمیشـە لەبـەردەم مەترسـی ڕووخـان و هەڵوەشـانەوەدان" کۆمەڵـگا دەبـێ هەمیشە هـەوڵی ئەوەبدات لەگـەڵ تاکەکانیدا دوژمنایـەتی نـەکات تـاکوو ئـەوەش نەبێتـە هـۆی شـەڕو پێکـادان لـە نێوانیانـدا. جێگیرکردنـی یاسـاو "مقـــــرَرات" و بەڕێوەبردنیشـیان بەسەرکەوتنێکی باش بۆ هەموو حکوومەتێك لە قەڵەم دەدرێ. بە پێـی سروشـتی مـرۆڤ، شارسـتانییەتەکان تاسـەر سـەرکەوتن بەدەست ناهێنن و لەگەڵ ئەوەشـدا سـەرکەوتنەکانیان هـەمووکات ئەو مەترسییەیان لـە بەردەمدایـە کـە تێك بشـکێنرێت. پشـێوی و شڵەژاوێتی کۆمەڵایەتی، تەقریبـەن لـە هـەموو کۆمەڵـگایەکدا هـەن و بوونیشیان حاشا هەڵنەگرە.

بەهـەرحاڵ، لـە ڕوانگـەی فرۆیـدەوە، ئـەوە بیرکردنەوەیـەکی نادروسـتە کـە دەزگـا حکوومـەتی و کۆمەڵایەتییـەکان، بـە بەرپرسیاری شەڕاشۆیی و پێکادانە مرۆییەکان لـە قەڵـەم بـدرێن. ئەم جۆرە دەستنیشان کردنەی هۆکارەکـان، شتێکی نادروست و نابـەجێیـە. بـۆ نموونـە ئـەم تێگەیشـتنە مارکسیسـتییە کـە

موڵکداریەتی تایبەتی بە هۆکاری کێشە سیاسییەکان و پێکادانە ڕۆحییەکانی مرۆڤ دەزانێ، تەواو نادروستە. لە ناوبردنی موڵکایەتی شەخسی و دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ناچینایەتی (بێ تەبەقە) ڕەنگە قازانجگەلێکی ئابووری هەبێت و ڕەنگە نەشیبێت. دەرەنجامە ئابوورییەکان هەرچییەك بن، بەدڵنیاییەوە گۆڕانکارییە سیاسییەکان ناتوانن سەرچاوەی شەڕاشۆیی لە مرۆڤدا وشك بکەن. غەریزە سەرەتاییەکانی مرۆڤ، لە پێش هاتنە ئارای سیستمی موڵکایەتیش هەروجوودیان هەبوە و ئەگەر سیستمی موڵکایەتیش هەڵوەشێتەوە، دیسانەوە هەر دەمێننەوە. کۆمەڵگای ناچینایەتی مارکسیستیش وەك هەموو کۆمەڵگاکان، بەگواستنەوەی غەریزەی شەڕاشۆیی تاکەکانی خۆی بۆلای دوژمنی دەرەکی، دەتوانێ تاڕادەیەکی زۆر تەبایی ناوخۆیی دابمەزرێنێت. بەڵام بەگشتی ئەوە گەلاڵەیەکی مارکسیستی ساتەوەختییەو تاسەر بڕناکات. پاش سەرکەوتنی کۆمۆنیزمی جیهانی، کۆمەڵگا سەرلەنوێ ڕووبەڕووی ئەو کێشە هەمیشەییەی شارستانییەتی مرۆڤ دەبێتەوە کە چۆن خۆی لەگەڵ شەڕاشۆیی تاکەکەسیدا بگونجێنێت؟ فرۆید بە سەرسووڕمانەوە ئەم پرسیارە دەکا: "مرۆڤ نیگەرانە لەوەی کە "سۆڤێتی"یەکان، پاش لە ناوبردنی بۆرژوازی لەم وڵاتەدا چی دەکەن؟".

## کێشەی شەڕاشۆیی : دەستنیشان کردنی گەش بینانەتر

خاڵی بەرانبەری مەسەلەی گرنگی "دەس‌نیشان کردن"ئەو تیۆرسێنە هزرمەندانەن کەشەڕاشۆیی و خراپکاری بە شتێکی فیتری بۆ مرۆڤ لە قەڵەم نادەن. ئەوان، لە جیاتی ئەوەی ریشەی پێکادانە مرۆییەکان و توندو تیژی و نامۆبوونەکان بگەڕێننەوە بۆ "زاتی" رۆحی مرۆڤ، بە پێچەوانەوە هەندێك لە تیۆرسێنەکان سەرچاوەکەیان ئەگەڕێنەوە بۆ "بڕیارە دەسکردەکانی" کۆمەڵگا مرۆییەکان. هەندێك لەم تیۆرسێنانە، قایلن بەوەی کە سۆز و عاتیفەی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا شتێکی باش و بە نرخە. هەندێکی تر، مرۆڤ بە بوونەوەرێکی بێ‌عاتیفە دەزانن هەربۆیە بەوە قایلن کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن کاریگەری لەسەر دابنێن. هەر چۆنێك بێت بە پێی ئەم جۆرە تێگەیشتنە دەبێ هۆکاری سەرەکی پشێوییە کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها پێکادانەکان لەناو تەرتیباتی پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکاندا بدۆزینەوە. ئەم زنجیرە پلەوپایانە، هۆکارێکە بۆڕێگرتن لەویستی ئاشتیخوازانەی تاکەکان. بەواتایەکی تر، رێکخستنی ئەو پلەوپایانە بە شێوەیەکی نادروست ئەنجام دراوە، لەکاتێکدا دەتوانن بە شێوەیەکی باش و گونجاو رێك بخرێن.

بۆ نموونە ئەرستۆ لەوباوەڕەدابوو کە"سروشت" لە بنەڕەتدا رێکوپێك و یەکپارچەیە. مرۆڤ دەتوانێت تەنانەت

بەشتێکی "عەقلانی"شی لە قەڵەم بدات واتە" "دیاردەیەکی بە ئامانج". ئەو دەڵێ "هەر چییەك کە بە هۆی سروشتەوە بەرهەم بهێنرێت ناتوانێت شتێکی ناڕێکوپێك بێت چونکە سروشت هەمیشە بەرهەم هێنەری نەزم و ڕێکوپێکییە. ئەم پرەنسیپە سەرەکییە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤیش ڕاستی لەخۆدەگرێ.

بە پێی لێکدانەوەکەی ئەرستۆ، مرۆڤ بوونەوەرێکە کە هەمیشە هەوڵ ئەدات بۆبەدەست هێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە تەکامووڵ. "سروشت" داواکارییەکانی مرۆڤی بەرەو "باشتر بوون" بردووە. ئەرستۆ لەوباوەڕەدابوو کە "هەموو مرۆڤەکان بەم تەسەورەوە دەژین کە هەموو چالاکییەکانیان بۆ بەدەست هێنانی "فەزەیلەت"ە. فەزیلەتە چاکەکانی مرۆڤ، بەرهەمی عادەت و ڕاهێنانەو هەر بۆیە پێویستی بەفێرکردن و ڕاهێنان هەیە. تەڵقین کردنی فەزیلەت ـ هەروەها ڕەفتاری شارستانی ـ وەك فرۆید و هۆبس باسیان دەکرد بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەستە سروشتییە دژەکۆمەڵایەتییەکان نییە، چونکە فەزیلەتی ئاکاری نەبە هۆی سروشتەوە و نەبۆ بەرەنگاری کردنی سروشتیش لە مرۆڤدا هاتۆتە ئاراوە، بەڵکوو بواری بۆ گەشە کردنی مرۆڤ ڕەخساندووە.

کۆمەڵگای سیاسی، لەگەڵ خواستە دەروونییەکانی مرۆڤدا سازگارە، چونکە "مرۆڤ بەفیترەت ئاژەڵێکە کە حەز بەژیانی ناو کۆمەڵگای سیاسی ئەکات" کەواتە ئەرستۆ هەرچەند بەرانبەر

عاتیفـــه و ســـۆزه مرۆڤییـــەکان، کـــە خولقێنـــەری کێشـــە سیاسـییەکانن، کەمتەرخـەمی نـەدەکرد، بـەڵام بـە بـیروڕای ئـەو، فێرکـردن و راهێنـانی بـاش و هـەروەها پێکهێنـانی دەزگاگـەلی گرنگـی [سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و...] دەتـوانیٚ کۆمەڵـگاگەلێکی تاڕادەیـــەك یەکپارچـــەو رێـــكوپێـــك دابمـــەزرێنیٚ. بـــەم پێیـــە، بـەپێچـەوانەی ئـەو بانگەشـانەی کـەپێشـتر باسمـان لـیٚکـردن، نـاتوانین سروشـتی دژە کۆمەڵایـەتی بـوونی مـرۆڤ، بـەهۆکـاری پشـێوی سیسـتمی کۆمەڵایـەتی لـە قەڵـەم بـدەین، بـەڵکوو هۆکـەی دەگەڕێتەوە بۆتێکچوونی دەزگا سیاسی و کەلتوورییەکان.

رۆسۆ، بە شێوەیەکی لێبڕاوانـەتر دژایـەتی ئـەم تێگەیشـتنە رەشبینانـە ئـەکات کـە هـۆی پشـێوییە کۆمەڵایەتییـەکان بخرێتـە ئەسـتۆی سروشـتەوە. ئـەو کتـێبی "وتارێـك سـەبارەت بـە سەرچـاوەی نایەکسـانی" بەڕسـتەیەکی کـورت لـە کتـێبی "سیاسـەت"ی ئەرسـتۆ دەس پـیٚدەکا کـە بـەم جۆرەیـە: "دەبیٚ سروشت لە ناو شتە سیستماتیکەکاندا ببینینـەوە" نـەك لـە شتە گەندەڵ و داڕزیوەکانـدا" دوای ئـەوە دەس ئەکاتـە رەخنـەگرتن لـە باوەڕەکـانی ئـەوانی تـر بـە تایبـەت لـە تێگەیشـتنەکەی هـۆبس سەبارەت بە هۆکاری پشێوییە سیاسییەکان.

رۆسۆ لەو بڕوایەدابوو کـە "مـرۆڤ لـە بنەڕەتـدا شەڕاشـۆنییە. مرۆڤـەکان بـەفیترەت وەحشـی خـولقێنراون نـەك خراپکـار و شەڕاشۆ. مرۆڤەکان لە بەرانبەر شەڕ ئاشۆبیەکانی ئەوانیتردا لـە

خۆیان دیفاع دەکەن، بەڵام حەزیان لە چەوسانەوەی ئەوانی تر نییە". مرۆڤ بەفیترەت بەرگری لە خۆی ئەکات، مرۆڤ بەفیترەت ئەو ویستە شەڕاشۆییەی تیانییە کە ئەوانی‌تر کوشت‌وبڕو قەڵاچۆ بکات. لە راستیدا رۆسۆ لەو باوەڕەدایە کە سۆزەکان لە ریزی هەستە سروشتیەکاندان و خۆپەرستی مرۆڤ کەم ئەکەنەوە و هانی ئەدەن کە بە دڵسۆزییەوە یارمەتی هاوچەشنەکانی خۆی بدات. کەواتە ئەو باوەڕەی هۆبس کەپێی وابوو خەڵك بەفیترەت شەڕاشۆو توندو تیژیکەرن، نادروستە. لەراستیدا "هیچ شتێك لەو مرۆڤە بێخەوش‌تر نییە کە تازە لە دایك بووە" هەڵەی هۆبس لەوەدایە کە لایەنە سۆزاوی و ناسکەکەی سروشتی مرۆڤ دەرك ناکات و مرۆڤ بە خاوەنی عاتیفەگەلێك دەزانێ کە لە راستیدا لە ژیانی ناو کۆمەڵگایەکی گەندەڵەوە بەرهەم هاتوون.

بەم جۆرە لە لێکدانەوە و راڤەکارییەکانی رۆسۆدا، سەرچاوەی شەڕاشۆیی و خراپکارییەکانی مرۆڤ ئەگەڕێتەوە بۆ نالەبارو نادروست بوونی نەزمی کۆمەڵگا. مرۆڤەکان لە بنەڕەتدا یەکسان خوڵقێنراون و ئەوە گۆڕانگارییە کۆمەڵایەتییەکانن کە نایەکسانییە بچووکەکان گەورە ئەنوێنن و هەروەها هەندێ نایەکسانی تازەش ئەهێننە ئاراوە. رۆسۆ لەسەرەتای کتێبی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا دەڵێ: "مرۆڤەکان ئازاد لە دایك دەبن بەڵام لە هەموو شوێنێکدا یەخسیرو زنجیرکراون". راستە کەروونکردنەوەی هۆکارەکانی ئەم دیاردە، لە حەدس

وگریمانەیەك زیاترنین، بەڵام ئەوە مەسەلەیەكی روونە كە دەزگا كۆمەڵایەتییەكان، هۆكارگەلێكن مرۆڤ هەرچی زیاتر لە ئازادی و یەكسانی سروشتی دووردەخاتەوە.

بەبیروڕای رۆسۆ، لەناو هەموو ئەو دەزگا كۆمەڵایەتییانەی كە مرۆڤ هەمیشەزراندوون، دەزگای "موڵكداریەتی تایبەتی "یەكێك لە گەورەترین هۆكارو سەرچاوەگەلی نایەكسانییە سروشتییەكانە. هەڵبەتە رۆسۆ وەك ماركس سەرچاوەی هەموو خراپی و كێشەكانی ناگەڕێنێتەوە بۆ موڵكایەتی شەخسی، بەڵام لە هەمان كاتیشدا لەناو لێكۆڵینەوەكانیدا بۆ دەستنیشانكردنی هۆكارەكانی قەیرانی موڵكایەتی، رۆڵێكی سەرەكی ئەبینێت:

یەكەم مرۆڤێك كە پارچە زەوییەكی داگیركرد و حەسارێكی بە دەوریدا كیشاو بە هی خۆی لە قەڵەمدا ـمرۆڤە سادە و كەم ئەقڵەكانیش باوەڕیان پێ‌كرد ـــ لە راستیدا بناغەدانەری كۆمەڵگای مەدەنییە. ئەگەر مرۆڤ ئەو دیوارانەی رووخاندبایەو بە هاوچەشنەكانی خۆی بگوتایە ئاگاتان لە خۆتان بێت گوێ لە قسەكانی ئەو فێڵبازە مەگرن، لەو حاڵەتەدا مرۆڤ لەدەست ئەو هەموو تاوانباری و جەنگ و جینایەت و مەترسی و نەهامەتییانە رزگاری ئەبوو. ئەگەر ئێوەش ئەوەتان فەرامۆش كردووە كە بەرهەمەكانی "سروشت" هی هەموو خەڵكن و زەویش موڵكی تاكەكەسی هیچ كەس نییە، مەسەلەكەتان دۆڕاندووە.

رۆسۆ بانگەشەی ئەوەی ئەکرد کە مۆڵکایەتی، بە هۆی ئەو دەورە گرنگەی کە بۆ تێکدانی یەکسانی و بەرابەری کە لە ناو کومەڵگا سەرەتاییەکاندا بینیویەتی، نایەکسانییەکی یەگجار مەترسیداری هێناوەتە ئاراوە". مرۆڤ بە هۆی ئەو نائەمنییەی کە "دەزگای مولکایەتی" ئەیهێنێتە ئاراوەو لەو "حاڵەتی جەنگ"ە دەچێ کە هۆبس باسی دەکرد (بەم جیاوازییەوە کە هۆبس "حاڵەتی جەنگ"ی لەناو کۆمەڵگا مرۆڤییەکاندا بە شتێکی سروشتی لە قەڵەم ئەدا، نەك کۆمەڵایەتی) بە نائومێدییەوە بە مەبەستی رزگاربوون لەو گێچەڵە، دەست ئەکات بە دامەزراندنی دەزگاسیاسییەکان. بەڵام ئەو دەزگایانەش تەنها بۆ تاقمێك سوود و قازانجیان ئەبێت و بۆ ئەوانی تر جگە لە کێشەوگرفت هیچ دەسکەوتێکی نابێت. دەزگا تازە دامەزراوەکان تەنها داکۆکی لەو نایەکسانییانە ئەکەن — هەروەها لە رووی چەندایەتیشەوە زیاتریان ئەکەن — کە پێشتر کێشەگەلێکی زۆریان لێ‌کەوتبوەوە. "مرۆڤەکان هەموویان بەهیوای بەدەست هێنانی ئازادی ئەکەونە دوای کۆتوبەند و زنجیرەکانی کۆیلەتییەوە.... بەڵام هێندە بە ئەزموون نین کە بتوانن زەرەرو زیانەکانی دەرك بکەن". هەر لەبەر ئەوەشە کە بونیادەکانی کۆمەڵگا و یاسا، بۆ هەزاران کۆت و زنجیر و بۆ دەوڵەمەندان دەسەلات دەهێننەئاراوە....، ئازادی سروشتی لەناوئەبەن و بۆ هەتاهەتایە یاساکانی مولکایەتی و نایەکسانی سەقامگیردەکەن

و بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی تاقمێکی پلەو پایەخواز، مرۆڤ تووشی کۆیلەتی و کرێکاری و بێچارەبوونێکی هەمیشەیی ئەکەن".

شانبەشانی ئەو رەخنانەی کەرۆسۆ لە هۆبسیان دەگریٚ، هەندیٚ تیۆرسێنی وەك ئەریك فرۆم و هێربێرت مارکۆزەش رەخنە لە فرۆید دەگرن. فرۆم و مارکۆزە، لە هەموو مەسەلەکاندا یەك ناگرنەوە بەلاّم لەو مەسەلەدا کە فرۆید لە دەستنیشانکردنیهۆکارەکانی شەڕاشۆیی مرۆڤدا بە هەڵەداچوە، هاوبیرووڕان. ئەوە لەکاتێکدایە کە فرۆید هەروەك پیشانی داوە، لەو باوەڕەدایە کە شەراشۆیی دیاردەیەکی فیترییەو ناتوانین لە رۆحی مرۆڤی بسرینەوە، بەلاّم فرۆم و مارکۆزە ئەو دیاردەیە بە پەرچەکرداری مرۆڤ لە بەرانبەر بارودۆخە کۆمەلاّیەتی و بگۆڕەکاندا لەقەڵەم دەدەن.

لە سایکۆلۆژیای فرۆم دا "شەڕاشۆیی و وێرانکاری" لە ویستە فیترییەکانی مرۆڤ نییە بەڵکوو بە پێچەوانەوە یەکێك لەگرنگترین پێداویستییەکانی "تەکاموولٚ"ە. مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن "هێزی ئەقلٚ" و "هێزی خەیالٚ"ە و کەواتە ناتوانێت بە بیٚبیرکردنەوە هەموو شتێك قبوولٚ بکات و وەك بوونەوەرێکی بیٚگیان لەگەلٚ مەسەلەکاندا مامەڵە بکات. مرۆڤ بە مەبەستی گەیشتن بە "تەکاموولٚ" دەیەویٚ لە "داهێنراو" (مخلوق) بوونی تیٚبپەڕێنێت و خۆی داهێنەر (خالق) بێت.

لەبارودۆخە لەبارو گونجاوەکاندا ئەم داواکارییە بە باشترین شێوە بەدی دێت. مرۆڤ هەندێ نیازی وەك "بەکەڵك بوون" و "تەکامووڵخوازی" لەرێگەی کارگەلێکی پڕبایەخی وەك پەروەردەکردنی منالّ و ئەنجامدانی کارگەلی هونەری و گۆرانی چڕین و هەروەها خۆشەویستی و دلۆڤانییەوە، جێبەجێ دەکا. کەواتە ویستی "تەکامووڵخوازی" بە پێی نموونە سروشتییەکانی تر هیچ مەترسییەکی بۆ سیستمی کۆمەلاّیەتی نییە. لەراستیدا ئارەزوی مرۆڤ بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگاگەلێکی سیستماتیك، رەنگە هەرلەم ئارەزوە سەرچاوە بگرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لەبەر چەندین هۆی جۆراوجۆر، رێگە سروشتییەکانی دەربڕینی حەزکردن بە "تەکامووڵ و پێشکەوتن" دابخرێن، رەنگە مرۆڤ لە رێگەگەلێکی نادروستەوە ئەو حەزەی خۆی دەربڕێت. لە هەر دوو حاڵەتدا مرۆڤ ژیانی خۆی لە هەموو ئەوشتانەی کە خۆڵقاندوونی، یان نابوودی کردوون، لاگرنگترە. وێرانکاری وشەڕئاشۆیی بەشێکی حەتمی مەیلە فیتری و دەروونییەکانی مرۆڤ نین. مرۆڤ بە تەنها مەیلی وێرانکاری لە وجوودیدا نییە. تەنها کاتێك وێرانگەر ئەبێت کە رێگە گونجاوەکانی دەربڕینی "تەکامووڵ خوازی" بەڕوویدا دابخرێن. وێرانگەری لە مرۆڤدا، تەنها "تایبەتمەندییەکی لاوەکی یە (فرعی) کە ئەویش تەنها لەکاتێکدا خۆی دەرئەخات کە "داخوازیی "داهێنەربوون"ی نایەتەدی. بە پێی ئەم لێکدانەوەیە

کە بەتەواوەتی لەگەڵ لێکدانەوەکەی فرۆیددا جیاوازی هەیە، کۆمەڵگا ناچار نییە لە بەرانبەر شەڕاشۆیی فیتری ئەندامانیدا بەرگری لەخۆی بکات، یان لەهەندێ ڕێگەی جۆراوجۆرەوە هەوڵ بدات بۆ بالاتربوونیان، واتە هەندێ ئامانجی تریان بۆ فەراهەم بکات. کۆمەڵگا تەنها ئەبێ زەمینە بۆ قابلییەتە باشەکانی تواناییگەلی فیتری خۆش بکات. سیستمی سیاسی نابێ کاری هەر سەرکوت کردن بێت، بەڵکوو دەبێ ئیمکاناتێك بۆ ئەندامەکانی فەراهەم بکات، کە لەڕێگەیانەوە داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەن.

راڤە و لێکۆڵینەوەکەی مارکۆزە تاڕادەیەك لەگەڵ بیروڕاکانی فرۆیددا جیاوازی هەیە. بەڵام ئەویش بیروڕاکانی فرۆید سەبارەت بە شەڕاشۆیی کە کاربوردێکی سیاسی کۆنەپەرستانەی هەیە، بە نادروست لە قەڵەم ئەدات، هەروەها مارکۆزە دەڵێ: فرۆید خۆی لەدوایین ساڵەکانی تەمەنیدا، شەڕاشۆیی بە پەرچەکردارییەك لەبەرانبەر مەرگ، یان "تاناتووس(Thanatos)" لە قەڵەم ئەدا. هەڵبەتە دەتوانین ئەوە قبووڵ بکەین کە مەیلی مەرگ، هەندێ مەسەلەی وەك تیاچوون، پێکادان، ئێش و ئازارو کێشەگەلێکی تری ڕۆحی لێدەکەوێتەوەو کەواتە، سەرەنجام بەواتای ڕەتکردنەوەی چەمکی "چێژوەرگرتن" دەبێت. کەواتە تەنها مەیلی سەرەکی مرۆڤ، "ئیرۆس(Eros)"ە، واتە مەیلی چێژخوازی. تا ئەو کاتەی کە جیهان دژایەتی چێژخوازی مرۆڤ

بکات و تا ئەو کاتەش کە "پرەنسیپی واقعییەت" ڕێگر بێت لەبەردەم ڕەزامەندی ئیرۆسدا، مەیلی ژیان و چێژخوازی (ئیرۆس) و مەیلی مەرگ (تاناتووس) لە دژی یەکتری دەوەستن و بەرەنگاری یەکتری ئەکەن. ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئەگەر واقعییەتەکان، بوار بۆ جێبەجێکردنی چێژخوازی بڕەخسێنن، مەیلی مەرگ هێز و توانای خۆی لە دەستئەداو لەناو مەیلی چێژخوازیدا ئەتوێتەوە. بەوتەی مارکۆزە، تا کێشمەکێشی نێوان مەرگ و ژیان کەمتر بێت، ژیان زیاتر لەقۆناغی خۆشی و چێژوەرگرتن نزیک دەبێتەوە. تا زەرورەتی هۆکارەسەرکوتکەرەکان زیاتر لەناوبچێت، مەیلی چێژخوازیش زیاتر مەیلی مەرگ کەمتر دەکاتەوە.

مارکۆزە دەڵێ: ڕاستییەکەی ئەوەیە کە توانای بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، بیروڕای فرۆیدی سەبارەت بە "پرەنسیپی واقعییەت" ڕەتکردۆتەوە. فرۆید لەو باوەڕەدا بوو کە "حەقیقەت" بەتەواوەتی دژی ئەو خواستانەیە کە مرۆڤ بە هێمنی و ئاسوودەیی دەگەینن. مارکۆزە پێی وایە ئەم قسەیە سەبارەت بەو کۆمەڵگا دەوڵەمەندانەی کەتیایاندا هیچ "کەمایەسی"یەك لە هیچ بوارێکدا نەماوە، ڕاستی لەخۆناگرێت. بەڕای مارکۆزە، ئەم تێگەیشتنە لەسەر "ئەسڵی حەقیقەت" بەشێکی زۆری لێکدانەوەو ڕاڤەکارییەکانی فرۆیدی لەسەر "فیتری بوونی شەڕاشۆیی مرۆڤ"ی گرتۆتەوە. بەڵام بەڕای فرۆید، سەبارت بە "ئەسڵی حەقیقەت" تەنها ڕەنگدانەوەی

قۆناغێکی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتییە. ئەم باوەڕانە تەنها هەندێ تێگەیشتنی مێژوویی بوون، نەك سروشتی و بیۆلۆژیکی.

ماركۆزە بەو دەرەنجامە گەییشت کە لەکۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، سەر کوتکردن بەشێك لە پێداویستیەکانی کۆمەڵگا نییە. ئەگەر کۆمەڵگا مۆدێرنەکان، ئیمکاناتی جێبەجێکردنی داواکارییەکانی تاکەکانیان بە تەواوەتی فەراهەم نەکەن، لەراستیدا بواریان بۆ شکستهێنانی خۆیان رەخساندووە. کاتی ئەوە هاتووە کە مرۆڤ بە ئازادی بگات. مارکۆزە باوەڕێکی پێچەوانەی باوەڕەکەی فرۆیدی هەبوو. مارکۆزە، تێگەیشتنی "فرۆیدانە" و هەروەها ئەوەی کەشارستانییەت دەبێ بەردەوام دژایەتی ئەو کەسانە بکات کە ناڕەزایی دەرئەبڕن، ڕەتکردەوەو لە جیاتی ئەوە، "مەیلی چێژخوازی" پێشنیارکرد کە بەڕای ئەو، لەقاوغی شارستانییەتی مردووی ئەمڕۆدا دیلکراوەو ژاکاو. ئەڵبەتە ئەمانە وێناگەلێکی یەکجار کورت کراوی هەندێ لێکۆڵینەوەو راڤەکاری قورسن لەسەر کێشە سیاسییەکانی مرۆڤ. بۆ دەرك كردن و تێگەیشتن لەگرنگیی ئەم لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکارییانە، ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئاسەوارەکانی ئەو هزرمەندانە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت ئەو بابەتە کورتکراوانەش، قۆناغی دەستنیشانکردنی تیۆرە سیاسییەکان دەرئەخەن و هەروەها زەمینە بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر "لۆژیکی چالاك"ی بیرکردنەوەی سیاسی خۆش ئەکەن.

# دەستنیشان کردنە جۆراوجۆرەکان و تێگەییشتنە تاکەکەسییەکان

بۆ نموونە لەم قۆناغەدا ئەو توانایە لە ئارادایە کە تیۆرسێنەکان، لە ڕێگەی دەرەنجامگەلێك کە لە قۆناغی دەسنیشان کردندا بەدەستیان هێناوە، ڕاڤەی هەڵوێستە ناچونیەکەکان بکەن. ڕەنگە بتوانین لەوە تێبگەین کە چۆن ئەم تێگەیشتنە ناهاوچەشنانە، بونیادی تێگەیشتنە ناتەباکان بۆ وێناکردنی کۆمەڵگایەکی بەختەوەر فەراهەم دەکەن و، هەروەها چ ڕێگاچارەگەلێك دیاری دەکەن؟

ئەو دەستنیشانکردنەجۆراوجۆرانەی کە لە لایەن هۆبس، ڕۆسۆ، فرۆید، پاین، برێك و مارکۆزەوە سەبارەت بە سەرچاوەی نەزانین و شەڕاشۆیی مرۆڤ و ئەو بێنەزمییانەی کە لێیان کەوتوونەتەوە، ئەنجام دراوە، لەڕاستیدا ڕەخنەگەلێکی جۆراوجۆرن کە لەو سیستەمە سیاسییە دەگیردرێ کە لە ئارادایە. لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگایەك، بە پێیباوەڕەکانی هۆبس سەبارەت بەسۆزە سروشتییەکانی مرۆڤ، بە تەواوەتی جیاوازی هەیە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەسەر هەمان کۆمەڵگا بەپێیباوەڕەکانی ڕۆسۆ. لەبەرئەوە کەهۆبس لە ڕووی فیترییەوە مرۆڤ بە بوونەوەرێکی شەڕاشۆ دەزانێ، بەو دەرەنجامە لۆژیکییە دەگا کە ئەبێ دەسەلاتدارە سیاسییەکان بەتەواوەتی بەهێز بن. وە لەبەر

ئـەوەی کـە رۆسـۆ لـە رووی فیترییـەوە مـرۆڤ بـە بوونـەوەرێکی عـاتیفی و خـاوەن سـۆز دەزانـێ، بونیادەکـانی سیسـتمی سیاسـی لای ئەو، فـۆرمێکی تـەواو جیاوازیـان هەیە و بە هـۆی هـەمان ئـەو جیـــــاوازی راڤەکارییەکانیانـــــەوە، ســــەبارەت بــــە دەستنیشـانکردنیهۆکارەکان، ئـەو کۆمەڵـگایەی کـە لای رۆسـۆ نامەشـرووع و چەوسـێنەر و زاڵمـە، بـە پێچـەوانەوە هـۆبس بـە کۆمەڵـگایەکی کـزو بـێهێـزی دەزانـێ کـە لەبـەردەم مەترسـی هەڵوەشانەوەدایە.

ئەم قسەیە دەربارەی ئەو هزرمەندانەش کە پێشتر باسمان کـــردن، راســـتی لـــەخۆدەگرێ. ئـــەو زنجـــیرە پلـــەو پایـــە کۆمەڵایەتییانـەی کـە برێك بـە زەرووری و گونجـاوو سروشـتی لـە قەڵـــەمیان ئـــەدات، رەنگـــە لای "پـــاین" تـــەواو ناسروشـــتی و ناپێویسـت و سـەرکوت کـەربن.ئـەو کۆمەڵـگایەی کـە بـەبیروڕای فرۆیـــد، بـــە مەبەســـتی هیۆرکردنـــەوەی هێـــزە رووخێنـــەرو تێکدەرەکانی "سیستم" دژایەتی "هـەژاری و دەسکورتی" دەکا، بە پێچـەوانەوە بەڕای مـارکۆزە، بە سیسـتمێکی سـەرکوتکـەری کۆمەلایەتی لە قەڵەم ئەدرێ کە رۆحی ژیان لە تاکەکانی کۆمەڵـگا ئەسێنێتەوە.

کەواتــە بـە پێـی ئـەو نموونانـەی سـەرەوە دەتـوانین بـۆ دەستنیشـانکردنی هۆکـار پشـێوییە سیاسـییەکان، تێگەیشـتنی مەحافیزەکارانـە لـە تێگەیشـتنی رادیکـاڵ جیـا بکەینـەوە. ئـەو

تیۆرسێنە سیاسییەی کە هۆی بێنەزمییە سیاسییەکان ئەگەڕێنێتەوە بۆ هۆکارو دیاردە سروشتییەکان، ـ سروشت بەو شێوەیەی کە هەیە ـ مەحافیزەکارترە لەو تیۆرسێنەی کە هۆی بێنەزمی سیاسی ئەگەڕێنێتەوە بۆ دەزگا دەسکردەکانی مرۆڤ و هەروەها ئەو پلەوپایانەی کە مرۆڤ خۆی هێناویەتی ئاراوە. هەر بەهەمان شێوە ئەو تیۆرسێنەی کە رۆحی "تاك" بەسەرچاوەی بێنەزمی سیاسی لە قەڵەم ئەدات، بەگشتی لەو تیۆرسێنەی کە کردەوە نادروستەکانی کۆمەڵگا بە هۆکاری بێنەزمی سیاسی لە قەڵەم ئەدات مەحافیزەکارترە. وێنای سادەو لە هەمان کاتیشدا دروستی ئەم پێوەندییە بەمجۆرەی خوارەوەیە:

| هۆکارە دەسکردەکان ⟵⟶ هۆکارە سروشتییەکان |
|---|
| رادیکاڵ ... مەحافیزەکار |
| کۆمەڵگا ⟵⟶ تاك |

دەرككردنی پێوەندی نێوان هۆکارەکانی پشێوی و هەڵوێستە سیاسییەکانی رۆشنبیران کارێکی دژاوارنییە. چونکە ئەو حەقیقەتانەی کە بە سروشتی (بەو مانایەی کە لێرەدا کەڵکی لێوەرئەگرین) لە قەڵەم ئەدرێن، مرۆڤ ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك بیانگۆڕێت. مرۆڤ تەنها دەتوانێ سیستەمە سیاسییەکەی خۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخە سروشتییەدا بگونجێنێت. ئەڵبەتە بە هۆی ئیمکاناتی هونەریو زانستییەوە دەتوانرێ تارادەیەك کۆنترۆڵ، یان "تەعدیل" بکرێن، بەڵام هەرگیز ناگۆڕدرێن و رزگاربوون لە دەستیشیان مەحاڵە.

بۆ نموونە ئەگەر بە پێی قسەکانی فرۆید، شەڕاشۆیی مرۆڤ بەشتێکی سروشتی لە قەڵەم بدەین، لەو حاڵەتەدا بڕیارە سیاسییەکان تارادەیەکی زۆر دەچنە ژێرکاریگەری ئەم واقعییەتەوە. بەرنامە سیاسییەکان تەنها دەتوانن نموونەگەلێکی شەڕاشۆیی مرۆڤ، بە شێوەیەك رێك بخەن کە ئاژاوەیان لێ نەکەوێتەوە. ئەڵبەت هیچ بەرنامەیەکی سیاسی ناتوانێ بە بێ لەناوبردنی یەکجارەکی مرۆڤ، شەڕاشۆیی لەناو بەرێت. بەواتایەکی تر ئەگەر شەڕاشۆیی مرۆڤ بە بەرهەمی نالەبارێتی بارودۆخی سیاسی لە قەڵەم بدەین ـ بۆ نموونە ئەگەر شەڕاشۆیی بە بەرهەمی موڵکایەتی شەخسی بزانین ـ ئاساییە ئەگەر تەسەور بکەین بە لەناوبردنی مرۆڤ، شەڕاشۆییش لەناو ئەچێت.

بەم پێیە کێشەیەکی تەواو تاکەکەسی، کێشەیەکی شەخسی و دەروونییەو کەواتە پێڕەوی لە رێگەچارە گشتییەکان و میتۆدە کۆمەڵایەتییەکان ناکات و بەو رەوشانە چارەسەر ناکرێت. تەنانەت کاملترین بەرنامەی کۆمەڵایەتیش ناتوانێ رۆحی شەیتانی والێبکات کە واز لە خراپکاری و شەڕاشۆیی بهێنێت. لە لایەکیترەوە ئەگەر لەیەکەم پلەدا هەستە تاکەکەسییەکانی "نامۆبوون" بەبەرهەمی گەندەڵبوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم نەدەین، لەو حاڵەتەدا هەندێ بڕیاری گونجاوی سیاسی دەتوانن رێگەچارەیەکی باش بن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە.

ئەو نموونانەی کە لە قۆناغی دەستنیشانکردنی تیۆرە سیاسییەکاندا باسمان لێکردن، ئەوە پیشان ئەدەن کە چۆن تێگەیشتنی هزرمەندان سەبارەت بە فیترەتی مرۆڤ ـ بەشێوازێك کە هەندێجار بە "مرۆڤ ناسی فەلسەفی" ناودێر ئەکرێت ــ تیۆرە سیاسییەکانیان پێك ئەهێنێت. قسە بەناوبانگەکەی مەدیسۆن لە کتێبی "وتارگەلی فدرالیست" (The Fedralist Papers)دا، ئەوە دەخاتەڕوو کە "حکوومەت خۆیلەخۆیدا هیچ نییە جگە لە بالاترین نموونەی فیترەتی مرۆڤی". هەر لێدوانێك سەبارەت بە "یۆتۆپیا" راستەوخۆ پێوەندی هەیە بە بیروڕاکانی مرۆڤەوە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ و هەروەها مەیلە سەرەکییەکان و قابلییەتەکانی هەموو مرۆڤەکان لەم زەمینەدا باوەڕگەلی تایبەت بە خۆیانیان هەیە، بەلام بەشێکی زۆری خەلك، ئاگایییەکی تەواویان لێنییە. ئەلبەتە ئەو تیۆرسێنە سیاسییەی کە بەدوای دەستنیشانکردنیهۆکارەکانی پشێوییەوەیە، ناچارە کەتێگەیشتنی خۆی سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ، بەوردبینییەکی زیاترەوە زانستیانەتر بکات. لە ئەفلاتوونەوە تا مارکۆزە ـ واتە لە٤٠٠ سال پێش لە زایینەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستا ـ تیۆرە سیاسییەکانی هەموو هزرمەندان هەولیانداوە لە لایەنە چالاکەکانی رۆحی مرۆڤ تێبگەن. لە بواری چارەسەر کردنی پشێوییە سیاسییەکاندا حەتمەن دەبێ "سروشتی مرۆڤ" لەبەرچاو بگیردرێت.

## بابەتەکانی تری قۆناغی دەستنیشان کردن

بابەتەکانی قۆناغی دەس‌نیشان کردن، هەموویان پێوەندییان بە مەسەلەی سروشتی مرۆڤەوە نییە. هەندێ جار پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە کامیەك لە بەرنامەو پلانەکانی، دەزگاکانی سیستمی سیاسی بەرپرسی شکستە ئاشکراکانە. سیستمی سیاسی، تەواو ئاڵۆزەو لە زنجیرە بگۆڕ یەك لەدوای یەك پێك‌هاتووە کە رەنگە هۆی سەرهەڵدانی بێ‌نەزمییە سیاسییەکان بن.

رەنگە کێشە و پێکدادانەکان و، هەروەها ناکاریگەربوونی سیستمی نەخۆشی کۆمەڵایەتی، لە سیستمی کۆن و خراپدابەشکردنی پلەوپایەو دەسەڵاتەوە سەرچاوەبگرن. تێگەیشتنی مارکسیستی "دژایەتییە کۆمەڵایەتییەکان" یەکێکە لەو تێگەیشتنانە. مارکس ئەیوت کە هیچ گرووپێك لە کۆمەڵگادانییە حازربێت واز لە ماف و دەسکەوت و ئیمتیازەکانی خۆی بێنێت، تەنانەت ئەگەر ئەو ئیمتیازانە نالۆژیکی و نادادپەروەرانەش بن. ئەگەر لەناو سیستمێکدا پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان ـــ واتە لە ئابووری سیاسیدا ـــ گۆڕانیان بەسەردابێت، رەنگە ئەو سەرخانە سیاسییەی کە لەسەردەمی پێشتردا دامەزراوە، ڕەتبکاتەوە. ئەو شڵەژاوێتییەی کە بەهۆی دژایەتییەکانی نێوان ژێرخانە ئابوورییەکان و سەرخانە

سیاسییەکانەوە سەرهەڵ ئەدەن، بناغەی سیستمی کۆمەڵایەتی دەڕووخێنن. ئەو شەڕ و ئاژاوانەی کە سەرەنجام بوونە هۆی ڕوودانی شۆڕشی فەرەنسە، لەم دژایەتییەوە سەرچاوەیان گرتووە. ئەریستۆکراتە فیۆداڵە کۆنەپەرستەکان کە حازرنەبوون ژیانی خۆیان لەگەڵ نەزمی تازەی کۆمەڵگادا بگونجێنن، بەناچار لەسەر پۆستەکانیان لابردران. بەڕای مارکس ئەو دژایەتی و شۆڕشە هەر دەبوایە ڕوویبدایە و لە کاتی ڕووخانی سەرمایەداریشدا بۆ جارێکیتر دووبارە دەبێتەوە. مرۆڤ تەنها لەکاتێکدا دەتوانێ بیروڕاکانی مارکس پەسەند بکات کە بزانێت سەرەنجامی لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دژایەتییە کۆمەڵایەتییەکان چیدەبێت؟

ڕەنگە کێشەکانی سیستمێکی شڵەژاوی سیاسی، لە "فەرهەنگی سیاسی" خودی ئەو کۆمەڵگایەوە سەرچاوە بگرێت: واتە لە داگەڕانە نارەسمییەکان و هەروەها لە باوەڕگەل و ئەو شێوە ڕەفتارە کۆمەڵایەتییانەی کە بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگادا زاڵە. ڕەنگە کێشەکە لە شکستی "دەزگاکانی بارهێنان و راهێنان"ەوە سەرچاوەی گرتبێت (تیۆرسێنە سیاسییە گەورەکان لە ڕاستیدا خێرخوازو ڕاهێنەری ئاکاریش بوون. کتێبی کۆماری ئەفلاتوون هێندەی نامیلکەیەکە سەبارەت بە سیاسەت، هێندەش نامیلکەیەکە سەبارەت بە فێرکردن و ڕاهێنان. لۆك لە کتێبی "هەندێ تیڕامان سەبارەت بە فێرکردن و ڕاهێنان" و ڕۆسۆ لە

کتێبی "ئیمێل"دا قسەی زۆریان لەسەر سیستمی بارهێنان و راهێنان کردووە). رەنگە کێشەکە لە نالەبارێتی دەزگای ئیداری و هەروەها لە دەرەنجامە لاوەکی و پێشبینینەکراوەکانی هەوڵدانە خێرخوازانەکانی دەوڵەتەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئەو هۆکارانەی کە قابیلی پێشبینی کردنن و دەبنە هۆی تێکهەڵشکانە بنەڕەتی و کۆمەڵایەتییەکان، یەگجار زۆرن و ژمارەیەکی زۆری تیۆرسێنەکانیش رەنگە لە قۆناغی دەستنیشانکردنی هۆکارەکاندا لێکۆڵینەوەیان لەسەریان کردبێت.

یەکێك لە بابەتەکانی دەستنیشان کردنی هۆکاری کێشە هاوچەرخەکان کە جەخت لەسەر شکستی دەزگاکان دەکاو کاریگەرییەکی گرنگی سیاسیش دادەنێ، لێدوانە لەسەر هۆکارەکانی قەیرانی ئابووری ساڵی ١٩٣٠ز. سەرچاوەی ئەو لێکدانەوەو ڕاڤەکارییە جۆراوجۆرانەی کە سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەو هەڵوەشانەو ئابوورییە خرانەڕوو، دەگەڕێتە بۆ تێڕوانینگەلێکی جۆراوجۆر لەسەر ئەو یۆتۆپیایەی کە لایەنگرانی ئابووری ئازاد (Laissez-Faire) و هەروەها لایەنگرانی "بەرنامەی نوێ"ی رۆزڤلت (New Deal) خستیانەڕوو. یەکێك لە تێگەیشتنە بەناوبانگەکان سەبارەت بە هۆکارەکانی قەیرانی ئابووری، یەکەمجار لە لایەن ئابووریزانی بەریتانی "جان مینارد کینز"ەوە خرایەڕوو. بە پێی لێکۆڵینەوەکانی ئەو، قەیرانی ئابووری دەرەنجامی ئەو هێزە

ئابوورییانەیە کە بواریان رەخساند بۆ ئەوەی کە ئابووری سەرمایەداری بەمەبەستی پێك هێنانی "هاوسەنگی" پەرە بەدیاردەی "بێکاری" بدات. واتە ویستیان هاوسەنگی بهێننە ئاراوە بەڵام پەرەیان بە مەسەلەی "بێکاری"دا. ئەو، پێشنیاری کرد کە دەوڵەت دەبێ دەس‌بەکاربێت و ئابووری لە قەیران رزگار بکات. بەشێکی زۆری ئەو ئەرکەی کە ئابووریزانە لیبراڵەکان لەبەرنامەی نوێدا، بۆ دەوڵەتیان دیاریکرد، بە هۆی ئەم راڤە و لێکۆڵینانەوە شکڵی گرت.

خاڵی بەرانبەری ئەم روونکردنەوەیە، قوڵایی و گەورەیی ئەم قەیرانە ئەگەرێنێتەوە بۆ "چالاکی"و "ناچالاکی" بانکدارە گەورەکان." بۆ نموونە میلتۆن فریدمەن ئابووری‌زانی دیاری ئەمریکی دەڵێ: ئەگەر بانکی ناوەندی، کاروبارەکانی بە دروستی بەرێوەبردایە، ئەو قەیرانەش نەئەهاتە ئاراوە، بەڵکوو راوەستانێکی بچووك ئەهاتە ئاراوە کە ئەوەش رەنگە بە هۆی ئابووری بازاری ئازادەوە چارەسەر کرابا. ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە دروست بێت، ئەو دەرەنجامە لۆژیکییەی کە بەدەست دێت، ئەوەیە کە نەك تەنها پێویست ناکات دەوڵەت بە ئاشکرا دەست لەکاروباری ئابووری وەربدات، بەڵکوو لەوانەیە دەرەنجامێکی پێچەوانەشی لێ‌بکەوێتەوە. دۆزینەوەی رێگەچارەکانی‌تریش ـ کە پێشتر باسیان لێوەکرا ـ ئاکامگەلێکی سیاسی جۆراوجۆریان ئەبێت و هەروەها هەندێ تێروانینی جۆراوجۆریش سەبارەت بە کۆمەڵگای بەختەوەر (خۆشگوزەران) ئەخەنەڕوو.

## بـــارودۆخی سروشـــتی وەك ئامرازێـــك بـــۆ دەستنیشـــان کردنی هۆکارەکان

دەرككردنـــــی نـــــاواخن و گرنگیـــــی ئـــــەم قۆناغـــــەی تیۆرەسیاسـیـیەکان ـــ واتـــە دەستنیشـانکردنـی هۆکارەکـانی بیٚنەزمی سیاسی- ئەبیٚ زەمینە خۆش بکات بۆ تێگەیشتنی ئەو بابەتـەی کـە لـەهەنـدیٚ کتـێبی تیـۆرە سیاسـیەکاندا بـەناوی "بارودۆخی سروشتی" خراوەتـەڕوو. زۆربـەی ئـەو کەسانەی کە بیروڕاکـانی رۆسـۆ، لـۆك و هـۆبس ئەخوێننـەوە، پێیـان وایـە کـە هـەموو قسـەکانیان سـەبارەت بـە بابـەتی تـەواو ئەبسـتراکتی "بارودۆخی سروشتی" تەنها شیمانەو گریمانە گەلێکن سەبارەت بە سەردەمی دێرێن، یان لـە قسـە و باسـێکی بیٚمانـا زیاتر هـیچ نـین. کێشـەی بـاس کـردن لـە بـارودۆخی سروشـتی هـەر چـییەك بێـت، ئـەو تیۆرسـێنانە کـاتێکی زۆریـان بـۆ سـەرف کـردووە. چـەمکی بـارودۆخی سروشـتی ئامرازیـك بـوو کـە تێگەیشـتنی هۆکارەکانی بۆ ئاسانتر ئەکردن.

هەولٚ و تەقەلای ئەوتیۆرسێنانە بۆ خستنەڕووی بـارودۆخی سروشـتی "ئـەزموونێکی فکـری" بـوو کـە بـە پشـت بەسـتن بـە ئەبسـتراکتە گریمانەییـەکان: سەرچـاوە کۆمەلاٚیەتییـەکانی کێشـە سیاسـی و مرۆییـەکان، لـەهۆکـارە سروشـتییەکان جیـا بکەنـەوە. ئـەم تیۆرسـێنانە بـە جیاکردنـەوەی ئـەو هۆکارانـە لـە بـارودۆخی

کۆمەڵگاکان ـــ کە بەشتێکی دەسکرد دێتە بەرچاو ـــ گریمانەیەکی ئەبستراکتیان لە ژێرناوی "بارودۆخی سروشتی"دا هێناوەتە ئاراوە. پاش جیاکردنەوەی هۆکارە دەسکرد و ناسروشتییەکان، ئەوەی دەمێنێتەوە هۆکارو رەهەندگەلێکی سروشتی و هەتایی چارەنووسی مرۆڤ بوون کەتیۆرسێنی سیاسی ئەبوایە بە بابەتگەلێکی ئاشکراو حاشاهەڵنەگریان لە قەڵەم بدا. رۆسۆ ئەم بابەتەی بەمجۆرە لێکدایەوە کە: لێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی سروشتی نابێ بە حەقیقەتێکی مێژوویی لەقەڵەم بدرێت بەڵکوو تەنها بەڵگەهێنانەوەیەکی فەرزی و مەرجدارە نەك تێگەیشتن لەسەرچاوەکەی. ئامانجی ئەم بەڵگەهێنانەوە "فەرزی"یە ئەوەیە مرۆڤ خۆی بەهەمان شێوە ببینێت کە خوڵقێنراوە. مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ ئەو شتانەی کە بناغەی وجوودی ئەون، لەو شتە بگۆڕو زیادییانەی کە بۆ تەعدیلکردنی خەسڵەتە سەرەتاییەکان هاتوونەتە ئاراوە، جیابکاتەوە. ئەمە بڕیاردانێکی پێویستە چونکە ئێمە تا کاتێك مرۆڤی ئاسایی و سروشتی نەناسین، کارێکی بێهوودەیە ئەگەر بمانەوێ یاساگەلێك کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیك بە سەریدا زاڵن، یان لەگەڵ فیترەتیدا سازگارن، بدۆزینەوەو بەرقەراریان بکەین. ماوەیەکە تیۆرسێنە سیاسییەکان ئیدی قسەلەسەر بارودۆخی سروشتی ناکەن. گریمانە فەلسەفییەکان، کە ئەو چەمکە تایبەتە "فەرزی"یانەیان بە شتگەلێکی راچڵەکێنەر لە

قەڵەم ئەدا، ئیدی ئەو بابەخەی سەدەکانی ١٨ و ١٩ یان نەمابوو. ئەڵبەتە ئەو مەسەلانەی کە ئەوان ئەیانویست چارەسەریان بکەن، وەك خۆیان ماونەتەوە. لەراستیدا ئەم بابەتانەی قۆناغی دەستنیشانکردن، هەم هەمیشەیین و هەمیشە قابیلی قسەوباس لەسەر کردنن.

ئەوانە هەمیشەیین چونکە زۆربەی کات تێگەیشتن لەوەی کە چ هۆکارگەلێك زیاتر لەوانی دیکە لەسەرهەڵدانی بێ سیستەمی سیاسیدا دەوریان هەبوە، کارێکی ئاسان نییە. رووداوە سیاسییەکان هێندە گرژو ئاڵۆزن و هەروەها بە هۆی هۆکارگەلێکی زۆرەوە هاتوونەتە ئاراوە کەبە ئاسانی و بە دڵنیاییەوە ناتوانین هۆکارەکانی مەسەلە باسکراوەکان دەستنیشان بکەین. کاتێ کەلێکۆڵینەوە لەسەر ئەو بێنەزمییەی دەکرێ کە لەڕووی مێژووییەوە هیچ نموونەیەکی هاوچەشنی بەرچاو ناکەوێت، یان کاتێ کە هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر بەشدارییان هەیە، یان هەردوو ئەم کێشانە لە ئارادان، توێژەرەوە ناچارە پەنا بەرێتەبەر حەدس و گومان. ئەو، "گرووپ گەلی کۆنترۆڵی" نییە واتە ئەو گرووپانەی کە لە رێگەیانەوە ئەو کێشانە کەم یان زیاد بکات ـ تاکوو بتوانێت بە هۆی ئەوانەوە، گرنگیی هۆکارەبەشدارەکان دەستنیشان بکات.

بۆ نموونە دووبارە باس لەو بابەتە ئەکەین کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد، واتە خەسڵەتی شەڕاشۆیی لە مرۆڤدا، ئەم

بابەتە هەنووکەش زیندووە و دەکرێ قسەی لەسەر بکەین چونکە ناتوانین کۆمەڵگایەکی بێ مرۆڤ تەسەوربکەین [واتە کۆمەڵگا و مرۆڤ دووشتی پێکەوە بەستراون]. کەواتە کاتێ کە مرۆڤ لەکەش و هەوایەکی تایبەتدا توورە ئەبێت و دەس بە شەڕاشۆیی دەکا، دەتوانین قسە لەسەر ئەوە بکەین کەئایا ئەو ڕەفتارەی مرۆڤ، بە تەواوەتی دەرەنجامی هۆکارە جوگرافیی و ئیقلیمییەکانە، یان هۆکارە دەروونییەکان. دیارە شتێکی سەرسووڕهێنەر نییە ئەگەر بزانین یەکێك لە پسپۆڕانی "ڕەفتاری ئاژەڵان" ئاوادەڵێ:

شەڕاشۆیی دەروونی مرۆڤیش وەك هەموو ئاژەڵەکانی‌تر بەشێکە لە مەیلە فیترییەکانی.... بۆ خەڵکانی نائاشنا بەزانستی ئارکیۆلۆژی، قبوولّ کردنی ئەوەی کە مرۆڤ هێشتا خەسڵەتگەلێکی هەیە کەلەئاژەڵەکانی تریشدا هەن، ئاسان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، مرۆڤناسێکی هاوچەرخ لە گۆشەنیگایەکی ترەوە دەڵێ: مرۆڤ هەموو خەسڵەتە فیترییەکانی خۆی لە دەست داوە. ئەگەر تۆسقاڵێك لەو خەسڵەتانەشی تیامابێت، دەبێ بەپەرچەکردارێی ئۆتۆماتیکی مرۆڤی لە قەڵەم بدەین لە بەرانبەر هەراوجەنجاڵەکانی سەردەمی هاوچەرخدا، یان لە بەرانبەر سڕینەوەی کتوپڕی پشتیوانەکانی. لە هەلومەرجەکانی‌تردا مرۆڤ هیچ غەریزەیەکی نییە.

ئەم بابەتانەی قۆناغی دەستنیشان کردنی هۆکارەکان، زۆربەی کات هەندێ باس و لێکۆڵینەوەی زیندوو و تەنانەت

ناخۆشیشیان لێکەوتۆتەوە، چونکە ناتوانین هیچ وەڵامێکی لێبڕاوانە بە زۆربەی ئەو پرسیارانە بدەینەوە. ڕەنگە ناتەبایی و دەمەتەقێ هەندێجار ڕوولەزیادبوون بکات، چونکە دەستنیشانکردنە جۆراوجۆرەکان ـ کە پێشتر باسمان کردن ـ پێوەندییان بە بڕیارە سیاسییەکانەوە ئەبێت، بەرێگاگەلێکی زۆردا ئەچن و لقوپۆگەلێکی زۆریان لێدەبێتەوە.

## بابەتی دەستنیشانکردن لەدایلۆگی سیاسی هاوچەرخدا

شتێکی سەرسوورهێنەر نییە کاتێ ئەبینین قسەو باسە جەنجاڵئامێزەکانی سەردەمی هاوچەرخ سەبارەتن بە هەندێ دەستنیشان کردنی ناهاوچەشنی هۆکارەکانی کێشەگەلی دیاریکراوو ناسراوی سیاسی. بۆچی ساڵی ١٩٦٤ لە شاری "واتز" داو، ساڵی ١٩٦٧ لە شاری "دیترۆیت"دا، هەندێ مانگرتن ڕوویان دا؟ گرووپێکی تایبەت لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە ڕاڤەی ئەو مەسەلەی کردو بەودەرەنجامە گەیشت کە هۆی ئەورووداوانە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزپەرەستییەکی ڕێکخراو و سیستماتیك لە ئەمریکادا. هەروەها ئەو گرووپە بەو دەرنجامە گەیشت کە مانگرتنەکانی شاری واتز، نموونەی تووڕەبوونێکی یەگجار گەورە بوو. تووڕەبوونێك کە بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی ڕەشپێستەکاندا زاڵە. ئەوان بە تەواوەتی وەڕەزن لەدەست ستەم و چەوسانەوەی ئەو سپی پێستانەی کە ژیانیانی پڕکردون

و لە نەهامەتی و چەرمەسەری. کەواتە باشترین رێگە بۆ نەهێشتن هەر جۆرە مانگرتنێك، رازاندنەوەو جوانکردنی گەڕەکە هەژار نشینەکانە و دەرەنجامە قێزەونە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و رۆحییەکانیان، ئەبێ بۆ هەمیشە لە ناو ببرێن. کۆمەڵناسان دژایەتی ئەم دەستنیشان کردنی هۆکارانەیان ئەکرد. بەوتەی "ئیدوارد بانفیلد" بێنەزمی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی و، رەگەزپەرەستی بەتایبەتی، هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم مانگرتنانە نین. راستییەکان ئەوە دەرئەخەن کە " هۆی مانگرتن رەش پێستەکان و هەروەها مانگرتن و نارەزاییەکانی تریش رەگەزو (هەروەها هەژاری) نییە. رەنگە زیدەرەویمان نەکردبێت گەر ئەوە بڵێین ئەو مانگرتنانە حەتمەن روویان دەدا، تەنانەت ئەگەر خەڵکی ئەم ناوچانە هەمووشیان سپی پێست بن و داهاتێکی لەسەرووی "هێڵی هەژاری" شیان هەبایە. بەڕای ئیداوارد بانفیلد، مانگرتن شتێکە وەك کایە و سەرگەرمی و هەروەها بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان و سەرچاوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ "حەزکردن بەقەرەباڵغی" کە لەسەردەم و وڵاتانی تریشدا شتی لەو جۆرە زۆر ڕووی داوە. بەڕای ئەو، بۆ بڕیاردان سەبارەت بە ئایندە "ئەحمەقانەیە ئەگەر تەسەور بکریت هەوڵدان بۆ لەناوبردنی رەگەزپەرەستی، هەژاری، بێکاری و سڕینەوەی گەرەکە هەژارنشینەکان، کاریگەرییەکی زۆر لەسەر مانگرتنەکانی ١٠ یان ٢٠ ساڵی ئایندەدا دائەنێ.

ئـەم دەستنیشـان کردنـە ناهاوچەشـنانەش هۆکارەکـانی مەسەلە گرنگە کۆمەڵایەتییەکان روون ئەکەنەوە و لەو رووەوە کە لە هـەموو رەهەنـدەکانی مەسـەلەکەیان کۆڵیوەتـەوە، قسـەوباس گـەلێکی زۆریـان لـیّبوەتـەوە. دەستنیشـانکردنە جـەنجاڵ ئامێزەکـانی تـریش هـەوڵیان داوە هوکارەکـانی کێشـە سیاسـییە هاوچـەرخەکان بخەنـەڕوو. هەنـدێ لـە مێژوونووسـانی "پیاچوونەوەخواز"، سەبارەت بەشـەڕی سارد، باسێکی گـەرم و گوڕیـان وروژانـدووە بـەبیروڕای ئـەوان، ئـەوە ئیمپریـالیزمی خۆرئاوایـە کـە شـەڕی سـاردی هەڵگیرسـاند، نـەك هێرشـی کۆمۆنیزم. باسێکی گـەرم و گوڕی دیکە سـەبارەت بـە سیسـتمی فێرکاریە لەئەمریکادا. مەسەلەکە ئەوەیە کەئایا شکستخواردنی سیستمی راهێنانی ئەمریکا، پێوەندی بە تێکچوونی خودی ئەو سیسـتمەوە هەیـە، یـان بـەو مەسـەلە ئـارکیۆلۆژی (ژنێتیکـی) و ئیقلیمییانـەی (کۆمەڵایـەتی) کـە قۆتابخانـەکانی ئـەمریکا نـاتوانن گۆڕانیان تیا دروست بکەن.

بـەم پێیـە، بـەو دەرەنجامـە دەگـەین کـە ئـەمڕۆ دەستنیشـان کردنـی هۆکـارگـەلی نەخۆشـییە کۆمەڵایەتییـەکان، لـە نـاو هـەموو لقـەکانی زانسـتی کۆمەڵایەتیـدا ئـەنجام ئـەدرێت. تیۆرسـێنی هاوچـەرخ کـە ئەیـەوێت پسـپۆڕی زانسـتی سیاسـیش بێـت ـکەئەرستۆ بە سەرپەلی زانستەکان ناودێری دەکا ـ دەبێ ئـەم لێکۆڵینەوانـە ـ کـە زۆربەشـیان هـیچ رێگەچـارەیەك بەدەسـتەوە

نـادەن ــ لەبەرچـاوبگرێت و سـەبارەت بـە دروسـتی نادروسـتی هەرکامیان ڕای خۆی دەربڕێت. لە رابوردوودا، پێش لەسەردەمی "تەقینـەوەی زانسـتی" و بـە پسـپۆڕی بـوونی لقەزانسـتیەکان، زۆربەی تیۆرسێنەکان ناچاربوون خۆیـان هۆکاری بـێنەزمییـەکان دەستنیشان بکەن. ئەوان تەنها بە پشت بەستن بەبیرۆکـەکانیان و هـەروەها بـە پێـی هەنـدێ زانیـاری یـەکجار ئـەم قۆناغـەیان ئـەبڕی وزۆربەی کـاتیش بـە دەرەنجـامگـەلێکی بـاش و بەکـەڵك ئەگەیشتن کە تا هەنووکەش بایەخی خۆیان لەدەست نەداوە.

بەهەرحاڵ قۆناغی دەس‌نیشان‌کردنی هۆکارەکان، یـەکێك لـە لایەنــە یـــەکجار گرنگـــەکانی تیـــۆرە سیاســـییە کامـــڵ و هەمەلایەنەکانـە. خوێنـەرێك کەبەرهەمـەکانی ئـەفلاتوون، ڕۆسـۆ، مـارکۆزە و هـۆبس، یـان هزرمەنـدانی وەك ئـەوان دەخوێنێتـەوە، نـابێ لـەم بەشـەی لێکۆڵینەوەکـە غافڵ بێـت، چـونکە ڕاڤـەکردن و شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەی کە تیۆرسێن لە درێژەی ڕاڤەکردنی بێسیستەمی سیاسیدا دەیانخاتـەڕوو، بە شـێوەیەکی لێبڕاوانـە، دەرەنجامـەکانی سیسـتماتیك دەکـا. دەبـێ سـەرەتا هۆکارەکـان دەس‌نیشان بکرێن و پاشان بیرلە چارەسەرکردنیان بکرێتەوە.

## وتاری چوارەم

# نەزمو خەیاڵ: بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا

بینینی بۆنەزمی جگەلە کێشەی دەستنیشانکردنیهۆکارەکان، مەسەلەیەکی دیکەش دەخاتەڕوو. ئەم مەسەلەیەش نەزمی لەباری سیاسییە. ئەگەر کەسێك ئەو بارودۆخە سیاسییەی کە تیایدا ئەژی بە شێوەیەکی نادروست دەرك بکات، ئەوە دەگەینێ کە دەتوانرێ سیستەمی لەبارو رێکوپێك بهێنرێتە ئاراوە. کەواتە تیۆرسێن ئەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە ئەگەر بارودۆخەکە خراپە، ئەی بارودۆخی دروستو لەبارکامەیە؟ ئەگەر ئەمە نەخۆشییە، ئەی سەلامەتی و تەندروستی کامەیە؟ ئەگەر ئەمە گێژی و شپرزەییە، ئەی حاڵەتە دروستەکەی کامەیە؟ بە کورتی تیۆرسێن دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارە ــ زۆربەی کات سەرەکییەی ــ فەلسەفەی سیاسی بداتەوە کە: "کۆمەڵگای بەختەوەر کامەیە؟". ئەو، دەبێ هەوڵ بدات تا چییەتی نەزمی سیاسی پیشان بدات.

## هەڵوەشانەوەو بنیاتنانەوە

تیۆرسێن بەمەبەستی پیشاندانی کۆمەڵگای سیستماتیکی سیاسی، دەبێ خاڵی بەرانبەری ئەو دیاردەیەش، واتە نەزم، ببینێ و دەرکی پێبکات. بۆنموونە ئەگەر ئەو، کێشەی کۆمەڵگاکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ "نامۆبوون"، ئەبێ وێنایەك لە کۆمەڵگایەکی "نامۆنەبوو" پیشان بدات. ئەگەر ئەو، کۆمەڵگاکەی خۆی پڕ لە "پشێوی" دەبینێ، واتە هەلومەرجێك کە کۆمەڵگا تووشی دووبەرەکی و تەفرەقە بوە، دەبێ ئەوە پیشان بدات کە کۆمەڵگای لەبارو سیستماتیکیەوە چۆن کۆمەڵگایەکە. هەروەها ئەگەر چاوی بە ناعەقلانییەت و شێتی و سەرکوت کردن دەکەوێ، دەبێ بە تەواوەتی ئەوە پیشان بدات کە عەقلانییەت و نەبوونی سەرکوتکاری، چ مانایەکیان هەیە. هەڵبەتە ئەوەش راستە کە بوترێت ئەو وێنایەی کە تیۆرسێن لەنەزمی سیاسی بەدەستەوەی ئەدات، تێگەیشتنی شەخسی خۆیەتی. بەڵام ئەگەر ئەوە قبووڵ بکەین کە ئەو وێنایەی کە خستوویەتی ڕوو، تەنها بۆ هەڵسەنگاندن ئەبێت و هیچیتر، لەو حاڵەتەدا قسەکانی ئەو، هەم ئەسانترن و هەمیش باشتر دەرکیان پێئەکرێت. تیۆرسێن سەرەتا دەرکی بەنەبوون یا ناتەواو بوونی نەزم کردووە و پاشان توانیویەتی کۆمەڵگای سیستماتیك و مونەزەم وێنا بکات.

تیۆرەسیاسییەکان هەروا بەئاسانی نەنووسراون. ئەوانە وێناگەلێکی سیستمە سیاسییەکانن کە بەزەحمەت و تەقەلایەکی زۆرو و هەروەها بە بەراورد لەگەڵ بارودۆخە سیاسییە نالەبارەکاندا هاتوونەتە ئاراوە. پشێوی و ناهاوسەنگی کۆمەڵگا نەک تەنها بوار بۆ بیرکردنەوەی تیۆرسێن دەڕەخسێنێ بەڵکوو، سەرەداوێکیش بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەکان دەخاتەبەردەستی و ئەم قۆناغەی "لۆژیکی دەروونی" لە تیۆرە سیاسییەکاندا، بە هۆی قسەیەکی سان سیمۆنەوە، تیۆرسێنی سەدەی نۆزدەی فەرەنسە، بە باشترین شێوە روون ئەکرێتەوە: "پێشکەوتنی رۆشنگەری، تاڕادەیەك پشێوی سیستمی کۆمەڵایەتی کۆن و زەرووڕەتی ڕێکخستنی سەرلەنۆی پیشان ئەدات."

بەواتایەکی تر هەموو گوشار، قەیران، شڵەژاوێتی و پشێویەکانی سیستمی کۆن، تیۆرسێن ناچاردەکەن بیر لە بنیاتنانەوەی سیستمێکی تازەی سیاسی بکاتەوە. ئەڵبەتە تیۆرسێن مەجبوورنییە کۆمەڵگایەکی نوێ دابمەزرێنێت، چونکە ئەوە ئەرکی خێرخوازان و ئەو کەسانەیە کە بەکردەوە دەتوانن ئەوکارە بکەن. بەلام ئەو دەبێ چوارچێوەیەك لە "کۆمەڵگای باش" لە زەینیدا وێنا بکات و ڕێساکانیشی دەستنیشان بکات بەم پێیە تیۆرسێنەکان "وێنا گەلێکی رەمزی لە کۆمەڵگای سەرلە نۆی بنیاتنراو بەدەستەوە ئەدەن".

لەو روەوە کە بنیاتنانەوەکەی تیۆرسێن وێنایەکە لەو کۆمەڵگایەی کە ئەبێ دابمەزرێت، کەواتە دەبێ تاڕادەیەکی زۆر پشت بەزەین و فکری خۆی ببەستێت. ئەو، دنیا بەو شێوەیە وەسف ناکات کە هەیە بەڵکوو لە وەسف کردنی جیهانەوە بەدڵی خۆی دەس‌پێ‌دەکا، بەڵام دەبێ جیهانیش هەر بەو شێوە پێناس بکات کە دەبێ ببێت. هەروەها بە وردبینییەکی زۆرەوە پشێویگەل و قەیرانەکانی سیستمی سیاسی ڕاڤە ئەکات و پاشان گەلاڵەیەك دەخاتەڕوو کە تیایدا هەموو ئەم پشێوییانە چارەسەر کراون. تیۆرسێن دەتوانێ قسەی پاڵەوانی یەکێك لە شانۆکانی جۆرج بێرناردشۆ ــ کە وێردی سەر زمانی رۆبێرت کەنەدییە ــ دووپات بکاتەوە کە ئەڵێ: "خەڵکانێکی زۆر، شتەکان هەروەك خۆیان ئەبینن و پرسیار ئەکەن بۆچی؟ من لە زەینمدا ئەو جیهانانە تەسەور دەکەم کە هەرگیز بوونیان نەبوەو ئەپرسم بۆچی نابێ ئەمانە بوونیان هەبێت؟ تیۆرسێن تاڕادەیەکیش خەیاڵاوییەو هەر لەبەر ئەوەش، مێشکی لای ئەو شتانەیە کە دەتوانن بوونیان هەبێت. هەروەك لە وتاری پێشتردا باسمان کرد، تیۆرسێن دەبێ وەڵامی هەردوو پرسیارەکە بداتەوە ئەگەر دەیەوێ رێگەچارەیەکی عەقڵانی بخاتەڕوو، دەبێ تاڕادەیەك وەڵامی "بۆچی"یەکانی هۆکاری کێشەکان بداتەوە.

## کارکردەکانی یۆتۆپیا

تەسەور کردنی ئەو شتەی کە دەتوانیٚ هەبێت، یەکێك لەتوخمەکانی تیۆرە سیاسییەکان کە پێوەندی بە یۆتۆپیاوە هەیە. وشەی یۆتۆپیا ریشەیەکی یۆنانی هەیە و بەمانای "هیچ کویٚ"یە. کۆمەڵگای لەبارو رێکوپێك جگە لەخەیاڵی هزرمەندددا لە هیچ شوێنێکی تر بەرچاو ناکەوێت. ئەم کۆمەڵگایە تەنها وەکوو "ئەگەرێك" بوونی هەیە. رەنگە جیلوەیەکیش لە ئایندە بێت. رەنگە وێنایەك بێت لە بەهەشتی بەرین، بەڵام ئەوەی راستی بێت ئێستا و لەسەر زەویدا وجوودی نییە.

ئەفلاتوون لە کۆتایی کتێبی کۆماردا ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکات. یەکێك لە هاوڕیٚ لاوەکانی سوقرات، کۆمەڵگای کۆماری بە کۆمەڵگایەك لە قەڵەم ئەدات کە تەنیا لەدنیای زەین و وانەو پۆلەکاندا بوونی هەیە. چونکە پێموایە لە هیچ شوێنێکی جیهاندا بوونی نییە. سوقرات بەمجۆرە وەڵامی ئەداتەوە: راستە، بەڵام رەنگە لە بەهەشتدا نموونەیەکی ئەو کۆمەڵگایە هەبێت بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەویٚ چاویان پیٚبکەوێت و لە زەینیاندا وێنای بکەن.

ئەڵبەتە ئەوە کە تیۆرسێن لە قۆناغی بنیاتنانەوەی لێکۆڵینەوەکانیدا دەبیٚ کەڵك لە زەینی خۆی وەربگرێت، بەو مانایە نییە کە تەنیا مرۆڤێکی خەیاڵاوی و خەونگەرایە. ئەو بۆی

نییە کە لە ناو خەیاڵپلاویدا غەرق بێت و بەتەواوەتی بچێتە ناو دنیای خەیالاتەوە. وێناکردنەکەی ئەفلاتوون لە کۆمەڵگای "سەرلەنۆی بنیاتنراو" هەر چەندە خەیاڵییە بەڵام ئەبێ بە تەواوەتی لەگەڵ واقعییەتەکاندا بگونجێت. وێنا کردنەکەی ئەو دەبێ لەگەڵ ئیمکانات گەلی راستەقینەو هەروەها قابلییەتە حەقیقییەکانی ژیانی مرۆڤدا بگونجێت. واتە دەبێ لەسەر بنەمای ژیانی راستەقینەی تاکەکانی کۆمەڵگا بنیات نرابێت، ئەگینا لە خەیاڵ و وێناکردنێکی بێهوودە بەولاوە زیاتر نییە.

بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا لەزەیندا، بەیارمەتی وێنا یۆتۆپیاییەکەی تیۆرسێن، دەیەوێ بەهەندێ حەقیقەت سەبارەت بە دنیا و سیاسەت و مرۆڤ بگات. ئەڵبەتە یۆتۆپیا ناتوانێت نوێنەری حەقیقەتی ئەزمونگەرا ــ بەمانا سادەکەی ــ بێت. هەروەك چۆن تێگەیشتنیکی وەستاو و جیا لەو کاتوشوێنەی خۆی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی یۆتۆپیا ئەوەیە کە حەقیقەتی گشتێتی (کلێت) یان دەستکەوتەکانی سیاسەت بنوێنێت. ئامانجی یۆتۆپیا ئەوە نییە کە هەموو رووداوەکان پیشان بدات، بەڵکوو توانا "بالقوە"کانی مرۆڤ وەسف دەکا. هەروەها تواناییەکان و ئیمکاناتە سیاسییەکان بەیان دەکا، نەك واقیعیەتەکان. چەمکی یۆتۆپیا بەوتەی پۆل تیلیش، تواناگەلێك

ئەخاتەڕوو کە ئەگەر لە لایەن یۆتۆپیاوە پێشبینی نەبوونایە، لەکیس ئەچوون. یۆتۆپیا دەستکەوتەکانی مرۆڤ پێشبینی ئەکات و ئەوەش سەلمێنداروە کە زۆربەی پێشبینییەکانی یۆتۆپیا هاتوونەتە دی.

لە راستیدا بە بێ پێشبینییەکانی یۆتۆپیا، ژیانی مرۆڤ ڕائەوەستێت. ئەگەر پێشبینییەکانی یۆتۆپیا تواناکان پیشانی مرۆڤ نەدەن، ژیانی مرۆڤ ڕائەوەستێت و هیچ سودێکی نابێت و لەو حاڵەتەدا مرۆڤ خۆی لە بارودۆخێکدا دەبینێ کە نەتەنها تاك تیایدا گەشە ناکات بەڵکوو ئیمکاناتە مرۆییەکانیش لەڕووی فەرهەنگی‌یەوە نایەنەدی. بۆ کەسێك کە هیچ یۆتۆپیایەکی لەزەیندانییە، ئەو سەردەمەی کەتیایدا دەژی، سەردەمێکی کوشندەیە. بەمجۆرەش فەرهەنگێك کە هیچ یۆتۆپیایەکی تیانییە، لەو سەردەمەی خۆیدا قەتیس دەبێت و بەزووترین کات روو لە رابوردوو ئەکا و رابوردووی بەلاوە گرنگتر دەبێ. سەردەمی ئێستا (حال) تەنها لە کاتێکدا چالاك دەبێ کە کێشمەکێشێك لە نێوان رابوردوو و ئایندەدا لە ئارادابێت.

لەگەڵ ئەوەشدا وێناکردنەکەی تیۆرسێن لە ئیمکاناتە سیاسییەکان، حەقیقەتگەلێکی "سەردەمی ئێستا"ش بەیان دەکا. مرۆڤ تەنها بە بەراوردکردنی ئەو بارودۆخەی کە لە

ئازادایــە، لەگــەڵ قابلییــەت و ئیمکاناتــەکانی دیکــەدا، دەتــوانێ دەرك بە کـەموکوڕی و تێكشکانەکانی بکات. مرۆڤ تـەنها کاتێك دەتـوانێ مانـای تووڕەبوون و بەدگومانی دەرك بکات، کە لەگـەڵ مرۆڤێکـی ئاقڵـدا ئاشــنا بێــت. مــرۆڤ تــەنها کاتێــك لــە مانــای تاوانبــاری تــێدەگــا کــە رووبــەڕووی لوتــف و بەخششــەکانی خواببێتـەوە. تیۆرسـێن بـە هـۆی دەستنیشـانکردنیتواناییەکانی مرۆڤەوە دەتوانێ هەندێ خاڵی گرنگ سەبارەت بە چییەتی ئەو بارودۆخەی کە لەئازادایە، بخاتەڕوو.

تیۆرســـێن تەنانـــەت لـــە نـــاو خـــەون و پێشـــبینییە یۆتۆپیاییەکانیشـیدا، لەگـەڵ واقعییەتـدا سـەروکاری هەیـە. ئـەو تاڕادەیــەك تــەنها دەیــەوێ واقعییــەتگــەلێك بخاتــەڕوو کــە لــە ڕێگەیانــەوە پاســاو بــۆ تێگەیشــتنەکانی خــۆی لــە بــێنــەزمی بهێنێتەوە. بینینی بێنەزمی لەرووی لۆژیکییەوە، ئەوە دەگـەینێ کە بارودۆخێکی لەبارو عەقڵانی لە ئازادایەو ئەرکی تیۆرسێنیش ئەوەیـە کـە وێنایـەك لـەو بارودۆخـە لـەبارە بـە دەسـتەوە بـدات. کەواتـە تیۆرسێن پـاش لێکۆڵینـەوەو بـەوردی راڤـەکردنی کـەم و کوڕییـەکانی ئـەو بارودۆخـەی کـەلـەئازادایـەو زەیـنی ئـەویان بـۆ یەکەم لێکۆڵینەوە هان داوە، وێنەی کۆمەڵگای سەرلەنوێ بنیات نراو، دەکێشێت.

## دینامیزمی بنیاتنانەوە

چالاکبوونی ئەم قۆناغە گرنگە خەیاڵییە، بە هۆی ئەو جیاوازییەی کە مایکل پۆلانی، لە نێوان ئاگایی راستەوخۆ و ئاگایی ناڕاستەوخۆدا بەبوونی قایلە، باشتردەرکی پیٚدەکرێت. پۆلانی ئەوە پیشان ئەدات کە مرۆڤ هەرگیز بە ئاشکراو بە تەواوەتی لەسەر هیچ شتێك ئاگایی پەیاناکات. بۆ تێگەیشتن لەو بەشەی مەسەلەکان کە دەبیٚ راشکاوانەتر و ئاشکراتر سەرنجی بدەینیٚ، زەینی وریاو زانا پشت بەو زانیارییە شاراوانە (مضمر)وە دەبەستیٚ کە لەمەڕ بەشە وردەکانی تر لە ئارادایە. تەنها بە پشتبەستن بەزەمینە و چوارچێوەی ئەو مەسەلەی کەمەبەستمانە، دەتوانین لە ماناکەی تیٚبگەین. بۆ نموونە مرۆڤ بۆ دەرککردنی مانای رستەیەك سەرنج ئەداتە وشەکان و بۆ دەرك کردنی وشەکانیش ئاوڕ لە پیتەکان ئەداتەوە. مرۆڤ بۆ ناسینی روخسارو دەم و چاوی کەسێك، لە هەموو گۆشەنیگایەکەوە سەیری دەم و چاوی دەکا بە بیٚئەوەی کە لەسەر هەموو ئەندامانی دەم و چاویشی زانیاری هەبێت. وێناکردنی ناڕاستەوخۆ و ناخودئاگای لایەنە لاوەکییەکانی هەموو مەسەلەیەك زەروورەتێکی حاشا هەڵنەگرە. تەنانەت کاتێکیش کە مرۆڤ مەبەستی ئەوە نەبێت کەلە هەموو لایەنە لاوەکییەکانیش

تــێبگــات، دیســانەوە دەبــێ ئــاوڕ لــە بەشــەوردەکان و لایەنــە لاوەکییەکانیش بداتەوە.

لــە راســتیدا ئەگــەر مــرۆڤ تــەنها ســەرنج بداتــە لایەنــە لاوەکییــەکان ئەوا، بە هیچ شێوەیەك مەبەستەکە ناپێکێت و بە ئامانجی ناگات. بۆ نموونە ئەگەر تەنها سەرنج بدرێتە پیتەکان، مانای وشە دەرك ناکرێت و ئەگەر تەنها ئاوڕ لە مانای وشەکان بدرێتــەوە، واتــای رســتەکە وەرناگیرێــت. لەگــەڵ ئەوەشــدا مــرۆڤ هەموو کاتێك دەتوانێ سەرنجی خۆی لە شتێکەوە بگوێزێتەوە بۆ شتێکی تر. هەروەها دەتوانێ بەئاشکرا ئاوڕ لە شتێك بداتەوە کە ســەرنجی ڕادەکێشــێ. زۆربــەی کــات ئــەو جــۆرە حاڵەتانــە، هــەم پێویســتن و هــەمیش بەکــەڵکن. لــە حاڵــەتی ئاساییدا یــاریزانێکی تێــنس، ئاگــای لــە دەســکی ڕێکتەکــەی نییــە. ئەگــەر وابێــت لــەو حاڵەتەدا ئاگای لە تۆپەکە نابێ. بەڵام ئەگەر هەندێ جار لەکاتی یاری کردنــدا کێشــەیەك بێتــە ئاراوە، دەبــێ ســەرنج بداتــە جــۆری بەدەستەوەگرتنی ڕێکتەکە.

بنیاتنانــەوەی خەیاڵییانــەی کۆمەڵــگا لــە لایــەن تیۆرســێنی سیاســییەوە دەتــوانرێ بــە گۆڕانکارییــەکی سیســتماتیکی لــەو جــۆرە (لەگشــتەوە بــۆبــەش) لــە قەڵــەم بــدرێت. تیۆرســێن ئــەوە ئەزانێت کە بۆ تێگەیشتنی هەندێ لە بێ نەزمییــەکانی سیســتمی سیاســی، دەبــێ پشــت بــەجۆرە نەزمێکــەوە ببەســتێت و ڕەنگــە بــە تەواوەتیش ئاگای لەو جۆرە نەزمــە نــەبێت. لــە ڕاستیدا لەوانەیە

ئـەو وێنایـەی کـە لەسـەر نـەزم ئەیخاتـەڕوو، ڕۆڵێکـی گـرنگ و ناڕاستەوخۆی لە تیۆڕوانینی ئەو سەبارەت بە بارودۆخی سیاسی بینیبێت. بەڵام سەرەنجام ناچارە دان بە گرنگیی ئەو ڕۆڵەشدا بنێت، کە تا چەند کاریگەرێتی لەسەر تیۆڕوانینە ڕەخنەییانەکەی هەبوە. ئەو بۆ کامڵکردنی تیۆرەکەی خۆی، دەبێ سەرنجێکی زۆربدات لەو جۆرە نەزمە مرۆڤییەی کە بناغەی تیۆڕوانینەکانی ئەویان پێکهێناوەو لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی بەزانستی کردنی بدات.

بۆ ئەم مەبەستەش تیۆرسێن ناچارە پێوەندییەکی ڕەسەن و "کارکردگەرا" دابمەزرێنێت لە نێوان ئەو بوارە ناڕاستەوخۆو ئەو ئامانجە ئاشکرایەدا کە پێکهێنەری زانیارییە سەرەتاییەکانی ئەون سەبارەت بە بێ نەزمی سیاسی. هەروەها لە جیاتی ئەوەی کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پشت بە وێنای سیستمی لەباری سیاسییەوە ببەستێت تاکوو لە ڕێگایەوە دەرك بە نالەبارێتی بارودۆخێکی تایبەت بکات، بە پێچەوانەوە تێگەیشتنی خۆی لە بێنەزمی، ئەکاتە بەردی بناغەی تێگەیشتن لە سیستمی لەباری سیاسی. ئەو لەم قۆناغەدا لەجیاتی پشتبەستن بە تێگەیشتنی ناڕاستەوخۆی چەمکی "سلامەتی" بە مەبەستی ناسینی چەمکی "نەخۆشی"، بە پێچەوانەوە بە پشت بەستن بە نەخۆشییەوە، هەوڵئەدات لە مانای سلامەتی تێبگات. هەرچەند ئەم دوو قۆناغە تەواوکەری یەکدین بەڵام بوار و پێگەکەیان جێگۆڕکێیان پێ دەکرێ.

## نۆرمەکان: مۆدێلەکانی نەزم

ڕێساگەلێك کە تیۆرسێن لەبەرچاویان دەگرێ بۆ ئەو کۆمەڵگایەی کە لە زەینیدا بنیاتی ناوەتەوە، لە ڕاستیدا نۆرمگەلێکیشن بۆ ژیانی سیاسی. هەر لەبەرئەوەیە کە فەلسەفەی سیاسی بە "تیۆریگەلی نۆرماتیڤ"یش ناودێر ئەکرێت. نۆرم: چەمك یان فۆرمێکە کە وەك پێوەر و ڕێسا بەکار ئەهێنرێت. وشەی norm لە وشەی لاتینی normaوە هاتووە کە لە بنەڕەتدا بەمانای "گۆنیا"ی دارتاشییە [گۆنیا وشەیەکی سوریانییە ـ و ـ]. گۆنیای دارتاشی، کەرەسەیەکە کە دارتاشەکان وەك پێوەرێك کەڵکی لێوەردەگرن و لە ڕێگەیەوە دەتوانن کارەکانیان بەدروستی و "دەقیق" ئەنجام بدەن. ڕێسای نۆرماتیڤی تیۆرسێنی سیاسیش بە تەواوەتی هەمان کەڵکی لێئەبینرێت. مۆدێلی تیۆرسێن وەك ڕێسایەك بۆ دەستنیشانکردنی مەشرووعییەتی سیستمی سیاسی بەکار ئەهێنرێت. تیۆرسێن تێڕوانینی خۆی لەسەر "کۆمەڵگای باش" ئەکاتە ڕێسایەك بۆ هەڵسەنگاندنی پێکهاتەی کۆمەڵگا.

چەمکە نۆرماتیڤەکان بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر بەیان دەکرێن. ڕەنگە "باش" و "دروست" گشتترین و لە هەمان کاتیشدا تەمومژاویترین وشە نۆرماتیڤەکان بن. وشە نۆرماتیڤەکانی دیکەش وەك "دادپەروەری"، "زانایی" و

"سلامەتی" چەمکگەلێکن کە نەك بە تەواوەتی بەڵکوو تا رادەیەك روون و ئاشکران. ئەو وشە و رستانەش کە رواڵەتێکی زانستیانەیان هەیە، وەك عیبارەتی "یەکپارچەبوونێکی کارکردخواز" یان وشەی "بەئەزموون" دەتوانن دەوری وشە و رستەگەلێکی نۆرماتیڤ ببینن. بە کورتی، چەمکی نۆرماتیڤ چەمکێکە راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ وێنایەك لە بارودۆخی لەبار و هەروەها گشتێکە کە خالی بەرانبەری کەم و کوڕی و بێ‌ئەزمییە. دەبێ ئەم خاڵە گرنگەش لەبەرچاو بگرین کە نۆرمەکان بە تەنها هەڵقولاوی سەلیقەو ویستی تایبەتیی تاکەکان نین. کاتێ کە ئەوترێت سیستمێکی سیاسی "دادپەروەرانە"یە، ئەوە ناگەینێت کە بێژەری ئەو قسەیە، ئەم سیستەمە بە باشتر و لەسەرووی هەموو سیستمەکانی ترەوە دادەنێ. وەك چۆن کاتێك کە کەسێك دەڵێ: فلانەکەس مرۆڤێکی ئاقڵە، ئەوە ناگەینێ کە فەزلی بەسەر کەسێکی شێتەوە هەبێت. ئەگەر تیۆرەسیاسییەکان تەنها دەربڕی "ویستی تاکەکەسی" بوونایە، کۆمەڵگا یۆتۆپیاییەکەی تیۆرسێنی سیاسی، کۆمەڵگایەك ئەبوو کە تیایدا هەموو شتێك بە حەزو ویستی ئەو دەبوو. بەدەگمەن دەتوانین کۆمەڵگایەکی لەو جۆرە، بە کۆمەڵگایەکی یۆتۆپیایی و دادپەروەرانە لە قەڵەم بدەین.

## دۆزینەوەو داهێنان لەبنیاتنانەوەدا

نەزمی سیاسی نۆرماتیڤی سەرلەنۆی بنیاتنراو، پێکهاتەیەکە لە داهێنان و دۆزینەوەکان. لەلایەکەوە داهێنانە چونکە پێویستی بە هەوڵ و تەقەلای داهێنەرانەی تیۆرسێن هەیە و لەگەڵ ئەوەشدا. ئەو نەزمە سیاسییە نۆرماتیڤەی کە دەیخاتەڕوو، بە تەنها بینینەکانی ئەو، یان دیاردەگەلێکی مێژوویی نین. تیۆرسێن بۆ وێناکردنی نەزمێکی سیاسی، کە توانای جێبەجێکردنی قابلییەتە سیاسییەکانی مرۆڤی هەیە، دەبێ لەزەینیدا جۆرە "ئەزموونێکی فکری" ئەنجام بدات.

کەواتە تیۆرسێن تا ڕادەیەکیش هونەرمەندە. مۆدێلە نۆرماتیڤەکەی ئەو، لە کۆمەڵگای باش، جۆرە درامایەکە بۆ نواندنی ژیانی مرۆڤ کە تیایدا دیمەن و سێکانس و دەورەکان دیاری کراون. ئەم لایەنەی تیۆرە سیاسییەکان، بناغەی ناکۆکییەکانی نێوان ئەفلاتوون و شاعیرانی هاوچەرخی بوو. ئەفلاتوون دەیزانی کە ئەوان وەك رەقیبی وان، هەر بۆیەش لە کتێبی کۆماردا، ڕێسا و چوارچێوەگەلێکی یەکجار وردی بۆ بەرهەمگەلی پەسەندکراوی هونەری، دیاری کردووە. لە کتێبەکەی تریشیدا "یاساکان" لە زمانی یاسادانەرەوە، سەبارەت بەو شاعیرانەی کە دەیانەوێ ئەندامێتی کۆمەڵگا بەدەست بهێنن دەڵێ:

ئێمه پێیان دەڵێین ئەی "باشترین بیانی"یەکان! ئێمەش بە پێی توانای خۆمان شاعیرین و تراژیدیاکەی ئێمە باشترین و شکۆدارترین تراژیدیایە. لە ڕاستیدا کۆمەڵگاکەمان باشترین نموونەی لاسایی کردنەوەیەو هەروەها باشترین ژیانێکە کە شیعری تراژیدی وێنا ئەکات. ئێوە شاعیرن و ئێمەش شاعیرین. هەر دووکمان لەیەك قوماشین. بەڵام ڕەقیبی یەکدین و لە شیعری تراژیدیشدا دوژمنی یەکترین. تەنها یاسا حەقیقییەکان دەتوانن ئێمە کامڵ بکەن.

بنیاتنانەوەی نۆرماتیڤی تیۆری سیاسی، لە هەمان کاتدا بە جۆرە دۆزینەوەیەکیش لەقەڵەم ئەدرێت. کۆمەڵگای سەرلەنوێ بنیاتنراو، داهێنانێکی دەستی تیۆرسێن نییە بەڵکوو بە هۆی ئەوەوە دۆزراوەتەوە (کەشف کراوە). لە ڕاستیدا شێوازێك کە تیۆرسێن لە ڕێگەیەوە دەرك بە چییەتی کۆمەڵگای باش دەکا، وێکچوونێکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو شێوازەی کە بیرمەندان بۆ دۆزینەوەی تیۆرێکی تازە بەکاری دێنن. تیۆرسێنی سیاسی، واقعییەتەکانی دنیای سیاسەت وەك سەرەداوێك بەکاردێنێ و لە ڕێگەیانەوە، بە مەبەستی مانابەخشین بەم حەقیقەتانە، هەندێ گەلاڵەی گشتیتر دەخاتەڕوو. وەك چۆن بیرمەندان ڕەنگە بەپێی ئیلهامە تاکەکەسییەکانەوە تیۆرەتازەکان بخەڕوو، ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە کە تیۆرسێنیش بە شێوەیەکی "شهودی" دەرك بەمەسەلەکان بکات. بۆ نموونە ئەفلاتوون لە ڕێگەی

تەمسیلی "ئەشکەوت"ەوە، دەرککردنی رادیکالانەی سیستمی لەبار و رێکوپێك روون دەکاتەوەو دەڵێ: کەسێك کە حەقیقەتی سیستمی رێکوپێك دەرك بکات، وەك کەسێك وایە کە هەموو تەمەنی لە ناو ئەشکەوتێکدا ژیابێت و کاتێ لە ئەشکەوتەکەوە دێتە دەرەوەو بۆ یەکەمجارچاوی بە رووناکی دەکەوێ، لەوە بەدواوە جیهان لای ئەو فۆرم و مانایەکی‌تری هەیە!

لێکۆڵینەوەیەك کە لەسەر بناغەی بنیاتنانەوەی تیۆرەسیاسییەکان دامەزراوە، لەو روەوە کە تیۆرە سیاسییەکان لە سەر بنەمای حەقیقەتەکان هاتوونەتە ئاراوە، دەبێ بە "دۆزینەوە" لەقەڵەم بدرێ. وێناکردنی کۆمەڵگای باش لە لایەن تیۆرسێنەوە، لە خەونە تاکەکەسی و ئەبستراکتەکانیەوە سەرچاوە ناگرێت. تێگەیشتنی ئەو لە گەلاڵەکردنی نۆرمێك بۆ ژیانی سیاسی، لەراستیدا روونکردنەوەی قابلییەتە راستەقینەکانە لە دنیایەکی راستەقینەدا. ئەو سەبارەت بە دێو و پەری و گیانلەبەرە یەکشاخەکان نادوێ. تەقەلای تیۆرسێن بۆ بنیاتنانەوە، بە هۆی واقعییەتە "بابەتی"یەکانەوە بەتەواوی سنووردار دەکرێ. هەر لەبەرئەوەشە کە هۆبس، فەلسەفەی سیاسی بە "زانستی شارەکان" ناودێرئەکرد.

کەواتە تێڕوانینە سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی تیۆرسێن، سەبارەت بە کۆمەڵگای سیستماتیك، لە راستیدا بە چالاکییەکی نیمەهونەری و نیمەزانستی لە قەڵەم دەدرێ و تاڕادەیەك

بەرهەمی زەینێکی داهێنەرەو تا ڕادەیەکیش دەرەنجامی دۆزینەوەیەکی سیستماتیکە. بنیاتنانەوە پێویستی بە تەسەورێك هەیە کە لە ئەزموونە "بابەتی"یەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. مەبەست لە بنیاتنانەوە، دۆزینەوەی حەقیقەتێکە کە لە ڕێگەی شیکارێکی ڕاوەستاوی ئەو بارودۆخەی کە لەئارادایە، لە تواناداننییە.

## رەهەندی وجوودیی بنیاتنانەوە

بەدواداچوونی بەردەوامی تیۆرە سیاسییەکان مەسەلەیەکی تەواو مەعریفییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوەتی پێوەندی بەمەسەلە وجوودییەکانەوە هەیە، مەیلی بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا بە شێوەی زەینی، بە تەواوەتی دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی رۆحی و تەنانەت پێکهاتەی ئارکیۆلۆژییانەی مرۆڤ. هەر بۆیە ئەم مەسەلەیە دەخرێتە ئەستۆی بیرکردنەوەی هەستپێکراو و بابەتییەوە، نەك بیرکردنەوەی ئەبستراك. ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بە هۆی کاری فکرییەوە، دەیانەوێ "پێوەندییەکی پراکتیکی و پڕبایەخ" لەگەڵ ژینگەکەیاندا بهێننە ئاراوە.

لەم ڕووەوە تیۆرەسیاسییەکان فۆرمێکی تێکچڕژاو و ئاڵۆزی ئەرکە جیهانییەکانی ژیانی "ئەندام ئاسا"ن. ئەوانە بە شێوەك

نەزمی پێویست و گونجاو لە کۆمەڵگادا بەرقەرار ئەکەن کە تاکەکانی مرۆڤ بتوانن ئەرکە تایبەتەکانیان بە ئەنجام بگەینن. ئامانجی هەموو جۆرە ژیانێك لەسەر زەویدا ئەوەیەکە هاوسەنگی و هەماهەنگییەك لە نێوان ژینگەو نیازە دەروونییەکاندا بەرقەراربکات. تا مرۆڤ لە درێژەی گۆڕانکارییەکاندا زیاتر کامڵبێت، زەرورەتی نەزمی کۆمەڵگاش زیاتر و ئاڵۆزتر دەبێت. "ئەمیبا"ەکان (واتە گیانلەبەرە تاکە خانەکان amibe) و بوونەوەر و ئاژەڵە ئاساییەکانی‌تر، چاوەڕوانییەکی هێندەیان لەژینگەکەیان نییە، چونکە تەنیا پێویستیان بەوە هەیە کە بجووڵێن، بخۆن، بژین، بمێننەوەو زاوزێ بکەن. هەرکات ئەم گیانلەبەرانە تۆزێك کامڵتر بوون، ڕووبەڕووی پێداویستییەکی زەروورپتر دەبنەوە کە ئەویش لە ئارادابوونی سیستمێکی لەبارە بۆ پێوەندی کردن بەوانی تر و هاوچەشنەکانیانەوە. ئەم پێداویستییە بۆ ژینگەی سیستماتیکی کۆمەڵایەتی ئەو ئاژەڵە کامڵترانەی کە دەیانەوێ جیهانێکی "بابەتی"ی ڕێكوپێکیان هەبێ، دیاردەیەکی نیمە سیاسی دێننە ئاراوە.

کاتێ کە قسە لەسەر بوونەوەرێکی وەك مرۆڤ (هۆمۆ ساپیێنس homo sapens) دەکەین دەبینین کە سیاسەت بەشێکی یەکجار زۆری ژینگەکەی گرتۆتەوە. جیا لەوەش توانای مرۆڤ بۆ

پێوەندی کردن بە جیهانی دەرەوە (ژینگە) تاڕادەیەکی زۆر مەعریفی و سەمبولیکە، وەك لەوەی غەریزی بێت، کەواتە هەڵوەشانەوەی سیستمی حەقیقی، یان جیهانی سیاسەت، گوشارو کێشەگەلێکی زۆری رۆحی بۆ دانیشتوانی دێنێتە ئاراوە. لەو روەوە کە مرۆڤ ناتوانێ لە کۆمەڵگایەکی پڕ لەپشێوی و ئاژاوەدا بژی، تێکچوونی سیستمە پڕبایەخەکەی جیهان، شڵەژاوێتی لێدەکەوێتەوەو جۆرە پەرچەکردارییەکیشی بەدواوە دەبێ. هەروەك "رۆبێرت جەی لیفتۆن" دەڵێ: لەسەردەمی جێگۆڕکێکردنی کۆمەڵایەتیدا، خەڵك مەیل و داواکارییەکی زۆریان هەیە بەرانبەر چالاکییەکان و هەروەها ئەو قسانەی کە گۆڕانی نەزم و ئاڵوگۆر (تعویض)ی هێماکانی مەوجوودییەتی کۆمەڵایەتی ئاسانتر ئەکەن.

ئامانجی قۆناغی بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا لە تیۆرە سیاسییەکاندا، چارەسەرکردنی هەر ئەم مەیلی بنیاتنانەوەو هەروەها دامەزراندنی پێوەندی نێوان تاك و کۆمەڵگای سیاسییە. پشێوی و بێنەزمییە سیاسییەکان، رێگە بۆ بنیاتنانەوە لە بوارێکدا خۆش ئەکەن کەشارستانییەتی رێونکردوو..... بگۆڕن بەشتێك کە مرۆڤ تیایدا هەست بەهێمنایەتی بکات.

## جۆرەکانی بنیاتنانەوەی تیۆرانە (نظری)

دەتوانرێ چەند میتۆدێك بۆ بنیاتنانەوەی کۆمەڵگای سیاسی لە تیۆرە سیاسییەکاندا دەستنیشان بکرێت. هەرکام لەم میتۆدە جۆراوجۆرانە پێوەندییان بەجۆرە رەفتارێکی تایبەتی سیاسییەوە هەیەو هەر بە پێی ئەم پێوەندییانەشە کە "ناویان" لەسەر دادەنێن".

یەکەم، ئەوشتەی کە دەتوانین بەتێگەیشتنی رادیکاڵ بۆ وەرچەرخان لە دنیای سیاسەتدا ناودێری بکەین، لەئارادایە. لێرەدا رادیکاڵ بەو مانایەی کە لەدنیای سیاسەتدا باوە ـ واتە چەپگەرا ـ بەکارناهێنرێت. بەڵکوو مەبەستمان لە واتای سەرەکی و بنەڕەتی وشەکەیە" واتە سەرچاوەی وشەکە کە ئەویش راڤەکردنی سەرچاوەی سەرەکی مەسەلەکە دەگەینێ. ئەم تێڕوانینە زۆربەی کات خوازیاری گۆڕانکارییەکی بەرفراوانە. تیۆرسێنی رادیکاڵ :ئامانج خواز"ە. ئەو لە لەرەوتەکەی خۆیدا کەسێکی فەلسەفی، ئەبستراکت و خەیاڵاوییەو هەروەها لە کاتی ئەنجامگیرییەکاندا یەکجار "لۆژیکی"یە.

هزرمەندی رادیکاڵ بە بینینی شکستەکانی کۆمەڵگاکەی و پاشانیش بە وێناکردنی کۆمەڵگایەك کە ئەو جۆرە شکستانەی تێدانییە، کۆمەڵگاکەی خۆی وێنادەکا. هزرمەندی رادیکاڵ بەبینینی شەڕو خوێنڕشتن، جیهانێکی پڕ لەئاشتی و میهرەبانی

وێنا ئەكات، كە تیایدا "گورگ و مەڕ" لەیەك جۆگەدا ئاو ئەخۆنەوە [واتە پێكەوە تەبان]. ئەو بەبینینی ناڕاستییەكان" حەقیقەت و بە بینینی نەفرەت" برایەتی و بە بینینی لێك دابڕانەكان" یەكێتی و هەروەها بە بینینی سەركوتكاری" دەرك بەئازادی دەكا.

ڕەوشی تیۆرسازی رادیكاڵ ڕەنگە تیۆرگەلێكی پڕ بایەخی زۆری لێبكەوێتەوە. لەراستیدا بەم پێیە، تیۆرسێنە حەماسییەكان، هزرمەندانێكی یەكجار رادیكاڵن چونكە ئەوان وەڵامی ئەو پرسیارە گرنگانە ئەدەنەوە كە سەبارەت بە نەزمی سیاسی و هەروەها ئەو جیهانە سەرلەنوێ بنیاتنراوەن كە وێنای ئەكەن، جیاوازییەكی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو بارودۆخەی كە لە ئارادایە. لەم بارەیەوە ئەفلاتوون لە تیۆرەكانیدا هێندەی هێربێرت ماركۆزە ڕادیكاڵە. ئەوەش لە كاتێكدایە كە وێناكردنەكانیان لەسەر سیستمی گونجاو، بە هیچ شێوەیەك لەیەك ناچن.

تایبەتمەندی سەرەكی شێوازی تیۆرسازی رادیكاڵ، ئەوەیە كە رەوشێكی یەكجار قووڵ و كامڵ و هەمەلایەنەیە. لەو رووەوە كە ئەم رەوشە بەوردی لەبونیادی سیاسەت ئەكۆڵێتەوە، ئەو تیۆرسێنە گەورانەی كە لایەنگری ئەم رەوشەن، هەمیشە پێوەندییان بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە. لەبەر ئەوەش كە ئامانجی ئەو تیۆرانە، جێبەجێ كردنی تواناییەكانی ژیانی سیاسییە،

هەر بۆیە کاریگەرییەکی زۆر و بەردەوام لەسەر بیرۆکەکان و هاندانی ئەندیشەی خوێنەرانیان دادەنێن.

ئەڵبەتە ئەو رەوشی تیۆرسازییە، کەموکۆڕیشی تێدایە. رەنگە ئەم تیۆرانە بگەنە ئەو ئاستەی کە کەمتر کەسێك بتوانێت بە ئاسانی تێیان بگات. هەمیشە سنووری نێوان بلیمەتی و شێتی، بە ئاسانی دەس‌نیشان ناکرێت. هەر چەند زۆرن ئەو تیۆرسێنانەی کە لەسنووری بلیمەتیشیان تێپەڕاندووە، بەلام رەنگە ئەو شتەی کە ئەوان وێنای دەکەن، لەراستیدا لە شتێکی ناپراکتیکی و تەنانەت لە خەیاڵێکی خاو زیاتر هیچ شتێکی نەبێت.

بۆ نموونە "شارڵ فۆریە" یەکێك لە سۆسیالیستە خەیالاوییە بە ناوبانگەکانی سەدەی نۆزدەهەمە، کە ئایندەیەك وێنا ئەکات کەتیایدا هەسارەکان یەك دەگرنەوەو ئاوی ئۆقیانووسەکانیش ئەگۆڕێت بە "ساردی" (نۆشابە). ئەم جۆرە خەیالانە نە پێشبێژین و نەبەقووڵ بیرکردنەوەش لە قەڵەم ئەدرێن بەڵکوو لە خەیاڵ و وەهم زیاتر هیچ نین.

مەترسیدارتر لە شێتییە فریودەرانەکەی فۆریە، وێناکردنەکانی بنیاتنانەوەی سیاسییە کە بەشتێکی هێندە خەیاڵی نایەنە بەرچاو، بەلام پراکتیکیش نین [واتە نەخەیاڵین و نە پراکتیکی]. جینایەت و توندوتیژی کردن بۆ ئامانجگەلی ناپراکتیکی و تەکامولخواز، تا چەند بە بەشێکی ژیانی رۆژئاوا

له قەڵەم ئەدرێ، هێندەش ڕێزلێنانی نرخ و کەسایەتی تاکەکەسی مرۆڤـەکان ڕەچـاودەکرێ. [واتـە لـە کۆمەڵـگا ڕۆژئاواییەکانـدا توندوتیـژی هەیـە بـەڵام شـانبەشـانی ئـەوەش ڕێـز لـەکەسـایەتی مرۆڤ دەگیرێت]. پێڕەوی کردن لە ئامانجی تیۆرسێنەکان، بەشێك لـەو مەسـەلە سـەرنج ڕاکێشـەیە. لـە ڕاسـتیدا چـەند گەڵاڵـە پێشـنیارکراوەکە فریودەرانـەتر بێـت، پاسـاو هێنانـەوەش بـۆ توندوتیژیش زیاتر و زیاتر دەبێ. بۆ دامەزراندنی یۆتۆپیا ئەگەر چەند کەسێکیش ببنە قوربانی چ دەبێ؟ تیۆرسێنی مەحافیزەکار لـە لێکۆڵینەوەکانیـدا بـۆ بنیاتنانـەوەی کۆمەڵـگا، بـەدوای ئامـانجێکی‌تـردا دەگـەڕێ. بـەردی بناغـەی ئەندیشـەکانی ئـەو، سـوننەتگەلی کۆمەڵـگایە نـەك تێـڕوانینی عـەقڵانی و فکـری. هزرمەندی مەحافیزەکاری ئاقڵ، لەو باوەڕەدا نییە کەئەم جیهانە باشـترین جیهـانی شـیاو بێـت. بـەڵکوو پێـی وایـە کـە باشـترین پیشـاندەری گـۆڕان و "تەعـدیل"ی کێشـەگـەلی هاوچـەرخی سیاسی، بە ئاگابوونە لە ئەزموونە گشتی و بەکۆمەڵەکانی مرۆڤ. ئـەو سـوننەت و دەزگاگەلـەی کـەلـە"تاقیکارییـەکانی زەمـەن"دا سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـاوە، سەرچـاوەی ئیلـهامن بـۆ تیۆرسێن، نەك بەوتەی مارکس "مۆتەکە" (کابوس).

کەواتـەهـەوڵی بنیاتنانـەوە لـە لایـەن مەحافیزەکارانـەوە، بـە مانـای لێوردبوونـەوە لـە ئەزموونـەکانی مرۆڤـە بەمەبەسـتی دۆزینـەوەی ئـەو ڕەهەندانـەی کـە چالاکی خۆیانیـان پاراستووە،

نەك بۆ هەڵێنجانی دنیایەکی ئەبستراکت لە پێکهاتەی کۆمەڵگای باش. هزرمەندی مەحافیزەکار لەو باوەڕەدایە کە زەینی زاناو وریای توێژەرەوە لە "هاوچەشنێتی چالاکییە ئاکارییەکانی" مرۆڤ ورد ئەبێتەوەو لەو میانەرودا بەمەبەستی چارەسەکردنی ناهاوچەشنییەکانی کۆمەڵگا، پەنا ئەباتەبەر "هاوچەشنێنی"یەکانی نەریتی ئاکاری گشتی.

لایەنە بەهێزەکەی تیۆرسازی مەحافیزەکارانە لەوەدایە کە "واقیعگەرا"یە و ئەو واقیعگەراییەش لەبەرئەوەی لە ئەزموونە عەینییەکانی رابوردووەوە سەرچاوە دەگرێ، ناهێڵێ بکەوێتەداوی خەیاڵ چنی ڕەها و ئایدیالیستی‌یەوە. لە بەر ئەوەی کە بناغەی هزریی تیۆرسێنی مەحافیزەکار لە سەربنەمای سەرچاوەکانی "نەریت" و "رابوردوو" دامەزراوە، گەڵاڵە پێشنیارکراوەکانیشی زیاتر پراکتیکین. بەڵام لایەنە کزولاوازەکەی ئەم میتۆدەی تیۆرە سیاسییەکان لەوەدایە کەبە ئاسانی لەبەر دەم "راوەستان" و کۆنەپەرستیدا چۆك دائەدات. رەنگە تیۆرسێنی مەحافیزەکار تێڕوانینی خۆی لەسەر ئایندە، بخاتەداوی ئەگەرەکانی رابوردوەوە. هەروەها رەنگە ئەو ئیمکانات و پێداویستییە تازانەش کەبەرهەمی هەلومەرجە بگۆڕەکانی مێژوون، لەبەرچاونەگرێت و ئاوڕیان لی‌نەداتەوە.

شێوازی سێهەمی بنیاتنانەوەی سیاسی، کە دەکەوێتە نێوان شێوازی مەحافیزەکارانەو شێوازی رادیکاڵیی، رەوشی ئەو

کەسانەیە کە باوەڕیان بە ڕەسەنایەتی کردەوە هەیە. مرۆڤی سیاسی "پراکتیك خواز"، ریفۆرمخوازیشە بەڵام لە جۆری "هەنگاو بە هەنگاو" [واتە ئارام و هێدی هێدی، و بەشێنەیی ریفۆرمەکانی ئەنجام ئەدا]. قۆناغی بنیاتنانەوەکەشی یەکجار جەموجۆرە. ئەو، بە تەواوەتی پابەند نییە بە بەڕێوەبردنی دەرەنجامە بونیادییەکانی تێگەیشتنەکەی خۆی لەسەر بێنەزمی سیاسیی. پەرچەکردارییەکانیشی زیاترئەزمونگەرین، وەك لەوەی تیۆری بن. ئەو پێی وایە کەباشترین کار، باشترکردن و چاکسازی سیستمی سیاسییە، نەك لێکۆڵینەوەی بەردەوام لەسەری. ئەگەر بەشێکی بچووکی ئامێرێك خراپ بووەو باش کارناکات، ئەبێ تەنها لە بیری چاککردنەوەی ئەو بەشەدابین، نەك هەموو پێکهاتەی ئامێرەکە بخەینە بەر ڕاڤەو لێکۆڵینەوەوە.

شێوازی سیاسی لایەنگرانی "ڕەسەنایەتی کردەوە" هەندێ جار بەشێوازی ڕو لەسەریش ناودێر ئەکرێت. ئەم جۆرە "کردە"و بیرکردنەوەیە، زۆربەی کات شێوازی باوی کۆمەڵگای ئەمریکایە. لەو ڕووەوە کەئەم تێڕوانینە لەبەرانبەر ئەو پرسیارە سەرەکییانەی کە سەبارەت بەسیستمی سیاسی دەخرێنەڕوو، بێ دەنگە" هەربۆیە بەدەگمەن بوار بۆ تیۆرسازییەکی قووڵی سیاسی دەڕخسێنێ. ئەڵبەتە نابێ ئەوە لە دژی تیۆرسازی لە قەڵەم بدەین چونکە تەنانەت لە ئەمریکاشدا نۆرمگەلێك لە ئارادان کە بە تەواوەتی لە سەر بنەمای فەلسەفەوە دامەزراون. ڕەنگە "بە

ئوقسان کارکردنی ئامێرێك" یان "سیستمێك کە خەریکە بەڕێوە دەچێ" بە بەراورد لەگەڵ هەندێ پرەنسیپی وەك دادپەروەری و ئازادی و... بە جۆرە نۆرمێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم بەرێن. تەنانەت لەشێوازی ڕولەسەریشدا ئەبێ پێودانگێك هەبێت تا لە رێگەیەوە بزانرێت کۆمەڵگا تا چەند پێشکەوتووە؟ کەواتە ئەوە راستە کەشێوازی "کردەخوازی" تیۆرگەلێکی قووڵی سیاسی ناهێنێتە ئاراوە بەلام ئەم شێوازەش تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ پیشەی تیۆرسازی و بنیاتنانەوەدا سەروکاری هەیە.

لایەنە پۆزەتیڤەکانی کردەخوازی، بە ئاشکرا دیارن. ئەم رەوشە بە ئاسانی کاریگەری وەردەگری و هیچ جۆرە دەمارگیرییەکیشی تیانییە. جۆرە پەرچەکردارییەکە (عکس العمل) کە هەرگیز فۆرمێکی ئەبستراکتی زێدەڕەوانە بە خۆوە ناگرێت. رەوشێکە کە بە هۆی کاریگەری وەرگرتن و جەخت کردن لەسەر ئامانجگەلێکی تایبەت و دیاریکراو، دێتە ئاراوەو رێ لە چێبوونی جەمسەرگیریە ناپێویستەکان دەگرێ، بە تایبەت لەمەسەلە ئسوولییەکاندا.

شێوازی تەواو "کردەخواز"یش هەندێ زیان و دەرەنجامی نێگەتیڤی هەیە: یەك لەوانە، زیانی فکرییە. بەو مانایە کە کردەخوازەکان وەك پێویست بیرناکەنەوە و لۆژیکی نین. ئەوان رەنگە تاڕادەیەکی زۆریش بێئاگابن لەو گریمانەو حوکمە لۆژیکییانەی کە بەسەر کردەوەکانیاندا زاڵە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم

نائاگاییــە تیۆرییــە، دەتــوانیٚ دوورئەندێشــیش لەناوبــەرێت. کــورتبینی و بەرچــاوتەنگی لــە سیاســەتدا شــتێکی یــەکجار مەترســیدارە. کەســێکی واقیعگــەرا رەنگــە لــە جیــاتی "بــەرەو پێشەوە چوون" بەمەبەستی رزگاربوون لە کێشەکان، خۆی بخاتە ناو زەلکاوێکەوەو خۆی لەناوببات. یان رەنگە پرەنسیپە بنەڕەتی و گرنگەکان لەبەرچاو نەگرێت. رەنگـە هـەردوو ئەم مەسەلەیەش روو بـدەن. لـە روانگـەی زۆربـەی رەخنەگرانـەوە، کردەوەخـوازی گەشبینانە، رۆڵێکی گرنگی بینی لە شکستخواردنی ئەمریکا لە ڤیتنامدا.

## ئەفلاتوون و کۆمەڵگای داد پەروەر

قۆنــاغی بنیاتنانــەوەی تیــۆرە سیاســییەکان، هــەڵقوڵاوی لێکۆڵینــەوەکانی قۆناغــەکانی پــێش خۆیــەتی. وێنــاکردنی کۆمەڵگای بەختەوەر، لەسەر دەرەنجامێك دامەزراوە کە تیۆرسێن لە ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی چییەتیٚ و سەرچاوەی بیٚنەزمییەوە بەدەســتی هێنــاوە. تیۆرســێن ســەرەتا کۆمەڵــگایەکی نالــەبار و ناڕێــكوپێــك دەبــینیٚ و پاشــان لــەو ڕێگەیــەوە دەســت ئەکاتــە وێناکردنی کۆمەڵگایەکی لەبارو سیستماتیك.

ئــەم پێوەندییــە نزیکــەی نێــوان ئــەزموونی بــیٚنــەزمی و دەستنیشــانکردنو تێڕوانینــە ســەرلەنویٚ بنیاتنراوەکـەی ئـەو، بـە ئاشـکرا لـەناو هەنـدیٚ لـە وێناگەلـە بەناوبانگـەکانی "کۆمەڵـگای بەختەوەر" کە تیۆرسێنە سیاسییەکان خستوویانەتەڕوو، بەدی

ئەکرێت. بۆ نموونە سەرنج بدەنە کتێبی کۆماری ئەفلاتوون. ئەفلاتوون بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، سیاسەتی شاری ئەسینای راڤەکرد، لەراستیدا بەو هیوایە بوو کە دەورێکی چالاك لە سیاسەتی کۆمەڵگاکەیدا ببینێت. لەو راڤەکارییانەشدا لەسەر شاری ئەسینا، رووبەڕووی کێشەو گرفت گەلێکی زۆر بوەوە، بەڵام ئەوشتەی کە زیاتر لە هەموو شت ئەوی راچڵەکاندو ناچاری کرد خوێندنەوەیەکی سیستماتیکیانە لەسەر کۆمەڵگاکەی بکات، دادگایی کردن ولەکوشتنی سوقرات بوو. یەکەم پرسیارو خاڵی دەسپێکردنی تیۆرە سیاسییەکەی ئەفلاتوون، ئەوە بوو کە: ئەو مەسەلەیە بۆچی رووی دا؟

بۆ ئەفلاتوون ئاشکرا بوو کە کۆمەڵگایەك کە لەسەر بنەمای دادپەروەری دامەزرابێت، ناتوانێ تووشی جینایەتێکی لەو جۆرە ببێت. هەروەها بەو دەرەنجامەش گەیشت کە کۆمەڵگای ئەسینا کە ئەوی تیا ئەژیا، رەنگە تووشی نەخۆشییەکی گەورەی ئاکاری بووبێت، بە تایبەت رەنگە دەسەڵاتدارەکانی، واتە رێبەرە سیاسییەکانیش، کەسانێکی گەندەڵ بن. چونکە ئەوان ئەگەر مانای "چاکەکاری"یان زانیبایەو هەوڵی پەرەپێدانیشیان بدایە، هەرگیز هاوولاتییەکی وەك سوقراتیان ــ کەبەڕای ئەفلاتوون جیلوەیەکی هەموو کردەوە چاکەکانی مرۆڤ بوو ـ لەناو نەئەبرد.

دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی بێنەزمی کۆمەڵگای ئەسینا لە لایەن ئەفلاتوونەوە، پێی لەسەر ئەو مەسەلە دائەگرت کە

چینی حوکمڕان و دەسەڵاتداری کۆمەڵگا، بە شێوەیەکی گونجاو ڕانەهێنراوەو لە ڕاهێنانیاندا کەمتەر خەمی کراوە" هەروەها وتی:

بەهەمان شێوە ئەگەر بتوانی بۆ کەسانێك کە لیاقەتی دەسەڵاتدارێتییان هەیە، بەختەوەرییەك فەراهەم بکەیت کە باشتر و باڵاتر بێت لە پۆستی حوکمڕانی و دەسەڵاتدارێتی، ئەوا لەو کاتەدا ڕەنگە بتوانرێت لەشاردا حکوومەتێکی مەشرووع بەدی بکرێت. چونکە لەوەها شارێکدا ئیدی سەروەت و سامانی دەسەڵاتداران، زێڕو ئاڵتوون نییە بەڵکوو زانایی و پاکی و چاکەکارییە کە لە ڕاستیشدا ئەمانە (زانایی و پاکی و چاکەکاری) سامانی ڕاستەقینەی خەڵکانی بەختەوەرە. بەڵام بە پێچەوانەوە لەو شوێنانەدا کە دەسەڵاتداران و حوکمڕانان، سەرسواڵکەر و برسی بن و بیانەوێ لە ڕێگەی دەسەڵاتەکەیانەوە ماڵ و سامان بەدەست بهێنن، لەو حاڵەتەدا هەرگیز حکوومەتی مەشرووع بەرقەرار نابێت" چونکە هەمیشە بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، لە کێشمەکێش و ململانێدان و ئەم براکوژی و شەڕە خێڵەکییانە، سەرەنجام هەم دەسەڵاتداران لەناو ئەبەن و هەمیش دەبنە هۆی ڕووخان و وێرانبوونی شار.

کەواتە کۆمەڵگای بەختەوەر کۆمەڵگایەکە کە بە هۆی مرۆڤە چاکەکانەوە بەڕێوە ئەبردرێت. کۆمەڵگای دادپەروەر دەبێ ڕێبەری دادپەروەریشی هەبێت. بەڕای ئەفلاتوون تەنها لەو ڕێگەیەوە دەتوانێ بەتەواوەتی ڕێکخستن بەخۆوە ببینێ. تەنها لە

کاتێکدا کۆمەڵگا سیاسییەکان لە نەخۆشی رزگاریان دەبیٚ کە فەیلەسوفەکان (بەواتای لایەنگرانی حیکمەت و زانایی، نەك بە مانا تەکنیکی و ئەمڕۆییەکەی) ببنە حوکمڕان و دەسەڵات بگرنەدەست:

ئەو گەندەڵییانەی کە کۆمەڵگا بەرەو رووخان و هەڵوەشانەوە دەبەن ـ کەبەڕای من، فەسادەکانی رەگەزی مرۆۋ بەگشتی هەرگیز کۆتاییان نایەت، مەگەر ئەو کاتەی کە لە شارەکاندا فەیلەسوفەکان ببنە حوکمڕان، یان ئەوانەی کە پێیان دەڵێن پاشاو دەسەڵاتدار، بە شێوەیەکی جیدی بچنە ریزی فەیلەسوفانەوەو هێزی سیاسی و حیکمەت و زانایی تیایاندا یەك بگرنەوە.

ئەفلاتوون هەروەك لە کۆماردا پیشانیداوە، کۆمەڵگای بەختەوەر بە کۆمەڵگایەك دەزانیٚ کەتیایدا فەیلەسوفان "نموونەیەکی متافیزیکی لە نەزمی جیهان" لەزەینی خۆیاندا چیٚ بکەن، وەك چۆن سوقرات لەزەینیدا وێنای کردبوو. پاش ئەوەی کەدەرکیان بە بەختەوەری کرد و تێکەڵی کەسایەتییان بوو، لەو کاتەدا هەوڵدان بۆ کەسایەتی بەخشین بەخەڵك و هەروەها چاکسازیکردن لە ئاکاری تایبەتی و گشتی تاکەکاندا، بە ئەرکی سەرشانی خۆی بزانیٚ و بواری گەیشتن بە سیفەتە متافیزیکییەکانیان بۆ بڕەخسێنیٚ.

هەر لەبەر ئەوەیە کە کتێبی کۆمار، دەس ئەکات بە روونکردنەوەو لێکدانەوەی سیستمێکی سەختی پەروەردەو

ڕاهێنان کە دەبێ حوکمرانە فەیلەسوفەکان تێیبپەڕێنن، هەروەها ڕاڤەی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییە دەکا کە حوکمڕانان بە کەڵك لێوەرگرتنی، کۆمەڵگایەکی ئایینی و ئیلاهی دادەمەزرێنن. هەموو ژیانی ئەفلاتوون بۆبەرەو پێش بردنی ئەو ئامانجە تەرخانکراو قوتابخانەیەکی بۆ ڕاهێنانی زەینە فەلسەفەییەکان سازکرد کە بە "ئەکادیمی" ناسراوە. ئەو هەمیشە بەدوای ڕێگەیەکەوە بوو کە بتوانێت ئەو وێنایەی کۆمەڵگای بەختەوەر کە لەزەینیدا دایڕشتووە، بخاتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

ئەڵبەتە دەبێ ئەوەشمان لەبەرچاو بێت کە ئەو قسەو باسانەی سەرەوە تەنها نموونەیەکی یەکجار کەمی لێکۆڵینەوە تێروتەسەل و هاندەر ئامێزەکانی ئەفلاتوون لە کتێبی "کۆمار"دان. بەڵام هەر ئەم کورتە باسانەش ئەوە دەرئەخەن کە بنیاتنانەوە خەیاڵییەکەی کۆمەڵگا لەلایەن ئەفلاتوونەوە، لە ئەزموونە تاکەکەسییەکانی خۆی لەسەر بێنەزمی ئەسینا سەرچاوەی گرتووە. ئەفلاتوون وەڕەزبوو بەدەست ئەو کۆمەڵگا گەندەڵ و ریسوایەی کەتوانیبووی سوقرات ـــ کەنموونەی حیکمەت و زانایی بوو ـــ لە ناو بەرێت. ئەو، گەلاڵەی کۆمەڵگایەکی دارشت کەبەتەواوەتی خاڵی بەرانبەری کۆمەڵگای ئەسینا بوو. ئەو کۆمەڵگا تازەیە لەجیاتی ئەشکەنجەو ئازاردانی باشترین هاووڵاتیانی خۆی، بە پێچەوانەوە بەدەسەڵاتیان دەگەینێ. لەوێدا حیکمەت و زانایی مەحکووم ناکرێن، بەڵکوو

ڕێزیان لێدەگیرێ و بایەخیان پێدەدرێ. لەوێدا لاسایی کردنەوەی نەزمی ئیلاهی، جێی بێنەزمی و شەڕاشۆیی دەگرێتەوە. ئەفلاتوون هیواداربوو کەکۆمەڵگاکەی ئەو، بێتە شوێنێك بۆ ژیانی خەڵکانی باش و چاکەکار:

بە پێچەوانەی شارەکانیتر، ئەوە خەون و خەیاڵ نییە چونکە لەو شارانەدا دەسەڵاتداران لەسەر "شتی هیچ و پووچ" لەگەڵ یەکتریدا شەڕ ئەکەن و دەسەڵات بە شتێکی تەواو پڕ بایەخ چاولێدەکەن، هەربۆیە گەورەترین شەڕی لەسەر دەکەن.

## بناغەدانەرانی کۆمەڵگای ئەمریکاو "ئازادی لەبار"

"جیمزمەدیسۆن" و "ئەلکساندر هەمیلتۆن" و "جان جەی" لەکتێبی "وتارگەلی فدرالیست" دا، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەگەلێکی لەوجۆرە پیشان ئەدەن. ئامانجی ئەوان داڕشتنی یاسایەکی ئەساسی (دەستورێکی) تازە بوو کە بتوانێت لەبەرانبەر ئەو پشێوی و نادادپەروەری و سەرلێشێواوییانەی کە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا وەك نەخۆشییەکی کوشندە، حکوومەتە مرۆڤ دۆستەکان بەرەو ژاکان و هەڵوەشانەوە دەبەن، بەرهەڵستی بکات. شارە پەنابەرنشینەکانی ئەمریکاش، وەك ئەسینای سەردەمی ئەفلاتوون، ڕووبەڕووی کێشەیەك بووبوونەوە کە لەوسەردەمەدا، بەخراپ کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتی سیاسی لەقەڵەم ئەدرا. ئەوان تازەلەشەڕی دژی دیکتاتۆرییەتی "جۆرجی

سـێهەم" و پەرلـەمانی بـەریتانیا بووبوونـەوەو، ئـەزموونی کۆلۆنیـالیزم وەك وێنایـەکی زینـدووی جـۆرە بـێنەزمییـەکی سیاسی لەپێشچاویاندا بوو.

لـە لایـەکی تـرەوە، ئـەو شـارانەی ئـەمریکا بـە مەبەسـتی بەرەنگاری کردن و هەروەها رێگرتن لە "خراپ کەڵك وەرگـرتن لـە دەسەڵات لە ئایندەدا"، زیدەڕەوییان ئەکرد. ئەو حکوومەتەش کە هەمیشەزراند، هێندە سست و لاواز بوو کە توانـای بەڕێوەبردنی ئەرکە زەرووریيەکانی حکوومەتی نەبوو. بە بیروڕای نووسـەرانی کتێبی "وتارگەلی فدارلیست" لاوازیو ئاژاوەنانەوەکانی خـەڵك، بە پێی "پرەنسیپەکانی کۆنفێدراسیۆن" خەبەری لەسـەرهەڵدانی بێنـەزمی و پشـێوییەکی تـازە ئـەداو ئـەوان ئومێدەوار بـوون کـە نەزمی سەرلەنوێ بنیات نراو، ئەو دوو لاوازییە چارەسـەر بکـات، ئـەو سیسـتمە ئەبوایـە هـەم رێگـەی لـە دیکتاتۆرییـەت بگرتایـە (واتـە، دەسـەڵاتی لـەڕادەبـەدەری حکوومـەت)و، هـەم پشـێوی و ئانارشیزم (واتە شڵەژاویتی و پشێوی کۆمەڵگا بە هۆی نـەبوونی حاکمییەتی دەوڵەتەوە).

مەدیسـۆن سـەبارەت بـە رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ ئـەم ئاژاوەگێڕییـە سیاسییانەدا، بیروڕایـەکی پێچـەوانەی ئـەفلاتوونی هـەبوو. ئـەو لـەجیاتی ئـەوەی گەڵاڵـەی سیسـتمێك دابڕێـژێت کـە تیایـدا گرووپێك بۆ بـە دەسـتەوەگرتنی پلـەو پایـە سیاسییەکان رابهێنـرێن، سیسـتمێکی هێنایـە ئـاراوە کـە بتـوانێ رێ لـە

گەشەکردن و چالاکیکردنی ئەو مرۆڤە خۆپەرست و پلەوپایەخوازانە بگرێت کە بە قازانجی بەرژەوەندییەکانیان کەڵك لە کۆمەڵگا وەردەگرن. بۆمەدیسۆن هەر ئەوەندە بەسبوو کە لەجیاتی چاکسازیکردن لە کەسایەتی مرۆڤدا، بە پێچەوانەوە دەزگاکان چاك بکات.

ئەڵبەتە ئەم جیاوازی شێوازانە، تاڕادەیەك دەرەنجامی ئەو بارودۆخەتایبەتەبوو کە مەدیسۆنی تیا ئەژیا. ئەو، توانا و دەرفەتی خستنەڕووی کۆمەڵگایەکی یۆتۆپیایی و کامڵ، یان دەرفەتی راهێنانی زەینە فەلسەفییەکانی نەبوو. لەجیاتی ئەوە ناچار بوو چوارچێوەیەکی تایبەتی یاسایی دابڕێژێت، کە مرۆڤەکان وەك خۆیان (بەوجۆرەی کەهەن) لەبەرچاو بگرێت، نەبەو شێوەیەی کە رەنگە بین.

تێڕوانینە جۆراوجۆرەکانی مەدیسۆن و ئەفلاتوون لەسەر نەزمی سیاسی سەرلەنوێ بنیاتنراو، ئاماژەیان بە جیاوازی بیروڕاکانیان ئەکرد سەبارەت بە هۆکاری کێشەکان. بەڕای ئەفلاتوون سیفەتگەلی خۆپەرستی، شەڕخوازی و پلەو پایەخوازی مرۆڤ، کە کۆمەڵگا رووبەڕووی مەترسی ئەکەنەوە، پیشاندەری فیترەتی ناپاك و گەندەڵیمرۆڤن کە ئەڵبەتە بە هۆی راهێنانی رێكوپێك و باشەوە چارەسەر دەکرێن. بە پێچەوانەوە

مەدیسۆن لەو باوەڕەدا بوو کە ئەم خەسڵەتە مرۆییانە "بەشێکی نەگۆڕ و سەقامگرتووی پێکهاتەی مرۆڤن" و تەنها کاتێکیش دەتوانین لەناویانبەرین کە ئازادیش لە ناوبەرین و ئەوەش وەك عوزری لە گوناح قەبیحتر وایە:

ئەوە بێ ئەقڵییەکی یەکجار گەورەیە ئەگەر ئازادی، کە بەشێکی هەرە پێویستی ژیانی سیاسییە، بەو هۆیەوە لە ناوبەرین کە پەرە بە تەفرەقەو دووبەرەکی ئەدات. ئەوەش بەتەواوەتی وەکوو ئەوەیە کە "هەوا"، کە لە پێداویستییە هەرە زەرورییەکانی گیانلەبەرانە، بەو هۆیەوە لەناو بەرین کە دەبێتە هۆی زیاتر هەڵگیرسان و کڵپەسەندنی ئاگر.

بەم هۆیەوە مەدیسۆن لەو بڕوایەدایە کە تەنها ڕێگەچارەی لۆژیکی ئەوەیە کە بە ڕەخساندنی دەرفەت بۆ گەشەکردنی گرووپەکان و بەرژەوەندییە ڕەقیب و دژبەیەکەکان، ڕێگە لە گەشەکردنی پلەوپایەخوازی مرۆڤەکان بگرین. ڕێگەچارەکەی ئەفلاتوون واتە "پاشای فەیلەسوف" کێشەکە چارەسەر ناکات. بێهوودەیە ئەگەر بڵێین دەسەڵاتدارێکی ڕۆشنبیر دەتوانێ هاوسەنگی لە نێوان ئەم بەرژەوەندییانەدا بهێنێتە ئاراوە و بە قازانجی کۆمەڵگا بیانخاتە گەڕ. دەسەڵاتداری ڕۆشنبیر هەمیشە لەسەر کورسی دەسەڵاتدانییە. تەنها ڕێگەچارە، دامەزراندنی

سیستمێکە کە تیایدا، هێزە جۆراوجۆرەکان یەکتری کۆنترۆڵ بکەن:

ئەبێ ئامانج ئەوە بێت کە دەزگا جۆراوجۆرەکان بە شێوەیەك دابمەزرێنین کە هەموویان چاودێری یەکتری بکەن. بەواتایەکی‌تر، بەرژەوەندییە شەخسییەکانی هەموو تاکەکان، ببنە پارێزەر (پاساوان)ی مافەگشتییەکان.

ئەڵبەتە ئەفلاتوون بانگەشەی ئەوەش دەکا کە "واقیعگەرا"یە، بەڵام مەدیسۆن خەیاڵاوی و ئایدیالیستە. بەڕای ئەفلاتوون، تەنها کەسێکی خەیاڵاوی لەو باوەڕەدایە کە بنیاتنانەوەی دەزگا سیاسییەکان دەتوانێ کۆمەڵگا لەدەست مرۆڤە نادادپەروەرەکانەوە رزگار بکات. بەڕای ئەو، ئەم هەموو هەوڵ و تەقەلایە هەم خەفەتهێنەر و پڕووکێنەرن،هەم لەهەمان کاتیشدا بەرەمی ئەندیشەگەلی مافناسە خێرخوازەکانە.

.... لەراستیدا تەماشا کردنی کاری ئەو خەڵکە، سەرگەرمییەکی خۆشە. بۆخۆیان یاساگەلێك لەو جۆرانەی کە باسم کردن، دادەنێن و هەندێ زاراوەیان تیا بەکاردێنن و هەمیشە بەوە دڵخۆشن کە کۆتایی بێنن بەو گەندەڵییانەی کە دزە ئەکەنە ناو ئەو "بڕیار" و مەسەلانەی کە پێشتر قسەمان لەسەر کردن، بەڵام نازانن ئەو کارەیان لە "سەربڕینی مارێك" دەچێ کە دوای هەر سەربڕینێك، سەرێکی‌تری لێ‌دەڕوێتەوە.

ئەو وێنایەی کە ئەفلاتوون و مەدیسۆن لەسەر کۆمەڵگای بەختەوەریان خستەڕوو، وێنای کۆمەڵگایەك بوو کە دەیتوانی هەموو ئەو پشێوییە گرنگە سیاسییانەی کە بۆ خۆشیان تاقییانکردوونەتەوە، لەناوبەرێت. ئەو کۆمەڵگا دادپەروەرەی کە ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماردا وێنای ئەکرد، دەرەنجامی تێڕوانینی ئەو بوو لە کۆمەڵگایەك کەتیایدا یەکێتی و ڕێکخستن، جێی ئاژاوە ناوخۆییەکان دەگرێتەوە. واتە کۆمەڵگایەك کە تیایدا خەڵکانی باش لە جیاتی ئەوەی کە بەدناو و ریسوابکرێن، بەپێچەوانەوە ڕێزیان لیٚ ئەگیردرێت. بەم پێیە، ئەو پێکهاتە تازە سیاسییەی کە لە "وتارگەلی فدرالیست"دا پیشاندراوە، کۆمەڵگایەکی هەم سەقامگرتوو و هەمیش ئازادە. ئەو کۆمەڵگایە، هەم لە دیکتاتۆرییەت و هەمیش لەو ئاژاوانەی کە نووسەران تاقییان کردوونەتەوە، ڕزگاربوە.

تێڕوانینی تیۆرسێنەکانی دیکەش لەسەر کۆمەڵگای بەختەوەر، هەربە هەمان ئەو ڕێگانەدا ڕۆشتوونە. هەموو ئەو نموونانەی کە وێناکردنی کۆمەڵگای بەختەوەر لەلایەن هزرمەندانەوە پیشانئەدەن، باس لە کۆمەڵگایەکی "لەبار" ئەکەن کە خاڵی بەرانبەری ئەو کۆمەڵگا نەخۆش و نالەبارانەیە کە ئەو هزرمەندانەیان تیا ئەژیا. ئێمە لێرەدا تەنها چەند نموونەیەك دێنینەوە.

# تۆماس هۆبس و کۆمەڵگای ئاسایش

هەروەك پێشتر باسکرا، تۆماس هۆبس ترسی جیاوازییە سیاسییەکانی بەریتانیای سەدەی حەڤدەهەم دایگرتبوو. بەڕای ئەو،جەمسەرگیریە کۆمەڵایەتییەکان کە کۆمەڵگایان بە سەر چەند گرووپ و تاقم و حیزب گەلێکی دژبەیەك دابەش کردبوو، بەریتانیایان خستبوە بەردەم مەترسی شەڕی ناوخۆیی و خوێنڕشتنێکی وێرانکەرەوە. بەڕای هۆبس، هەڵوەشانەوەی نەزمی سیاسی و سەرهەڵدانی براکوژی، گەورەترین کارەساتی سیاسی بوو.

هەربەم هۆیەوە، ئەو ڕێگاچارەی کە لە کتێبی "لویاتان" دا پێشنیاری کرد، خستنەڕووی سیستمێکی تازەی کۆمەڵایەتی بوو کە ئەم ڕەوتە مەترسیدارەی دەسڕیەوە. بە پێی لێکدانەوەکانی هۆبس، تا سیستمێکی بە هێزوتوانا جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە نەبێ، عاتیفە و سۆزە سروشتییەکان، خەڵك بەرەو شەڕێکی قورسی لەدژی یەکدی هانئەدەن. هەر بەم هۆیەشەوە، ئەبێ دەسەڵاتی حاکمییەتی "ڕەها" بهێنرێتە ئاراوە و دانیشی پێدابنرێت. ئێمە بۆ ئەو ئاشتی و ئاسایشەی کە هاتۆتە ئاراوە، هەم قەرزاری خوای "فانی"ین (واتە حکوومەتی بەدەسەڵات)و، هەمیش خوای باقی. کەواتە وێنا سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی حاکمییەتی "لویاتان"، پێداویستییەکانی

بنیاتنانی کۆمەڵگای ئەمنی سیاسی و لەبار و سەقامگرتوو کە داکۆکی لە مافی هاووڵاتیانی خۆی دەکا، ڕووندەکاتەوە.

## ژان ژاك ڕۆسۆو کۆمەڵگای ئاکاری

ڕۆسۆ لە لێکۆڵینەوەکانیدا ئاوڕ لەهەندێ بابەتی تریش ئەداتەوە. بەڕای ئەو، گەندەڵبوونی کۆمەڵگا، لە فرۆفێڵ و نایەکسانییەوە سەرچاوە دەگرێ. هەروەها لەو باوەڕەدابوو کە کۆمەڵگای فەرەنسە، هاووڵاتیانی خۆی هان ئەدات کەداواکاری و خواستە سروشتییە مرۆڤییەکانیان سەرکوت بکەن و ڕەفتارگەلی دەسکرد و درۆیینی کۆمەڵایەتییان لەجێ دابنێن. کۆمەڵگا، وێڕای ئەوەش، پەرە بە نایەکسانییەکی لەڕادەبەدەر لەناو هاووڵاتیاندا ئەدات. ئەو دووشکستە وا لە هاووڵاتیان دەکا کە هەم بە خۆیان نامۆبن و هەم بە هاوچەشنەکانی تریان و دەرەنجامەکەشی ئەوەبوو کە یەکپارچەیی کۆمەڵگای سیاسی لەڕووی ئاکارییەوە لەناوچوو.

کتێبی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" بۆ بەرەنگاری کردنەوەی ئەم شکستانە، کۆمەڵگایەك وێنادەکا کە ڕەفتاری دەسکرد و هەروەها نایەکسانییەك کە دووبەرەکی لێبکەوێتەوە، تیایدا بوونی نییەو هەموو هاووڵاتیانی ئەو کۆمەڵگایە پێکەوە یەکسان و

بەرابەرن. کۆمەڵگا بەختەوەرەکەی رۆسۆ، ئەو یەکسانییە ئاکاری و مەشرووعەی کەتیایدا هەموو تاکەکان بە پێی بڕیارەکان، لە مافی یەکسان بەهرەمەندن، لە جێی نایەکسانی سروشتی و جەستەیی‌دا دادەنێ. لەگەڵ ئەوەشدا لەم کۆمەڵگایەدا نایەکسانی ئابووری، بەو شێوەیەی کە لە فەرەنسەی سەردەمی رۆسۆدا باو بوو، ناتوانێ یەکسانی ئاکاری و سیاسی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. لە جیهانی سیاسی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا، هیچ هاووڵاتییەك هێندە دەوڵەمەند نییە کە بتوانێت هەموو ئەوانی‌تر بخاتە خزمەتی خۆیەوەو، هیچ هاووڵاتییەکیش هێندە هەژار و دەسکورت نییە کە ناچار بێت خۆی بفرۆشێت.

رۆسۆ گلەیی لەوە دەکرد کە ئەو کۆمەڵگا گەندەڵەی ئەوی تیا دەژیا، فیزیکزان، ئەندازیار، کیمیاناس، ئەستێرەناس، شاعیر و مۆسیقازان و هونەرمەندی زۆری تیایە بەڵام هاووڵاتی (شارمەند) تیانییە. لەگەڵ ئەوەشدا لەم سەردەمەدا، ئێرەیی بردن، بەدگومانی، ترس، بێ‌عاتیفەیی، خۆخواردنەوە و نەفرەت و فڕوفێڵ‌بازی لە ژێرسێبەری "ئەدەبی کۆمەڵایەتی"دا بە تەواوەتی برەوی هەیە. بەڵام لەناو ئەو کۆمەڵگایەی کە "پەیمانی کۆمەڵایەتی" باسی دەکا، مرۆڤەکان بۆ جارێکی‌تر دەبنەوە هاووڵاتیگەلی راستەقینەو بە هۆی کۆتو بەندی ئاکاری "ئیرادەی

گشتی"یەوە، یەك دەگرنەوە و یەکگرتوو دەبن. لەو کۆمەڵگایەدا هاووڵاتیـان هـیچ فروفێڵێـك لەیـەك ناكـەن و كەواتـە هـیچ دوژمنایەتییەکیشیان نابێت. هاووڵاتیانی کۆمەڵگای بەختەوەر بە تەنها بیر لە ئاسایشی گشتی دەکەنەوە و لەو حاڵەتەدا، هەموو داب و نەریتـەکانی کۆمەڵـگا، سـادە و سـاکارن و هـەروەها یاساکانیشی روون و ئاشکران و هیچ جۆرە پێکادانێك لە نێوان بەرژەوەندییەکانـدا لـە ئارادا نییە. بەرژەوەندییە گشتییەکان لـە هەموو شوێنێکدا ئاشکران و تەنها بە هۆی تێروانینی دروستەوە دەتوانین بیانبینین.

بەکورتی، یەکسانیی مەدەنی جێی سیستمی نامەشرووعی "زنجیرە پلەو پایەکان" دەگرێتەوە. راستگۆیی و چاکەکاری" جێی درۆ و تەڵەکەبازیو، هەروەها یەکێتی" جێی دووبەرەکی و دوژمنایەتی دەگرێتەوە. ئەگەر تێروانینەکەی رۆسۆ بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، نایەکسانی و خراپکارییە گەورە سیاسییەکانی ئەو سەردەمە، هەرگیز لە ئایندەدا مرۆڤ تووشی ئێش و ئازار ناکەن.

# ئەریك فرۆم و کۆمەڵگای ئاقڵ

ئەریك فرۆم کۆمەڵگای سەرلەنوێبنیاتنراو، بە "کۆمەڵگای ئاقڵ" لە قەڵەم ئەدات. واتە، هیچ نەزمێکی تایبەتی سیاسی کە تیایدا کێشەگەلی رۆحی و ئەو رەفتارە نادروستە کۆمەلایەتییانەی کە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ دەیانهێننە ئاراوە، لە ئارادانییە. کۆمەڵگایەکە کە لەسەر تەوەری مرۆڤ دەخولێتەوە و هەموو چالاکییە ئابووری و سیاسییەکانیشی گرێدراون بە گەشەکردن و تەکامولی ئەوەوە. کۆمەڵگایەك کە تیایدا هەندێ سیفەتی وەك فرەخوازی و چەوساندنەوە و کۆلۆنیالیزم و خۆپەرستی، وجوودیان نییە. کۆمەڵگایەکە کە بەتەنها بەرهەمی زەین و خەیاڵ، یان سەلیقە تاکەکەسیەکانی ئەو نییە. لە راستیدا گەلاڵەی کۆمەڵگایەکە کە بۆ سلامەتی رۆحی، شادمانی، هاوسەنگی، ئەوین و کەڵك وەرگرتن لە سروشتی هەر مرۆڤێك کە بەئەحمەقی و نەفامی لە دایك نەبوە، هەندێ ئیمکانات فەراهەم دەکا.

## کارل مارکس: دوای شۆڕش

دواهـــەمین نموونـــەی قۆنـــاغی بنیاتنانـــەوە لـــەتێـــورە سیاسـییەکاندا، کـە پێویسـتە ئامـاژەی پـیّبکرێـت، تیۆرەکـەی مارکسـە. نـەك تـەنها لەبـەر ئـەوەی کـە ئـەم تیـۆرە لـەم سـەردەمە هاوچەرخەدا گرنگە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیکە بە بەراورد لەگەڵ ئەو نموونانـەی تـردا کـە باسمـان کـردن، قـورس و ئـاڵۆزترە. کـارل مارکســیش (هــەروەها فـرێــدریش ئــەنگلس) وەك تیۆرســێنە داهێنـەرە سیاسـییەکانیتـر، روانگەیـەکی تایبـەتی سـەبارەت بـە کۆمەڵــگای بەختــەوەر هەیـە. بنیـاتنانەوەکـەی مـارکس چ وەك رواڵەت و چ وەك ناوەڕۆك، هەندیّ تایبەتمەندی تایبـەت بـە خـۆی هەیە.

مـارکس تێڕوانینێکـی یـەکجار "گشـتی" لەسـەر کۆمەڵـگای بەختـەوەر هەیـە. مـارکس لـە یـەکێك لـەگوتـارە بەناوبانگەکانیـدا، کۆمەڵگای سیاسی کۆمۆنیستی، بە کۆمەڵگایەك لـە قەڵـەم ئـەدات کە تیایدا هیچ کەس لە هیچ بوارێکدا بـە تـەواوەتی پسـپۆڕ نییـە، بـەڵکوو هــەموو کەسـێك دەتـوانیّ لــە هــەر بوارێکـدا کـە حـەزی لیّبێت، سەرکەوتن بەدەست بهێنێت:

لەبەرئـــەوەی شـــێوەی بەرهـــەمهێنان لـــە ژێـــر کـــۆنترۆڵی کۆمەڵــگادایە، مــرۆڤیش دەتــوانیّ هــەر رۆژەو چــەندین کــاری جۆراوجۆر ئەنجام بدات. بـەیانییان بچێتەڕاو، دوانیوەڕۆ ماسـی

بگرێت، ئێوارە گاگەل بلەوەڕێنێت و شەویش دەس بکات بە ڕەخنەگرتنی کۆمەڵایەتی" بە بێ ئەوەی کە ڕاوچی، ماسیگیر، شوان، یان ڕەخنەگر بێت.

جگە لەم چەند قسە گشتییە سەبارەت بە ئابووری سادە و دڵخوازی ناپیشەییەکان، مارکس هێندە قسەی لەسەر وردەکارییەکانی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی نەکردووە و بۆ ئەم کەم قسەکردنەشی هۆی تایبەتی هەیە. ئەو حەزی نەئەکرد بە تێروتەسەلی لەسەر کۆمەڵگای کۆمۆنیستی بدوێت و بە تەواوەتی بیخاتەڕوو، چونکە ئەم مەسەلە بۆ کەسێك کە زانستییانە کاردەکا، دروست نییە. مارکس ئەو تیۆرسێنانەی کەتێڕوانینی خۆیان لەسەرسیستەمی سیاسی عەقڵانی، بە تەواوەتی روون دەکردەوە، بە کەسانێکی "خەیاڵاوی" لە قەڵەم ئەدا. ئەم کۆمەڵگا سەرلەنوێبنیاتنراوە، هەرچەندەش سەرنجراکێش بێت، بەڵام مارکس گاڵتەی پێ دەکرد و بەشتێکی خەیاڵی لە قەڵەم ئەدا. هەروەها بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە سۆسیالیزمە زانستییەکەی ئەو، بە پێچەوانەی ئەو میتۆدانەیتر کە پێشتر قسەیان لەسەر کرا، لێکۆڵینەوە لەسەر واقعییەت و حەقیقەتەکان دەکا.

بە پێی لێکدانەوەکەی ئەو، حەقیقەت شتێکی "راوەستاو" نییە بەڵکوو بەردەوام لە حاڵی گۆڕان و گەشەونەشونماکردندایە. مارکس مۆدێلی ئەم پێشکەوتنەی کە لە مێژووشدا نموونەی

هەیە، بە "دیالکتیك" ناودێرکرد. ئەم باوەڕە هەندێ دەرەنجامی جۆراوجۆری لێکەوتەوە کە یەکێك لەوانە، لە پێوەندی لەگەڵ بابەتی ئەم بەشەدا گرنگییەکی زۆری هەیە. بێنەزمییەکانی ژیانی سیاسی لە بواری گۆڕانکارییە دیالکتیکەکاندا بە"دژایەتی" (تضاد) لە قەڵەم ئەدرێن. واتە ئەو بێ نەزمییانە لە حاڵەتی شەڕو پێکادانیك دان کە بە هۆی دوو هێزی موتەقابیل و جیاوازەوە دێنە ئاراوە. مارکس لەو باوەڕەدابوو کە بە هۆی هەوڵدان بۆ لەناوبردنی ئەم دژایەتییانەیە کە گۆڕانکاری دیالکتیکی دێتە ئاراوە. بەڕای مارکس لەناو بردنی "دژایەتییەکان" پاڵنەری گۆڕانکاریگەلی مێژووییە. ئەو بێنەزمییانەی کە مارکس لە سیاسەتی سەردەمی خۆیدا دەیبینی، لەبەر ئەوەی کە لە چەشنی هەمان ئەودژایەتییانە بوون، وای تەسەور دەکرد کە ئەوانە یەکدی پووچەڵ دەکەنەوە. بەواتایەکی‌دی، مارکس ئەو بێ نەزمییە سیاسییانەی کە تاقی ئەکردنەوە، تەنها وەك سەرەداوێك بۆ وێناکردنی کۆمەڵگایەکی سیستماتیکی سیاسی لە قەڵەم نەئەدا، بەڵکوو بەسەرچاوە و بناغەی گەشەکردنی کۆمەڵگایەکی عەقلانی تر لە ئایندەدا لە قەڵەم ئەدا. ئەم قۆناغە دواییەی مێژوو جۆرە بێ نەزمی و پشێوییەکی تێدا بوو کە دەبوە هۆی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگاکان.

کەواتە تێڕوانینە سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی مارکس سەبارەت بە کۆمەڵگای بەختەوەر، زیاتر پێشبینییەکی گشتییە وەك لە ئارەزوویەکی خەیاڵی. هەروەها لەو باوەڕەدابوو کە تارادەیەك ئەو سیستمە تازەکۆمەلایەتییەی وێناکردووە کە لەئایندەیەکی نزیکدا دێتەئاراوە، نەك ئیمکاناتە "بالقوە"کان. کۆمەڵگا سەرلەنوێ بنیات نراوەکەی ئەو، تێڕوانینێك بوو لەسەر ئایندە، نەك لەسەر ئامانجێکی بێکۆتایی.

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە وێنا کردنەکەی مارکس لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی وێناکردنێکی تەواو تەمومژاوی بوو. مرۆڤ دەتوانێ سەبارەت بە هیوا و خەیاڵ و ئامانجە ئەبستراکتەکانی خۆی، ڕاشکاوانە قسە بکات. بەلام ئەگەر مرۆڤێکی وەك مارکس بانگەشەی ئەوەبکات کەبە یاساکانی تەکامول ئاشنایە، ئیدی ناتوانێت بە شێوەیەکی دروست پێشبینی ئایندە بکات" تەنها لە دوایین لێکۆڵینەوەدا دەتوانرێت ئایندە بەشێوەیەکی گشتی، پیشان بدرێت. لەیەکێك لە خوازە بەناوبانگەکانیدا مارکس، ئەم خاڵە بە شێوەیەکی جوان دەخاتەڕوو. ئەو ئەیوت، کاتێك دەتوانین کۆمەڵگای عەقلانی ئایندە وێنا بکەین کە بتوانین وێنایەك لەو کۆمەڵگایە لە "ناخی" سەردەمی خۆماندا ببینین. بێنەزمییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری، هەڵگری وێنایەکی کۆمەڵگای سۆسیالیستییە، بەلام ئەم وێنایە تەنها هەندێ لایەنی دەرئەخات، نەك هەموو

لایەنەکانی. تەنها لەکات و زەمەنێکی گونجاودادەتوانرێ هەست بە بینینی "سیستەمی نوێ" بکرێت. تەنها لە کاتێکدا دەتوانین نەزم ببینین کە ڕەوتی مێژوو کامڵ بێت و کۆمەڵگای تازە بێتە ئاراوە. تا ئەوکاتەش هەوڵدان بۆ وێناکردنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی، وەك ئەوە وایە کۆرپەلەیەك لە منداڵدانی دایکیدا بێت و ئێمەش پێشبینی ئەوەی بۆ بکەین ببێتە مرۆڤێکی ئاقڵ و باڵغ. لەکاتێکدا لە وێنایەکی گشتی و ناتەواو زیاتر لەسەر ئەو کۆرپەلەیە، ناتوانین هیچ شتێکی دیکە بەدەستەوە بدەین.

هەرچەند ئەوە تێڕوانینێکی یەکجار تەمومژاوییە بەڵام پێوەندی نێوان هەردوو تێگەیشتنەکەی مارکس لە بێنەزمی کۆمەڵگاو تێگەیشتنیشی لە کۆمەڵگا سیستماتیکە عەقڵانییەکەی ئایندە، پێوەندییەکی تەواو روون و ئاشکرایە. مارکس باوەڕی بە کاری پراکتیکی هەبوو و، هەروەها تێگەیشتن لە چالاکێتی گۆڕانکارییە مێژووییەکان هانیان دا بە لێوردبوونەوەیەکی یەکجار زۆرەوە، دەست بکات بە هەڵسەنگاندنی بێسیستەمی ئێستا و سیستەمی ئایندە.

کۆمەڵگای سەرمایەداری، کۆمەڵگایەکی چینایەتییەو کۆمەڵگای کۆمۆنیستی، کۆمەڵگەی ناچینایەتییە. خاوەنکاری بۆرژواو پرۆلیتاریا هەردووکیان "نامۆن". مرۆڤی سۆسیالیست لە رووی رۆحییەوە لەبارو تەواوە و لەگەڵ ئەوەشدا نامۆنییە.کۆمەڵگای سەرمایەداری غەڵتانی شەڕوئاژاوەیە و

کۆمەڵگای کۆمۆنیستی،تەژیە لە ئاشتی و یەکسانی و برایەتی. بەکورتی، دژایەتی و پێکادانەکانی ئێستا دەگەنە ئاستێك کە ئیدی قابیلی تەحەمولکردن نین و پاشان بەهۆی وەرچەرخانێکی شۆڕشگێڕانەوە لەناو ئەچن. ئەو نەزمە تازەیەش کە بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەوە دێتە ئاراوە مرۆڤێکی بەخشراو لەگەڵ مرۆڤێکی تاونبادراردا، چەندێك وێکچوونی هەیە هێندە وێکچوونی.

## بنیاتنانەوە: بواری مێژوویی و پێوەندیی هەمیشەیی

هەموو باس و لێدوانەکانمان لەسەر بنیاتنانەوە لە تیۆرە سیاسییەکان هەروەها ئەو نموونانەی کە هێنامانەوە، پێوەندی یەگجار نزیکی ئەم قۆناغەی لێکۆڵینەوەکەمان لەگەڵ قۆناغەکانی پێشتر پیشان دەدا. تێڕوانینە سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی تیۆرسێنی سیاسی، بەشێکی روونکراوەی لایەنە تاریکەکەی سیاسەتە کە بۆخۆی تاقی کردۆتەوەو بینیویەتی. سەرکەوتنی گەلاڵەی سەرلەنوێ بنیاتنراو، واتە قابلییەتی بەردەوام بوون، عەقلانی بوون و هەروەها حەقیقی بوونیشی، گرێدراوە بەو دەرەنجامەوە کە تیۆرسێن لە قۆناغی دەستنیشان کردنی هۆکارەکاندا بەدەستی هێناوە.

لەو روەوە کە قەیرانە تایبەتەکەی کۆمەڵگای تیۆرسێن، ئەو سەرچاوە خاوانەن کە لە رێگەیانەوە تێڕوانینی خۆی لەسەر سیستمی سیاسی دێنێتە ئاراوەو بەئاگابوون لە خودی

سەرچاوەکان و هەروەها بواری مێژووییشیان، تاڕادەیەکی زۆر یارمەتیمان ئەدا دەرك بە ئەندیشەکانی تیۆرسێن بکەین. تێگەیشتنی شڵەژاوێتییە سیاسییەکانی ٤٠٠ ساڵ پێش زایینی کۆمەڵگای ئەسینا، هەندێ خاڵی گرنگ سەبارەت بە "کۆمار"ی ئەفلاتوونمان دەخاتە بەردەست. تێگەیشتنی تایبەتمەندییەکانی سیاسەتی سەردەمە پڕ لە پێشکەوتنەکەی فلۆرانس، یارمەتی مرۆڤ ئەدات کە بزانێ بۆچی مەکیاڤیلی سەبارەت بە پێویستبوونی حوکمڕانی بەدەسەڵات، شتی نووسیوە. تێگەیشتن لە گۆڕانکارییەکانی سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی، بەمەبەستی دەرك پێکردنی هێزو توانا و واتای "مانیفێستی کۆمۆنیست"ی مارکس، گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە و ئەوانی دیکەش بەهەمان شێوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بزانین کە گەلاڵە سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی تیۆرسێنە گەورە سیاسییەکان، بە تەنها بەرهەمی پرسیار و لێکۆڵینەوە مێژووییەکان نییە. ئەوە شتێکی ڕێکەوت نییە کە ڕاڤە و لێکۆڵینەوەکانیان تا ئێستا بایەخی خۆیان لەدەست نەداوەو لە هەموو کات و شوێنێکدا لە لایەن هزرمەندانەوە ــ کە پێوەندیشیان بەژینگەیانەوە نییە ــ دەخوێنرێنەوە. ڕەمزی مانەوەی لێکۆڵینەوەکانیان لەوەدایە کە مەسەلەگەلێك دەخەنەڕوو، کە پێوەندییان بەبنەماکانی بوونی مرۆڤەوە هەیە و هەروەها ئەو بێنەزمییانەش کە ڕاڤەکارییان

لەسەر ئەکەن، مەترسیگەلی هەمیشەیی کۆمەڵگا سیاسییەکانن. ئەو وردەکاریەکانی هەلومەرجەی کە ئەوانی بۆ تیۆری داڕشتن هانداوە، هەرگیز دووبارە نابنەوە بەلام هەل و مەرجە گشتییە شاراوەکان، ناوبەناو دووبارە دەبنەوە.

سەدەی بیستەم هیچ نیگەرانییەکی نییە لە مەڕ "دیۆنۆسیۆس"ی خەڵکی "سیراکۆز" یان دەسەلاتدارە فێڵبازەکانی ئەسینا، کە بە "سی ملهوڕەکان" ناوبانگیان دەرکردووە. بەلام سەدەی بیستەم ناچار بوو رووبەڕووی دیکتاتۆرییەتی ستالین و هیتلەر ببێتەوە. کەواتە لێکۆڵینەوەی ئەفلاتوون لەسەر کرۆك و دینامیزمی دیکتاتۆرییەت، بەکەڵکی مەسەلەکانی ئەمڕۆش دێت.

شەڕە سیاسییەکانی نێوان شۆڕشگێڕە دیندارەکان (puritans)و لایەنگرانی کلێسەی ئەنگلیکەن (Anglican)، یان نێوان شای دیکتاتۆر و "یەکسانیخوازەکان" (levellers) لەم سەردەمەی ئێستادا هیچ مانایەکی نییە. بەلام لە ساڵی ١٩٤٢دا فەیلەسوفێکی گەورەی هاوچەرخ رایگەیاند کەبیرکردنەوە قووڵەکانی تۆماس هۆبس، بە تەواوەتی بەکەڵکی کێشە و گرفتەکانی ئەم سەردەمەی ئێستاش دێن. هەروەها وتیشی: "ئێستا، واتە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، زۆرن ئەو کەسانەی کە بۆیەکەم جار چاویان بە کتێبی لویاتانی هۆبس دەکەوێ و دەرك بە ئەرزش و بایەخی ئەو کتێبە دەکەن و بە

پڕبایەخترین ژێدەری رۆشنبیریی سیاسی لە جیهاندا لە قەڵەمی ئەدەن".

داب و نەریت و عادەتەکانی سەدەی هەژدەهەمی فەرەنسە، بەتەواوەتی لە ناوچوونەو سێ چینە گرنگ و جیاوازەکانی کۆمەڵگای فەرەنسە (ئەریستۆکراتەکان، خاوەن کڵێسەکان، خەڵکی ڕەمەکی) ئیدی بەمەسەلەیەکی گرنگی سیاسەتی ئەمڕۆ لە قەڵەم نادرێ و هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێ. بەڵام ئەو کۆمەڵگا تازەیەی کە رۆسۆ لە وەڵامی ئەم واقعییەتانەدا پێشنیاری دەکرد، لای هزرمەندانی "چەپی نوێ" گرنگییەکی زۆری هەیە و پێوەندیشی بە کارەکانیانەوە هەیە. یەکێك لە نووسەرە هاوچەرخەکان، کە خۆی بە بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرەوە سەبارەت بە مەسەلە سیاسی و ئەزمونگەرییەکان دەنووسێ، رۆسۆ بە "کانگای زێڕ" ناودێر ئەکات.

گرنگیی هەمیشەیی تیۆرسێنە گەورەکان لەوەدایە کە بە رێكوپێكی راڤەکاری لەسەر مەسەلە هەمیشەییەکان دەکەن. بەداخەوە شەڕەناوخۆییەکان، دیکتاتۆرییەت، چەوساندنەوە، سەرکوتکاری، ئانارشیزمی سیاسی، نامۆبوون و خراپ کەڵك وەرگرتن لە دەسەلات، تایبەت بە هیچ سەردەمێکی مێژوویی نین و هەمیشە ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە کۆمەڵگا سەقامگرتوو و ئازاد و داهێنەرەکان رووبەڕووی ئەو مەترسییانە ببنەوە. ئەڵبەتە هەندێ جار تەنها مەترسیگەلێکی ساتەوەختین و هەندێ جاریش

بە دەگمەن ڕوو ئەدەن. کەواتە بیروڕاکانی ئەو تیۆرسێنانەی کە پێشتر ئەو مەترسییانەیان تاقی کردوونەتەوەو لێکۆڵینەوەشیان لەسەر کردوون، بۆ ئێمە گرنگییەکی زۆری هەیە. هەروەها وێنا سەرلەنوێ بنیاتنراوەکەی ژیانی سیاسی، کە لەو مەسەلانەشی تێ دەپەڕێنێ، ئێستاش هەمان تازەیی و بایەخی سەردەمی نووسینەکەی پاراستووە.

## وتاری پێنجەم

# ڕێگەچارە

فەیلەسوفە هاوچەرخەکان، قسەوباسی زۆریان کردووە لەسەر "قەڵشتی لۆژیکی" نێوان "ئەوەی کە هەیە" و "ئەوەی کە دەبێ ببێت". هەروەك ئەو فەیلەسوفانە جەختیان لەسەر کردووە، ڕستەیەك کە لە "بەشێوەی خەرمان بەسەراکردن" بەیان دەکرێ - "تۆ دەبێ ئەوکارە بکەیت" - لەڕووی لۆژیکیەوە ناتوانێت لە بەرایی‌گەلێك هەڵێنجێنرێت کە لە "بەشێوەی هەوڵدان"دا - "ئەم مەسەلەیە هەروایە" - بەیان بکرێت. تەنانەت ئەگەر هەموو ڕستە "هەواڵیی"یەکانیش بخەینە سەریەك، ناتوانین هیچ ڕێگەچارەیەکیان لێوەدەست بێنین.

دێڤد هیوٚم لە کتێبی "نامیلکەیەك سەبارەت بە پێکهاتەی مرۆڤ"دا نموونەیەکی کلاسیك بۆ جیاوازی نێوان "ئەوەی کە هەیە" و "ئەوەی کە دەبێ ببێت" دێنێتەوەو دەڵێ: هەمیشە ئەوەم وتووە کە لەهەموو ئەو سیستمە ئاکارییانەی کە تا ئێستا بینیومن، نووسەر تا ماوەیەك بەشێوەیەکی ئاسایی و لۆژیکی

بەدوای مەسەلەکاندا دەچێ، بۆ نموونە بوونی‌خوا دەسەلمێنێ، یان سەبارەت بە مەسەلە مرۆڤییەکان، بیروڕای خۆی دەرئەبڕێت. بەڵام کاتێك کە جگە لە مەسەلەگەلێکی پێوەندیدار بە "هەیە" و "نییە" هیچ مەسەلەیەکی دیکە شك نابەم کە پێوەندییان بە "دەبێ" و "نابێ"وە هەبێت، تەواو سەرمسوورِ دەمێنێ. ئەم گۆڕانە قابیلی دەرکپێکردن نییە، بەڵام هەندێ دەرەنجامی لێدەکەوێتەوە. چونکە ئەم "دەبێ" و "نابێ"یە، ئاماژە بە باوەڕ پێکردن یان پێوەندییەکی تازەدەکات. زۆر پێویستە کە ئەم مەسەلەیە بخرێتەبەر راڤەو شیکردنەوەو، هۆی تێنەگەیشتن لە هەندێ لە مەسەلەکان روون بکرێتەوەو باس لەوەش بکرێت کە چۆن دەتوانین پێوەندییەکی تازە لە پێوەندییەکانی ترەوە هەڵێنجێنین، پێوەندی‌گەلێك کە تەواو جیاوازییان لەگەڵیدا هەیە.

## تەجویزکردنی حەقیقەتەکان وەك رێگەچارە

ئەڵبەتە تێڕوانینەکانی هیوٚم، لە واتا بەرتەسك و لۆژیکییەکانیاندا، هیچ ئاوارتەیەك هەڵناگرن. ناتوانین لە دەسپێکی "دەبێ"وە بەدەرەنجامی "هەیە" بگەین. بەڵام تەنها پشت بەستن بەو قسەیە، شتێکی تەواو گومراکەرە. قەڵشتی نێوان "ئەوەی کە هەیە" و "ئەوەی کە دەبێ ببێت" یەکێك لە ئاسایی ترین حەقیقەتەکانی ژیان" واتە ئەو کاریگەرییە گەورەیەی کە واقعییەتی جیهان لەسەر خەڵکی دادەنێ، ئەگۆڕێت

بەدیاردەیەکی "نهێنی ئاسا" و پڕ لە ڕەمزو نهێنی. مرۆڤ بە تەواوەتی بە پێی ئەو تێڕوانینە ڕەفتار دەکا کە لەسەر واقعییەتەکان هەیەتی. هەروەها بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی هۆی ئەنجامدانی هەموو کارەکانی، ئاماژە بە حەقیقەتەکانی پێوەندیدار بە جیهانەوە دەکات. تەنها مرۆڤێکی بێ مێشك و نەفام لە بۆشاییدا، پاساو بۆ کردەوە ئاکارییەکانی دێنێتەوە. کاتێ کەسێك ئەمرێکمان بەسەرا ئەکات و داوایەکمان لێ‌ئەکات، ئێمەش پرسیار لە هۆیەکەی ئەکەین. ئەو وەڵامانەش کە دەدرێنەوە، دەبێ لەسەر بنەمای واقعییەتەکان ڕاوەستابن. بۆ نموونە "لەسەر ئەو هێڵی ئاسنە هەستە!". "بۆچی؟". "چونکە ئێستا شەمەندەفەری پێدا دەڕوا". ئەو ڕوونکردنەوانەی کە لە واقعییەتەکانی ژیانەوە سەرچاوە بگرن، جێبەجێ کردنی هەموو ئەمرو داواکارییەك مسوٚگەردەکەن و لەگەڵ ئەوەشدا مانایان پێ دەبەخشن. بە بێ‌پشت بەستن بەواقعییەتەکان، ڕستە "داخوازیەکان"یەکان هیچ مانایەکیان نابێت و ناعەقڵانیش دەنوێنن. بۆ نموونە، "لەسەر ئەو هێڵی ئاسنە هەستە!". "بۆچی؟". "چونکە من دەڵێم!". "تۆ کێیت؟" تەنها لە جیهانی دەسکردی زەینی کەسانی وەك لویس کارۆڵ و فرانتس کافکادا، خستنەڕووی ڕێگەچارەکان، پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە و ڕوونکردنەوە نییە. لەو دنیا واقعییەدا کە خەڵکی تیادەژی،

ئەگەر هەموو شتێك ئاقڵانە بێت، ڕێگەچارە پێشنیار کراوەکان دەبێ لەسەر بناغەی حەقیقەتەوە دامەزرابن.

تەنانەت سادەترین ڕستەش سەبارەت بە حەقیقەتەکان، جۆرە تەجویزکردنێکی شاراوەی تیایە. بۆ نموونە کاتێ کەسێك دەڵێ "ئەوە کورسییە" لە ڕاستیدا دەیەوێ ئەو بڵێ کە ناتوانین چێشتی پێ دروست بکەین، یان لە خوا بۆی بپاڕێینەوە. ئەڵبەتە ئەو بەمانای تەواوی وشە، هەرگیز هەڵێنجانێکی لۆژیکی نییە و ناتوانین ئەوە دەرەنجامانە لەو ڕستەیەی سەرەوە وەربگرین. بەڵام ئەگەر مانای دروست و تەواوی وشەکە لەبەرچاونەگرین، ئەو هەڵێنجانە بە شتگەلێکی تەواو لۆژیکی دێنە بەرچاو. ئەمانە بەشێکن لە مانای کورسی. بە پێی ئەقڵ و لۆژیك (واتە لەرووی پێوانەییەوە) کەس ناچار نییە لەسەر کورسی دابنیشێت، بەڵام باشترین کەڵکی کورسی، هەمان ئەم دانیشتنەیە لەسەری.

بەکورتی، ئەو ڕستانەی کە حەقیقەت بەیان دەکەن، بەمانا کراوەکەی ـــ نەك مانا سنووردار و داخراوەکەی ـــ شموولی تەجویزییان هەیە، واتە ئەوانە گونجاوێتی و ڕادەی پەرچەکردارییەکان دەسنیشان دەکەن. کەسێك کە بۆیاخ لە سەگەکەی ئەدات و مێزەکەی ئەلاوێنێتەوە، بە پێی لۆژیك هیچ بە هەڵەدا نەچوە، بەڵام بێگومان کەسانی دەوروبەری، ئەو کارانەی بە هەڵە لە قەڵەم ئەدەن. ئەڵبەتە ئەگەر دەرکی بە هەڵەکانی کرد و لەگەڵ ئەوەشدا جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە لە رووی

ئاگایییەوە ئەو کارانەدەکا، دیسانەوە بە پێی لۆژیك ناتوانین کارەکانی بە هەڵە لە قەڵەم بدەین، بەڵام بێگومان دەڵێن کە تا ڕادەیەك مرۆڤێکی سەیرە.

تا ڕستەی تەوسیفی، کامڵتر و هەمەلایەنەتر بێت، شموولی تەجویزیشی زیاتر و کاریگەرتر دەبێ. تێڕوانینێکی هەمەلایەنە لەسەر جیهان، لە شێوازی داخوازیدا واتە بە شێوەی فرمان و داواکاری، یان هاندان و پاڵپێوەنانەوە دەرنابڕدرێت، بەڵام بە تەواوەتی کاریگەری لەسەر ڕەفتاری ئەو تاکانە دادەنێ کە پابەندن بە "ئاکار" و جەختیشی لەسەر دەکەنەوە. هەر بە هەمان شێوە تیۆرە سیاسییەکانیش دەرەنجامگەلێکی گرنگی تەجویزییان هەیە. کاتێ کە مرۆڤ لە واقعییەتەکانی دنیای سیاسەت تێبگات، بێگومان کاریگەری لەسەر ڕەفتارەکانی دادەنێن. کەواتە دەرەنجامەکانی پەرچەکردارییەکی ئاقڵانەو گونجاو، لە جیهانێکدا کە پێکهاتەیەکی تایبەتی هەیە، بە لایەنی "تەجویزی" تیۆرە سیاسییەکان لە قەڵەم ئەدرێن.

تێڕوانینی هەمەلایەنە لەسەر حەقیقەتەکان، لە ڕووی لۆژیکییەوە، خۆی لە خۆیدا هیچ ڕێگەچارەیەکی دیاریکراو بە دەستەوە نادات، بەڵام ڕەفتارگەلێك دێنێتە ئاراوەکە دەتوانین بە "لۆژیکی" لە قەڵەمیان بدەین. هەروەك تیۆدۆر ڕۆزاك دەڵێ:

ڕەفتاری ئێمە لە ڕاستیدا ڕەنگدانەوەیەکی گشتیی تێڕوانینمانە لەسەر خۆمان و پێگەی خۆمان لە جیهانی

دەوروبەرمان. رەنگە ئەو تێڕوانینە لای ئێمە، لە ناو وشەکاندا ون بێت و رەنگە هەرگیز راستەوخۆش سەرنجی نەدەینێ. ئەم جیهانبینییە کە هەمیشە تێگەیشتن، یان هەل و مەرج و ...یلەکانمان تەعدیل و کۆنترۆڵ دەکەن، رەنگە بۆ هەمیشە لە ...ناغی نیمەخودئاگادا بمێنێتەوە. ئەم جیهانبینییە پێش ئەوەی ...نماییمان بکات بۆ دەستنیشان کردنی چاکەو خراپە، ناچارمان ...ەکاحەقیقەت لە ناحەقیقەت، دروستی لە نادروستی و مانادار لە بێ‌مانا جیا بکەینەوە. پێش ئەوەی دەس بەهەر کارێك بکەین، دەبێ تێڕوانینێکمان لەسەر جیهان هەبێت و رەفتارەکانیشمان لەگەڵ ئەو مۆدێلە ماناداره‌دا بگونجێنین.

## پێوەندی نێوان "هەیە" و "دەبێ"

پێوەندی نهێنی و نهێنئامێزی نێوان "هەیە" و "دەبێ"، واتە نێوان وەسف کردنی جیهان و رێگەچارەکان، پێوەندییەکی نە نهێنییەو نە سڕئاسا. یەکێك لەم پێوەندییانە، "پرەنسیپی واقعییەت"ەو ئەوی دیکەشیان هێزی "ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ"ە.

"پرەنسیپی واقعییەت" ناچارمان دەکا رەفتارێکی ریالیستی لە خۆوە پیشان بدەین. هەروەها هانمان ئەدا کە کردەوەکانمان لەسەر بناغەی تێگەیشتنی واقیعی و ئاشکرای جیهانی دەوروبەر ــ نەك بەو شێوەیەی کە رەنگە هەبێت، یان بەو

شێوەیەی کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە ــ دابمەزرێنین. ئەو رەفتارانەی کە پرەنسیپی واقعییەت بەسەریاندا زاڵە، دەبێ جیاوازی قایل بن لە نێوان خەون و خەیاڵ و، ئیمکانات و حەقیقەتە ڕەسەنەکاندا. رەفتارێکی لەو جۆرە، ئەوەی پێقبووڵ ناکرێ کە هەسارەی مانگ لە پەنیر سازکراوە، یان کۆلکەزێڕینە لە گوڵدانێکی پڕ لە زێڕدا گەشە دەکا و گەورە دەبێ.

هێزی "ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ" لەراستیدا، دەرەنجامێکی سادەی رەفتارە پۆزەتیڤەکانی مرۆڤەکانە. مرۆڤ "لە رووی لۆژیکییەوە" دەتوانێ خوازیاری شەڕ و ئاژاوە و ئێش و ئازار و دیکتاتۆرییەت و رووخاندن بێت. بەڵام لە حاڵەتی نۆرماتیڤدا، مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی رێکخراوی، شادی، ئازادی و سەرکەوتن، خۆی رووبەڕووی ئەو مەترسییانە ناکاتەوە. بەمجۆرە ئەگەر بە کەسێکی سەر دووڕیانێك بڵێن رێگەی یەکەم بەرەو سەرکەوتن دەچێ و رێگەی دووهەم بەرەو تیاچوون، لە راستیدا هیچ پێشنیارێکی تایبەت ئاراستەنەکراوە. واتە هیچ تەجویزێك نەکراوە. ئێوە پێتان وتووە کە "دەبێ" یەکێك لەو دوو رێگەیە هەڵبژێریت و ئەگەر کەسێکی ئاقڵ و زانا بێت و قسەکەی ئێوە قبووڵ بکات، رێگەیسەرکەوتن هەڵئەبژێرێت.

بە هۆی تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی مرۆڤ و هەروەها نۆرماتیڤ بوونی ئارەزووەکانیەوە، تەنانەت ئەگەر تیۆرسێنیك بە شێوەی تەجویزیش قسەنەکات، دیسانەوە قسەکانی

کاریگەرییەکی تەجویزییان دەبێت. واتە پێویست ناکات تیۆرسێن، بەفەرمان پێکردن خوێنەران ناچار بکات بەشێوەیەکی تەجویزی، لە تێگەیشتنەکانی ئەو لەسەر سیاسەت، تێبگەن. ئەو تەنها دەبێ مەسەلەکان وەك چۆنن، ئاوا باسیان لێبکات و پاشان ئارەزووە سروشتییەکانی بەردەنگ (مخاطب) خۆی، وای لێ دەکەن بە شێوەی تەجویزی تێیان بگات.

تیۆرە سیاسییەکان تاڕادەیەك وەك نەخشەگەلی دەریاوانەکانی ئەوسا وان، کە لە پەراوێزەکانیاندا دەنووسرا "لێرەدا ئەژدیها هەیە"، یان ئەوەیان پیشان ئەدا کە زەوییە تەختەکان لە کوێدا کۆتاییان دێت. لە هیچ کام لەو نەخشانەدا نەنووسرا بوو کە "لێرەدا مەچنە ژوورەوە!"، یان " هەڵێن!". تەنها مەلەوانێك کە لەگیانی خۆی بێزار بوایە، دەڕۆشتە ئەو شوێنەی کە لێی نووسراوە "لێرەدا ئەژدیها هەیە".

هۆبس کە دڵنیا بوو لەکاریگەری دانانی تیۆرە سیاسییەکەی، بەتەواوەتی دەرکی بەو مەسەلەیە کردبوو. مرۆڤ حەزناکات تووشی کێشەو شەڕە ناوخۆییەکان ببێت، بەڵام چ بیەوێت و چ نەیەوێت، ئەو کێشانە روودەدەن، چونکە خەڵك هۆکارەکانی شەڕو ئاشتی ناناسن. ئەگەر مرۆڤ چییەتی تیۆرە سیاسییەکان ـــ واتە تیۆرەکەی هۆبس ـــ دەرك بکات، حکوومەتێکی بەدەسەڵات دادەمەزرێنێ و لە رێگایەوە تاکەکان لەو مەترسییانە رزگار دەکا. لەو حاڵەتەدا کەس ناچارنییە

فەرمان بەسەر خەڵکدا بکات، یان گاڵتەیان پێ بکات، بەڵکوو فێرکارییەکانی زانستی سیاسەت، بە پێی ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ، ئەو کارە ئەنجام ئەدات. بەوتەی هۆبس: هەرکە مرۆڤ لەمەڕ ئەو بارودۆخە نالەبارەی کەتیایدا دەژی، زانیاری و ئاگایی تەواوی بە دەستهێنا، چییەتی هەمان ئەو بارودۆخە ناچاری دەکا خوازیاری ئەوە بێت کە لەو هەلومەرجە خراپ و نالەبارە رزگاری بێت.

ئەڵبەتە ئەوە راستە ئەگەر بوترێت هۆبس، هەندێ تایبەتمەندی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەو زیاتر لە فەیلەسوفەکانی تر باوەڕی هەبوو بە پێوەندی نێوان ئەو شتانەی کە مرۆڤ بۆ جێبەجێ کردنی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان "ئەنجام ئەدات"و، ئەو شتانەی کە "دەبێ" بە قازانجی بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگا ئەنجام بدات. کەواتە هۆبس بە تەواوەتی جەختی دەکردەوە لەسەر پێوەندی نێوان ئەوەی کە "هەیە" و ئەوەی کە "دەبێ ببێت"، ئەوانەش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بابەتێکی تەواو ئاشکرایە کە ئەگەر مرۆڤ، بەهەمان شێوەی هۆبس لە سیاسەت تێبگات، رەنگە هەڵسوکەوت و رەفتارەکانیشی شێوەی ئەوانەی هۆبس بەخۆوەبگرن. بە هەرحاڵ رێگەچارە عەقڵانییەکان بە تەواوەتی

دەچنە ژێر کاریگەریێتی ئەو تێڕوانینەی کە لەسەر حەقیقەتەکان هەیەتی.

لەسەر هەمان پێودانگ، ئەگەر مرۆڤ بە شێوەی ئیدمۆند برێك لە سیاسەت تێبگات و ئەگەریش وەك جۆن لۆك لە کۆمەڵگا تێبگات، بێ گومان دەبێتە کەسێکی لیبراڵ ئەندیش و لیبراڵ بیردەکاتەوە. هەروەها ئەگەر وەك مارکس دەرك بە کۆمەڵگا بکات، بێگومان هەوڵ ئەدات بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ناچینایەتی. (لە راستیدا، نموونە مێژووییەکان لەم بوارەدا پێچەوانەی بیروڕاکانی مارکسیان سەلماندووە کە دەڵێ باوەڕە سیاسییەکانی خەڵکیش چینایەتین.بەگشتی، رێبەرانی بزاڤی مارکسیستی لە چینی پرۆلیتاریاو بە بیانووی بەرژەوەندییە چینایەتییەکانەوە رانەپەڕیون بەڵکوو رۆشنبیرانێکی بۆرژوابوون کە بە هۆی جیهانبینی و باوەڕەکانی مارکسەوە بەو رێگەیەدا رۆیشتن). بە هەرحاڵ ئەو نموونانەی کە باسمان کردن، ئەوە پیشان ئەدەن کەتێڕوانینی هەمەلایەنەی سیاسی، کاریگەرییەکی هەمەلایەنەش لەسەر رەفتار و کردەوە حەقیقی و ئاقڵانەکان دادەنێت.

ئەگەر جیهان ئەو شتە بێت کە تیۆرسێنەکان (چ فەیلەسوف بن یاخود خەڵکی ئاسایی) تەسەوری دەکەن، کەواتەهەندێ، لە رەفتارەکان دەبێ بە شتگەلێکی "نائاسایی" لە قەڵەم بدرێن بە واتایەکی تر هەندێ رەفتاری مرۆڤەکان ـ تەنانەت هەندێ لە

ڕەفتارە جیهانییەکانیان ــ هەرگیز بەکەڵکی چارەسەرکردنی کێشەو گرفتە سیاسییەکان نایەن. ئەوەش بەو مانایە نییە کە هەندێك لە ڕەفتارەکان ـ بە مانا ئاکاری و سنووردارەکەی وشە ــ نادروست بن، بەڵکوو پێوەندییان بە بوارە کۆمەڵایەتییەکانەوە نییە و یەك ناگرنەوە و لەگەڵ یەکدا ناگونجێن. ئەوانە لەو ڕووەوە نادروستن کە بۆ نموونە کەسێك ئەو هەواڵەی پێ بگات کە منداڵەکەی لە کارەساتی ئۆتۆمبێلدا بریندار بوە، یان کوژراوە، لەجیاتی ئەوەی کە بگری، بە پێچەوانەوە پێ بکەنی" یان کاتێك سڵاوو چاكوخۆشی لەگەڵ کەسێکدا بکەن، لە جیاتی وەڵامدانەوە جنێوی بداتێ. لەو جۆرە حاڵەتانەدا مرۆڤ وا تەسەور دەکا کە ئەو کەسە، یان لە قسەکە تێ نەگەییوەو بەهەڵە وەریگرتووە، یان بەڕاستی کەسێکی گەمژەو نەفامە.

ئەگەر بەهەمان شێوەی کە (برێك) دەیگوت، کۆمەڵگا سیاسییەکان لە بنەڕەتدا سیستمگەلێکی ئەندامی ئاسابن، کەواتە ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کە بە شتگەلێکی دەسکرد و میکانیکی لە قەڵەمیان بدەین، هەروەها بە پێی قسەکانی ئەو، ئەگەر مرۆڤەکان بوونەوەرگەلێکی کۆمەڵایەتین کە بە هۆی نەریت و سۆزو عاتیفە پێکەوە دەبەسرێنەوە و یەك دەگرنەوە، هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر بە بوونەوەرگەلێکیان لە قەڵەم بدەین کە لەرووی لۆژیکییەوە بە تەنها بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانی خۆیان ڕەچاودەکەن.

هەروەها بەپێی قسەکانی ئەفلاتوون، ئەگەر دادپەروەری گەورەترین تایبەتمەندی رۆح بێت، هەوڵدانی "ناپلیۆنی" بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، پەرچەکردارییەکی تەواو نادروستە لە بەرانبەر تایبەتمەندییەکانی مرۆڤدا. ئەو کەسانەی کە ئامانجیان بەدەستهێنانی بەختەوەرییە، دەبێ بێهێزترین فەیلەسوفیان بەلاوە پەسەندتر بێت، نەك بەهێزترین و دەوڵەمەندترین دیکتاتۆری جیهان چونکە لەدواراڤەکاریدا بەو دەرەنجامە دەگەین کەمرۆڤی دادپەروەر، بەختەوەرترین کەسە. ئەفلاتوون دەیگوت مرۆڤی دیکتاتۆر هەر ئەوانی‌تر لەناو نابات ، بەڵکوو لە ئاکامدا خۆیشی لەناو دەبات. تەنانەت ئەگەر بەدەست ئەوانی تر لەناونەچێت، بەهۆی تەماحی دەسەڵاتخوازییەکەیەوە تیادەچێ. چارەنووسی حەتمی و نەگۆڕی دیکتاتۆر ئەوەیە کە، یان بەدەست دوژمنانی لە ناو بچێت، یان بە هۆی بەدەستهێنانی لەڕادەبەدەری دەسەڵاتەوە، ببێتە گورگێکی دڕندە.

کەواتە ئەگەر کەسێك لە روانگەی مارکسەوە لە جیهان بڕوانێت، ئیدی داکۆکی‌کردنی لە سیستمی سەرمایەداری، بەشتێکی ناعەقڵانی دێتە بەرچاو. ئەگەر بیروباوەڕەکانی مارکس سەبارەت بە سروشت و پێکهاتەی سیستمی سیاسی بۆرژوازی دروست بن، لەو حاڵەتەدا تەنها مرۆڤگەلی "ناواقیع گەرا" و "نائاسایی" داکۆکی لە سیستمێکی وا دەکەن. تەنها کەسێکی "ماسۆشی" و شێت لە بەرانبەر ئەو نامۆبوون و

چەوساندنەوانەدا چۆك دائەدات کە مارکس بەدەرەنجامی حەتمی سیستمی سەرمایەدارییان لە قەڵەم ئەدات. ئەڵبەتە رەنگە سەرمایەدارێکیش بەدی بکرێت کە دان بەحەقانییەتی قسەکانی مارکسدا بنێت، بەڵام بەو حاڵەشەوە لەبەرخاتری بەرچاوتەنگیو پاراستنی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانی، وەك کۆنەپەرستێك دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا قسە و تیۆرەکانی مارکس، زیانگەلێکی رۆحی زۆریان لێ دەکەوێتەوە. بۆ نموونە سەرمایەدارێکی لەو جۆرە، دەبێ وێڕای وێناکردنێکی ناشیرین لەسەرخۆی، درێژە بە ژیان بدات. هەروەها ناچارە خۆی بە بوونەوەرێکی چەوسێنەرو زاڵم تەسەور بکات کە کەوتۆتە داوی "تەلیسمی کالا"وە. زۆرن ئەو کەسانەی کە ناتوانن ئەو هەموو پێکادانی باوڕو رەفتارانە تەحەمول بکەن.

کەواتە قەڵشتی نێوان "ئەوەی کە هەیە" و "ئەوەی کە دەبێ ببێ" تاڕادەیەك پڕ دەبێتەوە. چونکە "ئەوەی کە دەبێ ببێ" هیچ کات بەرهەمی زەینی و سەرەڕۆیانەی کەسێکی تایبەت نییە. مرۆڤ لەبەر ئەوەی کە مەیل و سۆز و عاتیفەگەلی نۆرماتیڤیشی هەیە، ئەوە دەزانێت کە لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حەقیقەتەکاندا چ پەرچەکردارییەکی تایبەتی هەبێت. ئەو مرۆڤە ئاساییەی کە لە دنیای (برێك)دا دەژی کاردانەوەکانیشی لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رووداوە سیاسییەکاندا، جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی کە لە دنیای مارکسدا دەژی.

## ئاڵۆزی زانیارییەکان ( data )

ئەگەر بە پێی قسەکانی هیوم ئیختیاری "ئەوەی دەبێ ببێت" لە دەس خودی تاکەکاندا نەبێ، کەواتە "ئەوەی کە هەیە"ش ناتوانێت سادە و تەواو ئاشکرا بێت. تێڕوانینی "گشتی" لەسەرسیستەمی سیاسی، هەرگیز سەروکاری لەگەڵ هۆکارەکاندا نییە. ئەوانە دەبێ هەمیشە داوەرییان لەسەر بکرێت و هەڵبسەنگێنرێن. دەستنیشانکردنیهەندێ لە حەقیقەتە سادە و سنووردارەکان کارێکی سەخت نییە. (بۆ نموونە حەقیقەتێکی وەك ئەوەی کە ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی سەنای ئەمریکا ١٠٠ کەسە.) بەڵام تێگەیشتنی کامڵ و هەمەلایەنەی سیاسەت، کارێکی یەکجار قورس و ئاڵۆزە.

وێنا کردنێکی کامڵی "ئەوەی کە هەیە" بە تایبەت لە بواری سیاسەتدا، دەبێ لەخۆگری "قابلییەتەکان، ئیمکانات و زەروورەتەکان و هەروەها حەقیقەتەکان" بێت. هەرکام لەم رەهەندانە، سەبارەت بە حەقیقەتی جیهان، لەسەر ئەو کردەوانەی مرۆڤ کە بەرەفتارگەلی سیاسی عەقلانی ناودێر ئەکرێن، کاریگەرییەکی یەکجار زۆر دادەنێن. هەر کام لەم رەهەندانە دەورێکی گرنگ لە تیۆرە سیاسییە عەقلانییەکاندا دەبینن. لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ناتوانین بە هۆی بەڵگەگەلێکی سادەوە بیانسەلمێنین. ئەڵبەتە دەتوانین لە چەندین روانگەی

جۆراوجۆرەوە باس لە رۆڵی تایبەتی ئیمکانات و حەقیقەتەکان و زەروورەتەکان بکەین.

پێشبینیکردنی رووداوکان لە کاتێکدا مومکین دەبێ کە پێشتر شتی وا رووی دابێت و لەو حاڵەتەشدا "ئەگەرەکان" ئیدی هیچ مانایەکیان نابێت. ئەگەر گەلاڵەیەك نەخرێتە بواری جیبەجێ کردنەوە، لە دوو لایەنەوە قابیلی باس کردنە: یان جێبەجێ کردنی نامومکینە، یان پێشتر قەت تاقی نەکراوەتەوە. هەندێ کەس دەڵێن مەسیحییەت تاقیکراوەتەوەو سەلمێندراوە کە کەموکوڕی زۆری هەیە. دەستەیەکی سێهەمیش دەڵێن تاقی کردنەوەی لە توانادا نییە. دەستەیەکی تریش دەڵێن سەرەڕای لایەنە چاکەکانیشی، هێنانەئارای کۆمەڵگایەکی لەو جۆرە قەت مومکین نییە.

سەبارەت بە زەروورەتەکان، مرۆڤ ئەوە دەزانێ کە هەمیشە "ئەلف" و "ب" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. بەلام بە پێی قسەکانی هیوم "ئەلف" و "ب" هەمیشە پێکەوە بەستراونەتەوەو ئەو پێکەوە بەسترانەوەشیان بە هۆی زەروورەتەوە نەبوە. ناتوانین هۆکارەکان ببینین، بەڵکوو دەتوانین پشتیان پێبەستین و وەك بەڵگە کەڵکیان لێوەربگرین. بۆ نموونە تاقیکارییە تاکەکەسییەکان ئەوەیان دەرخستووە کە لەهەر کۆمەڵگایەکدا نەزم و یاسا بەرقەرار بێت، بێگومان لەوێدا حکوومەتێکی بەهێز ئامادەیی هەیە. بەلام بەڕاستی ناتوانین لافی ئەوە لێ بدەین کە

حکوومەتی بەهێز و نەزم و یاسا "وەك پێویست" تەواوکەری (لازم و ملزوم) یەکدین.

رەنگە مرۆڤ تاڕادەیەکی زۆر دڵنیابێت لەوەی کە دەتوانێ جیاوازی قایل بێت لە نێوان شتە سروشتییەکان و خەون و خەیاڵەکاندا، کە چی هەرگیز ناتوانێ بە دڵنیاییەوە بیروڕاکانی دەرببڕێت. هەندێ جار خەیاڵ وەك حەقیقەت دێتە بەرچاو. بۆ نموونە تراویلکە بۆ کەسێکی تینوو لە بیابانێکی بێئاودا، بە تەواوەتی وەك ئاو دێتە بەرچاو.

کاریگەرێتی پێشنیارکردنی ئەم رێگەچارانە، کە ئایا بەشێکن لە ئیمکانات و ئەگەرەکان، یان حەقیقەتەکان، دەبێ تا ئێستا بۆمان روون بووبێتەوە. وەك چۆن هەمیشە دەگوترێت "خواستن، توانینی بە دواوەیە". زۆر بەجێیە ئەگەر کەسێك داوامان لێ بکات لە پەنجەرەوە باز بدەینە خوارێ، بەشێتی لە قەڵەم بدەین. لە رووی لۆژیکییەوە کەس داوای شتێکی نەشیاو لەکەس ناکات. ئەگەر کەسێك داوا لە خزمەتچی رستۆرانێك بکات کە گێلاسێك شەرابی بێ ئەلکولی بۆ بێنێت، بێگومان خزمەتچییەکە تووشی سەرسووڕمان دەبێ. بڕیاردانێکی دروست هەمیشە دەبێ جیاوازی لە نێوان حەقیقەتەکان و شتە رووکەشەکاندا قایل بێت. "لەسەر سەهۆڵدا ڕێ مەکەن، چونکە راستە کە بە رواڵەت ئەستوور دێتە بەرچاو، بەڵام تەواو ناسکە".

زۆربەی ناکۆکییە هەرە گرنگەکان لەسەر بابەتی تەجویزکردن لە تیۆرە سیاسییەکاندا، بە هۆی ئەو مەسەلانەوە، پێوەندییان بە مەسەلە حەقیقییەکانەوە هەیە.

## ئاسۆی توانایییەکان

سەرەتا سەرنج بدەنە بابەتی تواناییەکانی مرۆڤ. ئەم پرسیارە کە خەڵك "بالقوە" چین؟ وە کاتێکیش کە گەشەونەشە دەکەن و گەورە دەبن، دەبن بەچی؟ پرسیارێکە سەبارەت بە حەقیقەت و سروشتی مرۆڤ. ئەم پرسیارە، مەسەلەیەکی بە تەنها زەینی و سەلیقەیی و تاکەکەسی نییە. بەڵام هەروەك پێشتریش باسمان کرد، داوەری کردن لە بارەیەوە کارێکی ئاسان نییە و لە راستیشدا بە تەواوەتی دەرك کردنی سروشتی مرۆڤ، یەکجار سەخت و دژوارە. ئەوەی کەئایا مشوورخواردنێکی تەجویزی، شتێکی عەقڵانییە، یان نا، ـواتە ئایا کاردانەوەیەکی باشە لە بەرانبەر مەسەلەی بەرباسدا؟ ـ زۆربەی کات راستەوخۆ پێوەندی بە وەڵامی ئەم پرسیارەوە هەیە.

ئایا خەڵك "بالقوە" بوونەوەرگەلێکی شاد و خۆشەویست و لەبەردڵان و دلۆڤان و کۆمەڵایەتین؟ ئەگەر ئاوا بێت، کەواتە ئەوخەڵکە زۆرەی کە ناڕازی و ناکۆمەڵایەتی و ناحەز و ناخۆشەویستن، دەرەنجامی ژینگەی کۆمەڵایەتی و دەزگا سیاسییەکانن. کەواتە ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو کەسانەی کە

گرنگیی زۆری هەیە، بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کە هەوڵ بدەن ئەو دەزگاگەلە بڕووخێنن و لە ناویان بەرن.

یان بە پێچەوانەوە، خەڵك " بـالـقـوّ ه " بوونەوەرگەلێکی تاوانکارو دەس درێژی کەرو دیکتاتۆرن؟ ئەگەر ئاوا بێت، کەواتە پێشینەی پێکهاتە سیاسییەکان، بە باشتر و بە کەڵکتر دێنە بەرچاو. راستە ئەوانە نەیانتوانیوە بە تەواوەتی ئاشتی و ئازادی مرۆڤ دابینبکەن بەڵام دەبیٚ ئەوەشمان لەبەرچاو بێت کە کەرەسە خاوەکانیان (واتە سروشتی مرۆڤ) کەم و کوڕی زۆریان هەبوە. بەسەرنجدان بە ئارەزووە سروشتییەکان و ناڕێكبوونی مرۆڤ و هەروەها ئەم حەقیقەتە کە ئەم دەزگاگەلە، ڕێیان لە کوشتنی مرۆڤەکان لە لایەن یەکدییەوە گرتووە، سەرکەوتنگەلێکی باشیان بەدەستهێناوە. کەواتە باشترین ڕێگەچارە ئەوەیە کە هێزەکانی "نەزم و یاسا" بە هێزتر بکرێن وەك لەوەی لاوازتر و بیٚهێزتر بکرێن.

بە لەبەرچاو گرتنی دەرەنجامەکانی تێڕوانینی مرۆڤ لەسەر هێزە " بالقوّە"کانی مرۆڤ، دەتوانین هێزە سیاسییەکان بە ئامرازێك لە قەڵەم بدەین بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی و ئاسایش، یان ڕێگرێك لە بەردەم گەشەسەندن دا.

## سنووردار بوونی ئیمکاناتەکان

زۆربەی کات تێگەیشتن لە قابلییەتەکانی مرۆڤ، پێوەندی هەیە لەگەڵ داوەری کردن لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە لە پانتایی سیاسەتدا بواری رەخسانیان هەیە. کەواتە هەڵسەنگاندنی دروستی ئاسۆی ئیمکاناتەکان لە سیاسەتدا بەئاشکرا گرنگیی‌یەکی زۆری هەیە بۆ رێگەچارە سیاسییە گرنگ و چارەنووس سازەکان. ئەگەر بمانەوێ نموونەیەکی گونجاو سەبارەت بە قابلییەتی مرۆڤ کە تەجویزیش بن بهێنینەوە، دەبێ ئاماژە بۆ بیروڕا لێکجیاوازەکانی مارکس و فرۆید بکەین کە سەبارەتن بە پێکهێنانی کۆمەڵگای ناچینایەتی. بەڕای مارکس پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی لەوجۆرە نەك تەنها لە تواناداییە بەڵکوو حەتمیشە و ئیختیاریشی لەدەس کەسدانییە. قابلییەتەکانی مرۆڤ بۆ پێك هێنانی کۆمەڵگایەکی پڕ لە ئاشتی و ئازادی و دادپەروەری لە مێژوودا دەس بەکاردەبن و ئەو کۆمەڵگایە دێننە ئاراوە. مرۆڤ ئیختیاری ئەوەی هەیە، یان سواری قەتاری مێژوو بێت، یان لە ژێر تایەکانی‌دا پان ببێتەوە. هەڵبژاردنی رێگەی یەکەم، باشترین و عەقڵانی‌ترین رێگەیە، بە تایبەت کە مێژوو نەك تەنها لە چالاکی ناکەوێ بەڵکوو چالاکییەکەشی هەم لۆژیکی و مرۆڤییە و هەمیش رزگارکەرە. فرۆید هەموو ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی‌تر دەبینێ. بە پێی تێڕوانینی ئەو لە سەر سروشتی

مرۆڤ، ئارەزووی مارکس بۆ پێك هێنانی کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی لە خەیاڵێکی بێهوودە زیاتر هیچ شتێکی تر نییە. فرۆید پێی وایە کە سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەکە کە بەدیهاتنی ئەو تێڕوانینە یۆتۆپیاییە نامومکین دەکا. شەڕاشۆیی کە قەت بنەبڕیش نابێت و هەروەها خۆپەرستی و دەسەڵاتخوازی لە سروشتی مرۆڤدا، مۆڵەت بە کارێکی وا نادەن. کەواتە، لە قۆناغی تەجویزی دا، باوەڕەکانی فرۆید بە تەواوەتی سیاسەتەکەی مارکس تێك دەشکێنن. ئەگەر هەڵسەنگاندنەکەی ئەو لەسەر قابلییەتە مرۆییەکان دروست بێت، کەواتەهەوڵدان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی کارێکی یەکجار بێهوودەیەو لەو حاڵەتەدا بەڕاستی مرۆڤ بە ئامانجە دڵخوازەکانی ناگات. شتی وا هەرگیز لە توانادا نییە. وەرچەرخانی ئیجباری و کتوپڕی مێژوو بەرەو ئاقارێك کە ئەو بیروڕا ئامانج خوازانە دەستنیشانی دەکەن، دەرەنجامگەلێکی پڕ لەکارەساتی لێدەکەوێتەوە.

ئەرستۆ چەندین سەدە لەمەوپێش، بەلۆژیکێکی لەو چەشنەوە، بیروڕاکانی ئەفلاتوونی سەبارەت بە کۆمەڵگای یەکگرتوو و سۆسیالیستی خستۆتە بەر ڕەخنەوە. بە چاوپۆشی کردن لەو قەڵشتە فەلسەفییەی کە ئەفلاتوون و مارکس لێك جیادەکاتەوە، ئەویش دامەزراندنی کۆمەڵگای سۆسیالیستی ــ لانی کەم بۆ چینی پارێزەری (پاسەوانان) کۆمەڵگا ــ پێشنیار

کرد. ئەفلاتوون بۆ ئەوەی رێ لە ناکۆکی نێوان پارێزەران ـ واتە نوخبە حاکمە فەیلەسوفەکان ـ بگیردرێت، لە موڵکایەتی تاکەکەسی بێبەشی کردن. بەڵام بەڕای ئەرستۆ ئەو کۆمەڵگا یۆتۆپیاییەی کە لە کتێبی کۆماردا خراوەتەڕوو، هەرگیز ناتوانرێ بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە. هەروەها لەو باوەڕەدا بوو کە ئەفلاتوون (وەك چۆن فرۆید پێی وابوو مارکس بە هەڵەداچوە) لەو رووەوە کە پشێوییە سیاسییەکانی بەدەرەنجامی نەبوونی کۆمۆنیزم لە قەڵەم ئەدا، تەواو بە هەڵەدا چوە. چونکە سەرچاوەی هەموو ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ فیترەتی ناپاکی مرۆڤ بەگشتی.

کەواتە تاڕادەیەك بەهۆی دەستنیشانکردنی نادروستی هۆکارەکانەوە بوو کە ئەفلاتوون ئەو ئامانجە سیاسییە ناممکینەی خستۆتەڕوو. ئەرستۆ بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو کۆمەڵگا یۆتۆپیاییەی ئەفلاتوون، قەت بواری هاتنە ئارای بۆ نەدەڕەخسا، چونکە وەها کۆمەڵگایەك نە یەك پارچەیەو نە یەککگرتوو. هەروەها بەسەرنجدان لە سروشتی مرۆڤ، شتێکی وا هەرگیز لە تواناکدا نییە. کۆمەڵگاکەی ئەفلاتون سەرەنجام: ١ـ یان هەموو خراپییەکان و ناشیرینییەکانی کۆمەڵگایەکی سیاسی لە خۆدەگرێت، ٢ـ یان لە لایەن ئەو هاولاتییانەی کە پارێزەر (پاسەوان) نین، پەسەندناکرێ، ٣ـ یان بە ناچار دوو حکوومەتی دژبەیەك لە کۆمەڵگادا دێنە ئاراوە. تاقمی پارێزەران دەبنە

لەشـکرێکی سـەربازی و داگیرکـەر و وەرزێـران و کاسـبکاران و ئەوانی تریش دەبنە هاووڵاتی ئاسایی.

لایەنی دیکەی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە، دەبێ ئەوە روون ببێتەوە کە ئایا ئەو سیستەمە سیاسییەی کە تا ئێستا بە شتێکی نەشیاو لە قەڵەم دراوە، بەڕاستی دەتوانێ دابمەزرێت، یان نا؟ بۆنموونە جۆن لۆك لە کتێبی "نامەیەك دەبارەی لێکبوردن"دا بە شێوەیەکی تایبەتی باس لەو مەسەلەیە دەکات. لۆك دەیویست ئەوە دەربخات کە تەنها رێگەی بەدەزگایی کردنی ئەو فرە مەزهەبییەی کە هەڵقوڵاوی ریفۆرمی مەزهەبی لە مەسیحییەتدا بوو، جیاکردنەوەی مەزهەب لە سیاسەتە. شەڕو پێکدادانی نێوان گرووپە پرۆتستانەکان، کە هەریەکە و بەمەبەستی هەڵاتن لە تەعقیبە سیاسییەکان، بەدوای ئەوەوە بوون کە بەدەسەڵات بگەن لەو رێگەیە شەوە بەسەر دەزگا سیاسییەکاندا زاڵبن، کۆمەڵگای بەریتانیایان خستبوە بەردەم مەترسی هەڵوەشانەوەوە. لەورووەوە کە مەزهەبی باوی ئەو سەردەمە، ئەو سیستەمە سیاسییەی بە دروست و لەبار لە قەڵەم ئەدا کەلەسەر بناغەی مەزهەب دامەزرابێت، یان بەلانی کەمەوە لەگەڵ باوەڕە مەزهەبییەکاندا تەبا بێت، کەواتە رێگەچارەکەی لۆك بایەخێکی یەکجار کەمی پێدراو کەمتر ئاوڕی لێدرایەوە. ئەوەی کە لۆك توانی دەری بخات ئەوە بوو کە جیاکردنەوەی مەزهەب و سیاسەت و لێکبوردن لە نێوانیاندا، شتێکی نەشیاو نییە و دەتوانرێ ئەنجام بدرێت. هەروەها ئەوەشی پیشان دا کە بەم رەوشە دەتوانرێ

قەڵەمڕەوی چاودێری کردنی دەزگا سیاسی و مەزهەبییەکان لێکجیابکرێتەوە، بە بێ ئەوەی کە زیان لە مەشرووعییەتی هیچ کامیان بگات.

هێربێرت مارکۆزە بەهەمان شێوە لە کتێبی "ئەوین و شارستانییەت"دا هەوڵی ئەدا کۆمەڵگایەکی تازەی سیاسی بهێنێتە ئاراوە. ئەو پێش گریمانە گشتییەی کە فرۆید ڕاشکاوانە دەری ئەبڕی ئەوە بوو کە شارستانییەت لەسەر بناغەی "سەرکوتکاری" دامەزراوە. بەو واتایە کە خەڵك دەبێ تاڕادەیەکی زۆر ئارەزوو و حەز و داواکارییەکانیان پشت گوێ بخەن و گوێیان نەدەنێ. بەم پێیە، هیچ کۆمەڵگایەك نابێ چاودێری هاووڵاتیانی نەکات و کاری بەسەریانەوە نەبێ، چونکە داواکارییەکانی هاووڵاتیان سازشیان لەگەڵ ناکرێت و ناشتوانرێت هەر هەموویان جێبەجێ بکرێن خۆئەگەر چاودێرییان بەسەرەوە نەبێت، کۆمەڵگا هەڵدەوەشێننەوە و نابوودی ئەکەن. مارکۆزە دژایەتی ئەم بیروڕایە دەکا و دەڵێ جێبەجێ کردنی ویست و داواکارییەکانی مرۆڤی ئەمڕۆ، کارێکی یەکجار ئاسانە. سەرکەوتنە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکان، دەتوانن ئازادی و ئاسایشی تاکەکان مسۆگەر بکەن. کەواتە کۆمەڵگایەکی لەبار و سیستماتیك دەتوانێ بە تەواوەتی داواکارییە فیترییەکانی مرۆڤ جێبەجێ بکا. ئەگەر ئەو قسەیەی مارکۆزە دروست بێت، بەڕاستی قسەیەکی یەکجار گرنگە، بەڵام هێشتا کەسانێکی زۆر پێی قانع نابن.

## سنوورەکانی < زەرورەت >

لایەنی تەجویزی تیۆرە سیاسییەکان، زۆربەی کات لە داوەری کردن لەسەر شتە زەروورییەکان، یان شتە حەتمییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. وەك چۆن شتێکی گاڵتەجاڕیە ئەگەر کەسێك بیەوێت دیاردە نەشیاوەکان بخاتە بواری جێبەجێ کردنەوە، بەهەمان رادەش کارێکی ناعەقڵانیشە ئەگەر کەسێك بیەوێت زەروورەتەکان پووچەڵ بکاتەوە. هەردوو ئەم داواکارییانە پووچ و بێسودن. ئەگەر تەجویزە سیاسییەکان دەیانەوێ واقیعگەرا و لە ئاکامدا ئیجباری بن، دەبێ ئەو سنوور و چوارچێوانەش کە جیهانی دەوروبەر بەسەر مرۆڤی دەسەپێنن، لەبەرچاوبگرن و لێیان غافڵ نەبن.

ئەڵبەتە زۆربەی کات زەروورەتەکان بە شێوەیەکی تەمومژاوی دەرئەبڕدرێن. هەندێ جار وادەگوترێ کە رووداوێك بە پێی زەروورەت روو ئەدات، لە کاتێکدا مەبەستی راستەقینەی بێژەری ئەو قسەیە ئەوەیە کە رووداوێك روو ئەدات کە ئەو خۆی پێی خۆشەو نەك شتیتر. زەروورەتێك کە بەیان دەکرێ لەراستیدا گوزارشت لەپێداویستی تاکەکان دەکا. تیۆرە سیاسییەکانیش لەو پرۆسەیە بەدوور نین و [هەر تیۆرێکی سیاسی، بۆ مەبەستێکی تایبەت دێتە ئاراوە]. ئەوانیش رەنگە ئەو پلان و بەرنامە سیاسییانەی کە جەختیان لەسەر دەکەن، لە

شێوەی زەروورەتەکاندا دەربڕن. ئەڵبەتە زۆربەی کات بابەتەکە زۆر لەوە قورس و ئاڵۆزترە. هەندێ لە ڕێگەچارە گرنگە تەجویزییەکانی تیۆرە سیاسییەکان، لەسەر ئەو تێڕوانینە راوەستاون کەجیهان بە شێوەیەکی بابەتی، دەبێتە هۆی زەرووری بوونی هەندێ مەسەلە. بەواتایەکی روونتر، هەندێ لە ڕێگەچارە تەجویزییەکان پێیان وایە کە پلان و بەرنامە دروستە سیاسییەکان، دەبێ هەندێ لە واقعییەتە زەرووری و حاشاهەڵنەگرەکانی ژیان لەبەرچاو بگرن. لەرووی لۆژیکیشەوە مرۆڤ نابێ کاری بێهوودە ئەنجام بدات، کارێک کە هیچ دەرەنجامێکی نابێت. لەو حاڵەتەدا "دەبێ"یەکان لە "هەیە" کانەوە هەڵنەهێنجراون، بەڵکوو واقعییەتەکان ئەوە دەردەخەن کە جێبەجێ کردنی "دەبێ"یەکان کارێکی بێسودە.

یەکێك لە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە لەسەر زەروورەتەکان، بەو دەرەنجامە دەگات کە روودانی هەندێ لە رووداوە سیاسییەکان مەسەلەیەکی حەتمی و حاشاهەڵنەگرە. ڕێبازەکانی "زەروورەتی مێژوو"و "جەبری مێژوویی" لە ریزی ئەو میتۆدانەدان. مارکس و هەروەها هێگڵ ـــ کە بەر لە مارکس بوو ـــ کە لە ریزی گەورەترین تیۆرسێنە سیاسییەکاندان، تەجویزەکانیان لەسەر بنەمای ئەو ڕێبازەوە راوەستاون. بە بیروڕای ئەوان، مێژوو هەمیشە لە ناوەوە چالاکی و جووڵەی هەیە و بێگومان ئایندەیەکی ڕێك و لەبارش دێنێتە ئاراوە. ئەم لۆژیکە

دەروونییەی مێژوو، بێگومان بەسەر هەموو هەوڵ و تەقەلاکانی مرۆڤ بۆ گۆڕینی ڕەوتی مێژوودا زاڵ دەبێ. کەواتە هەڵبژاردنی مرۆڤیش روون و ئاشکرا دەبێ. یان دەبێ لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا بچێتە پێشەوە، یان تیایدا قەتیس بمێنێتەوە و نابوودببێت.

مارکس، سەرەڕای ئەوەش کە چینی مامناوەندی تاوانبار دەکات، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە رێبازەکەی ئەو لەسەر مەسەلەکان، دا دیاریو ئاکاری نین، بەڵکوو تەواو زانستین. بێ گومان ئەو، رۆڵی ویستە تاکەکەسییەکانی خۆی بۆ تاوانبار کردنی نەیارەکانی، بە هێند نەدەگرت. بەڵام مەبەستیشی لەوەی کە خۆی بە هزرمەند لە قەڵەم ئەدا، نەك بەراهێنەری ئاکاری، ئەوە بوو کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد رێگەچارە تەجویزییەکان، لە واقیعدا بە هۆی زەروورەتەکانی جیهانەوە سەپێنراون. هەروەها ئەیوت ئەوانەی داکۆکی لە کۆمەڵگای بۆرژوایی دەکەن، بەهەڵەدا دەچن و هەڵەکەشیان "ئاکاری" نییە، بەڵکوو لەرووی زانستییەوە رێگەیەکی هەڵەیان هەڵبژاردووە. ئەوان لەو رووەوە هەڵە دەکەن کە کارەکەیان هەم نائاساییە و هەمیش رێگرە لەبەردەم پێشکەوتنە زەروورییەکەی مێژوودا.

هەروەها پلان و بەرنامە گونجاوە سیاسییەکان، دەبێ هەموو ئەوشتانەی کە لە زانستی کۆمەڵناسیدا بەشتگەلێکی حەتمی و حاشاهەڵنەگر لە قەڵەم ئەدرێن، لەبەرچاوبگرن. ئەگەر کۆمەڵگای مرۆڤی، بەفیترەت هەندێ لایەن و خەسڵەت و

تایبەتمەندی هەیە کە بۆ مانەوەی پێویستن، کەواتە ئەو کەسانەی کە رێگەچارەی سیاسی پێشنیاردەکەن، دەبیٚ ئەو لایەنانەش لەبەرچاوبگرن. ئەگەر رەچەتەی پزیشکێك دەستووراتێك لەخۆبگرێت کەسلامەتی نەخۆشەکە زیاتر بخاتە بەردەم مەترسییەوە، لەراستیدا ئیدی "فەلسەفەی وجوودیی" پزیشك، واتاو ناوەڕۆکی خۆی لەدەستداوە. کەواتە رێنماییە کۆمەلایەتییە ئاقلانەکان، دەبیٚ ئەو زەروورەتانەی کە بەشێکن لە خەسڵەتە فیترییەکانی کۆمەڵگا، لەبەر چاوبگرن.

زۆربەی رێگەچارە پێشنیارکراوەکانی تیۆرە سیاسییەکان کاردانەوەیەکی سیستماتیکن بۆ بەرەنگاری کردنی زەروورەت گەلێکی لەوچەشنە. زەروورەتە سۆسیۆلۆژیەکان، بە تایبەت بە هۆی پرەنسیپی نەگونجاوی (عدم صلاحیت)یەوە، بۆ تیۆرسێنە سیاسییەکان زۆر سەرنج راکێشن. بەو واتایە کە پشت بەستن بە زەروورەت و حەتمییەتی کۆمەلایەتییەوە، تیۆرە سیاسییە نەیارەکان بە (ناصالح) لە قەڵەم ئەدەن. ئەڵبەتە ئیدیعاکەی تیۆرسێن، بە بیانووی پشت بەستن بەزەروورەتی کۆمەلایەتی گرنگی پیٚ نادرێت، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاسانی شکست بە تیۆرە نەیارەکان ئەهێنیٚ و تیۆرەکەی خۆشی لە شەڕی رەخنە رزگار دەکا. بەمجۆرە تیۆرەکەی، بە هۆی گرنگیدان بەم زەروورەتە حاشاهەڵنەگرانەوە، وەك تەنها رێگەچارە، یان یەکێك لە گرنگترین رێگەچارەکان دەکەوێتە گەڕ.

بۆ نموونە ئیدمۆندبرێك بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئازادیخوازان و یەکسانیخوازە شۆڕشگێڕە فەرەنسییەکان، کەڵك لەو شێوازە وەردەگرێت. ئەو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە تیۆرە مەحافیزەکارانەکەی، تاڕادەیەکی زۆر لەسەر بناغەی واقعییەتەکانی ژیانەوە ــ کە نەیارەکانی لەبەرچاویان ناگرن ــدامەزراوە. هەروەها دەیوت کە پێداگرتنی شۆڕشگێڕەکان لەسەر یەکسانی و بەرابەری، لە بنەڕەتدا دژایەتی کردنی حەقیقەتەکانی ژیانە. کۆمەڵگا بەپێیزەروورەت، پێك هاتووە لە ژمارەیەکی زۆری تاکەکان کە بەپێی دەوری کۆمەڵایەتی و کارو چالاکییەکانیان پۆلێنکراون. ئەم گرووپە جۆراوجۆرانە هەرگیز بە تەواوەتی یەکسان و بەرابەر نابن. برێك وای بەنەیارەکانی دەگوت: "خەڵکینە! باوەڕبکەن ئەوانەی کە دەیانەوێ یەکسانی و بەرابەری بێتە ئاراوە، هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، چونکە سەرجەم کۆمەڵگاکان پێکهاتەیەکن لە گرووپگەلێکی جۆراوجۆر کە دەبێ هەندێکیان لەوانیتر لەسەرتر بن". ئەو کەسانەی کە حاشا لەم زەروورەتە دەکەن، تەنها رەوتی سروشتی ژیان دەوەستێنن، یان رەوتەکەی بەئاقارێکی تردا دەگۆڕن. ئەوان وا دەزانن کە خەریکن لەگەڵ دەمارگیرییەکاندا شەڕ ئەکەن، بەڵام لەراستیدا شەڕ لەگەڵ سروشتدا دەکەن.

برێك دەڵێ هەر بەهەمان شێوە، پێداگرتنی لیبراڵەکان لەسەر مافە سروشتییەکان و ئازادی تاکەکان، باسێکی

ناڕاستەقینەیە. ئەم داواکارییەی ئازادیخوازەکان، ئەو خاڵەی فەرامۆش کردووە کە کۆمەڵگا "وەك پێویست" دەبێ ئارەزوو و داواکاریی تاکەکان کۆنترۆڵ و سنووردار بکات. لە ڕاستیدا هەر لەسەرەتاوە مەبەست لە پێکهێنانی کۆمەڵگا ئەوە بوە کە مرۆڤ لە ئازادیگەلی رووخێنەری بارودۆخە ناکۆمەڵایەتییەکان رزگار بکات. بۆ مانەوەو بەردەوام بوونی کۆمەڵگا پێویستە هەمیشە حەزو ئارەزووە مرۆییەکان، چ تاکەکەسی بن و چ بە کۆمەڵ، سنووردار بکرێن، هەروەها داواکارییەکانی مرۆڤ بخرێنە ژێر چاودێرییەوەو سۆز و عاتیفەکانیشی پابەند (مقید) بکرێن. لەگەڵ ئەوەشدا برێك لە پێوەندیدا لەگەڵ پێکهێنانی حکوومەتێکیوا، کاتێك لە تواناادا دەبێ کە دەسەڵاتەکەی لە خۆی بێت، نەك ئەوەی کە دەسەڵاتەکەی بە هۆی کەسانێکەوە بێت کەلەڕاستیدا بۆ کۆنترۆڵ وچاککردنی مەیلەکانی خودی ئەوان بنیات نراوە.هۆبسیش بۆداکۆکی کردن لە حاکمییەتێکی یەکپارچە و یەککگرتوو، کەڵك لە باسی "زەرووڕەت" وەردەگرێ. هێز و دەسەڵات لە کۆمەڵگادا دەبێ لە ناوەندێکدا کۆببێتەوە، ئەگینا کۆمەڵگا ناتوانێت بمێنێتەوەو درێژە بە ژیان بدات. هەوڵدان بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتداریتی لەکۆمەڵگادا. بۆ نموونە بەدەزگایی کردنی لێکجیاکردنەوەی هێزەکان ـــ بە شێوەیەکی حەتمی دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی دەوڵەت. دابەشکردنی حاکمییەتی کۆمەڵگا، جگە لە هەڵوەشانەوەی، هیچ

دەرەنجامێکیتری نییە. چونکە دەسەلاتە دابەشکراوەکان بە گژی یەکدا دەچن و شەڕو پێکادانێکی قورسیان دەبێت. "مۆنتسکیو" و "مەدیسۆن" دەڵێن "ئەم قسەیە وەك پێویست دروست و تەواو نییە".

پێشنیارکردنە پۆزیتیویستییەکان بە هۆی ئەم شێوازەوە — واتە زەروورەتی بیرکردنەوەیەکی تایبەت — بەشێوەی تیۆریگەلی "ئەگەری زەروورەتەکان" دەخرێنەڕوو بە واتایەکی تر، ئەم تیۆرانە بانگەشەی ئەوەدەکەن کە "ئەگەر" مەبەست لەگەیشتن بە ئامانجێك روون و ئاشکرابێت، لەو حاڵەتەدا بیرکردنەوەیەکی تایبەت شتێکی تەواو زەروورییە. کەواتەبیرکردنەوەی تەجویزی، هۆکارێکی زەروورییە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان. قسەو باس کردن لەسەر قۆناغی تەجویز، بە تەواوەتی پێوەندی هەیە لەگەڵ راڤەکاری و شیکردنەوەی هۆکارەکان، کەلە قۆناغی دەستنیشان کردندا باسمان کردن.

جیا لەوەش برێك نموونەگەلێکی پێشنیارئامێز دەخاتەڕوو. ئامانجی شۆڕشگێڕە فەرنسییەکان ئەوە بوو کە دابونەریت و سوننەتە کۆنەکان لە زەینی خەڵکدا بسڕنەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەرانبەر بە ئایندە گەشبینیان بکەن. برێك ئەیوت ئەم رەوشە، یەکێك لە ئامرازە زەروورییەکانی گەیشتن بەو ئامانجە دەسڕێتەوە. هەروەها وتیشی خەڵکانێك کە بیریان لە پێشینانی خۆیان نەکردۆتەوەو گرنگییان بۆ دانانێن، ناتوانن بیر لە

ئایندەش بکەنەوە. بەواتایەکی‌تر، بە پێی قسەکانی برێك ئەگەر ئامانج ئەوە بێت خەڵك بۆ راحەتی و ئاسایشی مرۆڤانی ئایندە تێبکۆشن، دەبێ هان بدرێن ئاوڕ لە میراتی پێشینانیان بدەنەوە.

ئامانجی نەیارەکانی برێك ئەوەبوو کە کۆمەڵگایەك بهێننە ئاراوە کە هەم ئازاد بێت و هەمیش تاکەکانی یەکسان و بەرابەربن. ئەوان دەیانویست جیاوازییە چینایەتییەکان لەناوبەرن و ئازادی تاکەکەسی مسۆگەر بکەن. برێك پێی‌وابوو کە ئامانجی یەکەم لەگەڵ ئامانجی دووهەمدا یەك ناگرنەوەو دژی یەکترین. هەروەها ئەیوت جیاوازی چینایەتی تا ڕادەیەك ڕێ لە زێدەڕەوی کردنی دیکتاتۆرییەت دەگرێت و هەل و مەرجی پاراستن و مانەوەی "کۆمار" دابین دەکات. ئەگەر گەلاڵەی "کۆمار"ی پێشنیارکراو سەرنەکەوێت، هیوای لەناوبردنی جیاوازی هەڵاواردنەو هەروەها هەموو ئازادییە ڕێژەییەکانیش لەناوئەچن.

کورتەی قسەکانی مەدیسۆنیش لە کتێبی وتارگەلی فدرالیست دا، ئاماژە بە بانگەشەکانی ئەو دەکەن سەبارەت بە ئامرازە زەروورییەکانی دابین کردنی ئازادی. بەڕای ئەو، ئەو دەزگا سیاسییەی کە ئازادی دابین دەکا، جیاوازی چینایەتی نییە بەڵکوو لێكجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە، واتە هەمان ئەو شتەی کە هۆبس بە هۆکاری رووخاندنی کۆمەڵگای لەقەڵەم ئەدات. مەدیسۆن وای نووسی: "گرنگترین مەرجی پێویست بۆ

دابین کردنی ئازادی ئەوەیە کە هەرسێدەسەڵاتەکەی حکوومەت، لێك جیابکرێنەوەو دەس‌وەرنەدەنە کاروباری یەکتری". ئەگەر قسەکەی مەدیسۆن دروست بێت، تەنها ئەو کەسانە بەدوژمنی سیستمەدەستووریە پێشنیارکراوەکەی مەدیسۆن لە قەڵەم ئەدرێن کە حازر نین بۆ ئازادی شەڕ بکەن.

هەندێ جار تیۆرسێنەکان، کردەوەگەلێك بە پێویست دەزانن بەبێ ئەوەی راستەوخۆ ئامانجەکانیان روون بکەنەوە. ئەم کارەشیان رەنگە بنچینەی باس و لێکۆڵینەوەکانیان بخاتە بەردەم مەترسییەوە. هەر ئەم کەمتەرخەمییەیان هەندێ‌جار هەندێ لە رەخنەگران ناچاردەکا تا پێشنیارەکانیان بە پێشنیارگەلێکی تاکەکەسی لە قەڵەم بدەن و هیچی‌تر. واتە ئەگەر کەسێك بانگەشەی زەرووری بوونی (نەك حاشا هەڵنەگربوون) کردەوەیەك بکات بەڵام ئامانجەکەی روون نەکاتەوە، قسەکانی هیچ بایەخێکیان نابێت و کەسیش قبووڵیان ناکات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شتەی کە لێرەدا زیاتر قسەی لەسەر دەکرێت ئەوەیە کە کوبرای پێشەکییەکی ناڕێك‌وپێك بە هۆی پێناس کردنێکەوە بەشتێکی پێویست بزانرێت. بۆ نموونە رەنگە کوبرای لۆژیکی ئەوەبێت: "ئەگەر دەتانەوێ لە پشێوی و ئاژاوە رزگارتان بێت‌و لە کۆمەڵگایەکی لەبار و سیستماتیك دا بژین..." کە دەتوانین وای دابنێین لەبەر ئەوەیە کە خەڵك حەز ناکەن لە کۆمەڵگایەکی بێ‌نەزم و نالەباردا بژین. هەندێ جاریش

ڕەنگە پێشەکییە حەزفکراوەکە ئەوە بێت: "ئەگەر دەتانەوێ مرۆڤ بن...." لە رووی لۆژیکیشەوە کەس ناچار نییە ئەم پێشەکییە قبوولّ بکات، بەلاّم دروستترین تەسەور ئەوەیە کە بەکردەوە هەموو خەڵك ئەم پێشەکییەیان قبوولّە چونکە ئەڵتەرناتیڤەکان یان مرۆڤبوونە، یان ئاژەڵبوون، کە مرۆڤیش ئەوەی ناویّ" یان خوابوونە کە بۆ مرۆڤ شتێکی مەحاڵە" یان حەزکردن بە خۆکوشتنە کە مرۆڤی ئاقڵیش ئەوەی ناویّ.

ئەم باسە لە سادەترین شێوەشیدا، واتە "ئەگەر دەتانهەویّ مرۆڤ بن، دەبیّ...." ئامارژە بە پێداویستی و زەروورەتە جەستەییەکان و هەروەها مانەوە دەکات. بۆ نموونە هۆبس لە تیۆرە سیاسییەکانیدا زەروورەتی "مرۆڤبوون"ی بەو مانایە وەردەگرت. بەبڕوای ئەو، سروشت مرۆڤەکانی والێکردووە کە توانای هێرش کردنە سەرو لە ناو بردنی یەکدییان تیاهاتۆتە ئاراوە. ئەڵبەتە ئەو توانایەش لە ئارادایەکە لەو هەل و مەرجە نالەبار و نەفرەتئامێزە رزگاریان ببێت، ئەوەش لە کاتێکدا دەبیّ کە مرۆڤەکان خۆیان تەسلیمی رژێمێکی سیاسی دیکتاتۆر بکەن. هۆبس زۆربەی تیۆرە سیاسییەکانی بۆ روونکردنەوەی ئەم زەروورەتە تەرخان کردووە. ئەو، پێی وایە لەبەر ئەوەی مرۆڤ ژیانی ئارام و بیّکێشە و گرفتی بەلاوە پەسەندترە وەك لە ژیانی پڕ لە ئاژاوە و توندوتیژی، کەواتە لە بەرانبەر هێز و دەسەلاّتی

حکوومەتدا چۆك دائەدات. بە کورتی، مانەوەو دابینکردنی ئاسایشی گیانی تاکەکان یەکێکە لە ئاسایی‌ترین و زەرووری‌ترین پێداویستییەکانی مرۆڤ و دەبێ بێ ئەملاو ئەولا مسۆگەر بکرێت.

لای زۆربەی تیۆرسێنەکان "مرۆڤبوون" بە تەنها بە مانای مانەوەی فیزیکی نییە. رەنگە مرۆڤ بتوانێت لە بارودۆخێکدا بژی کە تەنها مانەوەی فیزیکی بۆ مسۆگەر بکرێت، بەلام ئەو بارودۆخە مۆڵەت بە گەشەکردنی سیفەتە مرۆییەکان نادات. کەواتە هەندێ پلان و بەرنامەی سیاسی، یان دامەزراندنی هەندێ دەزگای سیاسی بەمەبەستی گەشەپێدان و پێشخستنی مرۆڤ لە هەموو روویەکەوە، بەشێکە لە زەروورەتەکان. ئەوانە، بەشێکن لە زەروورەتە سەرەتاییەکانی ژیان بەمەبەستی بەدی هێنانی مرۆڤییەت. بۆ نموونە ئۆرگانێك بوونی کۆمەڵگا، یەکێك لە مەرجە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی مرۆڤبوونە. کاتێ ئەرستۆ وتی "مرۆڤ بەفیترەت شارستانییە" مەبەستی هەمان ئەو مەسەلەیە بوو. هەروەها ئەیوت مرۆڤێك کە حەزی لە تەنیاییە و ناتوانێت بچێتەریزی کۆمەڵگای سیاسییەوە، یان بە هۆی سەربەخۆیی تاکەکەسییەوە پێویستی بەژیانی کۆمەلایەتی نییە، ناتوانرێ بە ئەندامێکی کۆمەڵگای سیاسی لەقەڵەم بدرێت بەڵکوو یان لە ریزی ئاژەلاندایە، یان خوایان.

ڕەنگە سیستمە سیاسییەکانی‌تر لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ زەرورەتەکانی ژیانی مرۆڤدا یەك ناگرنەوە، ڕەخنە یان لێ بگیردرێت. بۆ نموونە زۆربەی تیۆرسێنە سیاسییەکان، چۆکدادان لەبەرانبەر هەر سیستمێکی سیاسییان بە نادروست و نائاقلانە لە قەڵەم داوە. مرۆڤی ڕاستەقینە دەبێ تا ڕادەیەك سەربەخۆ بێت. ڕۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتی دا دەڵێ: نکوڵی کردنی ئازادی لەگەڵ پێکهاتەی مرۆڤدا یەك ناگرنەوە". ئەفلاتوونیش دەڵێ:

حاڵەتێکی سیاسی پێچەوانەی ئەو پێوەندییەی نێوان مرۆڤ و ئازادیش ـ واتە دیکتاتۆرییەت و حوکمڕانی ملهۆڕانە بەسەر ئەوانی تردا ـ لەگەڵ تایبەتمەندی و سیفەتەکانی مرۆڤی ڕاستەقینەدا یەك ناگرنەوە. مرۆڤی دیکتاتۆر لە بارودۆخێکدایە کە هەموو خەسڵەتە مرۆییەکانی لەدەست داوە و وەك گورگێکی لێ‌هاتووە.

ئەگەر قسەکانی ئەفلاتوون و ڕۆسۆ ڕاست بن، پێداویستییەکانی فیترەتیەکانی مرۆڤ، هەندێ لە سیستمە سیاسییەکان بە مەشرووع و هەندێکی تریان بەنامەشرووع بە ئەژمار دێنن. ئەگەر کەسێك دەیەوێ مرۆڤ بێت، دەبێ نە "کۆیلە" بێت، نە "دیکتاتۆر". ئەڵبەتە ئەگەر کەسێك ناخوازێ مرۆڤ بێت، ئەی دەیەوێ چی بێت؟ لە ڕاستیدا دەکرێ چی بین؟

## واقعییەکان و وەهمەکان

تیۆرە سیاسییەکان لەسەر بنەمای "حوکمە راستەقینەکان"یش پێشنیارگەلێکی گرنگ ئاراستە دەکەن. ئەگەر لەکۆمەڵگایەکی رێك و پێکدا، زەرورەتەکان وەك زەویی ناومالْ و ئیمکاناتەکانیش وەك سەربانەکەی وابن" واقعییەتەکانیش حەتمەن وەك دیوارەکانی وان.

لە سادەترین ئاستدا جیاکردنەوەی واقعییەت لە ناواقعییەت کارێکی سەخت نییە. بۆ نموونە سەلماندنی دروستی و نادروستی ئەم قسانە "چوار سێو لەسەر مێزەکەن" یان "ئەوانە بایی یەك دۆلارن" کارێکی یەکجار ئاسانەو پێویستی بە دیکۆمێنت و بەڵگەهێنانەوە نییە.

بەڵام هەرچی تێگەیشتنی مرۆڤ لە جیهان، کاملْتر و هەمەلایەنەتر و روولەزیادبوون بێت، ئەو جۆرە مەسەلانەش سەختتر دەرکیان پێ‌دەکرێ. رەت کردنەوەی ئاستی تێگەیشتنیکی هەمەلایەنەی حەقیقەتەکان، لە پێوەندی لەگەلْ سەرجەم بابەتەکەدا فۆرم بەخۆوە دەگرێت.

بەشە پێکهێنەرەکانی هەر بابەتێك، بەهۆی رەهەندە لاوەکییەکانی هەمان ئەو بابەتەوە، شوناس بەخۆوە دەگرن. ئایا رووناکییەك کە لە ئاسماندایە، ئەستێرەیە، یان هەسارە؟" تەنها کەسانێك دەتوانن لەو پرسیارە تێ‌بگەن، کە لەو بوارەدا

زانیارییان هەبێت، یان هەر پێیان خۆش بێت وەڵامێکیان دابێتەوە.

لەبەر ئەوەی کە ئەم باسە، بوارگەلێکی لاوەکی قورس و ئالۆزی هەیە، دەستنیشانکردنیواقعییەت لە ناواقعییەت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا یەکجار دژوارە. لەبەر ئەوەش کە ئێمە مرۆڤین، کاردانەوەکانمان بەرانبەر ئەو بوارانە، بەهۆی تێگەیشتنمان لەسەریان، گۆڕانیان بەسەرا دێت. راستە کە "کردەوەیەك" و بینینی ئەو کردەوەیە وەکوویەك وان، بەلام بینینی پیاوێك کە خەریکە لە منداڵێك ئەدا، جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ لێدانی منالێك لەلایەن باوکیەوە بەمەبەستی ژێرکردن و راهێنان. لە ئاستێکی بالاتردا، واتای ئەو کردەوانە گەلە کە ئەوەی یەکەم بەواتای "راهێنانی رۆح" و ئەوەی دووهەم بە واتای "سەرکوت کردنی رۆح" دەبێ، جیاوازییەکی یەکجار زۆریان لەگەڵ یەکدا هەیە. ئامانجی هەرکام لەم رستانە، یان رستەی "لێدانی منداڵ" وەسفکردنی واقعییەتەکانە بەشێوەی تەجروبی. لەگەڵ ئەوەشدا لەڕادەبەدەر خۆ بەتەعبیرکردن و راڤەکارییەوە خەریك دەکەن (واتە لە چوارچێوەی تیۆرە قورسەکانیتردا). کەواتە بە سەختی دەتوانرێ ئەم بانگەشانە بسەلمێنرێن.

ئەڵبەتە رەنگە تەنانەت لە ئاستێکی یەکجار سادەشدا، تێگەیشتنمان لە واقعییەتەکان دروست نەبێت. بۆ نموونە "چلێك

لە ناو ئاودا شکاوەتەوە". "نەخێر وانییە چاوی ئێمە بەهەڵە وادەیبینێ". یان "لەبەر چاوتاندا ئاوێك دەبینرێت". "نەخێر ئاونییە، بەڵکوو تراویلکەیە". لە ئاستێکی باڵاتردا کەمەسەلەکان قورس و ئاڵۆزتردەبن، ئەو جۆرە هەڵەکردنانەش رووڵەزیادبوون دەکەن. لەوەها قۆناغێکدا رەنگە ئەوە زۆر سەخت بێت کە بزانین چ شتێك "حەقیقەتی راستەقینە"یە. لە باڵاترین ئاستدا هەندێ داوەری کردنی قورس و ئاڵۆزتر دەور ئەبینن. هەموو ئەو تیۆرە سیاسییانەی کە ئامانجیان خستنە ڕووی جیهانبینییەکی هەمەلایەنەیە لەسەر جۆرە ژیانێکی ئاڵۆزدا، ئەو جۆرە داوەری کردنانەیان تیایە.

هەموو زمانەکانی دنیا پڕن لە وشەگەلێك کە نادروستی داوەریکردن لەسەر واقعییەت وەسف دەکەن. بۆ نموونە وشەگەلی خەون، خەیاڵ، وەهم، تراویلکە، فریودان، فڕوفێڵ، خورافات و ئەفسانە، بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنرێن. یەکێك لە دیاردە ئاساییەکان ئەوەیە کە مرۆڤ گیرۆدەی کێشە زەینییەکانی خۆی ببێت و داوەریگەلێکی لەو جۆرە بکات. دیارە دەرەنجامی ئەوجۆرە داوەریکردنانە یەکجار خراپ و مەترسیدار دەبێت. کاتێ کە مرۆڤ فریوی خواردبێت، ناتوانرێ چاوەڕێی رەفتاری باشی لێبکرێت.

کەواتە زۆربەی ئیدیعاکانی تیۆرسێنە سیاسییەکان، لەسەر بنەمای تێگەیشتن لە واقعییەتەکان و جیاوازییان لە وەهم و

خەیاڵ بنیات نراون. ژمارەیەك لە بەناوبانگترین تیۆرسیێنەكان، بەشێكی زۆری لێكۆڵینەوەكانیان بۆ ئەم بابەتە، كە بەڕای ئەوان بەسەر رەفتار و بیركردنەوەكانی خەڵكدا زاڵە، تەرخان كردووە. لەو روەوە كە رەفتاری عەقلانی، بە هۆی تێگەیشتنی دروستی حەقیقەتەكانەوە دێتە ئاراوە، كەواتە ئەم رەهەندەی تیۆرە سیاسییەكان، هەمیشە بایەخی ئەوەی هەیە پێشنیار بكرێت.

بە كەڵك وەرگرتن لە تەمسیلە بەناوبانگەكەی ئەفلاتوون، یەكێك لە لایەنە گرنگەكانی تیۆرە سیاسییە حەماسییەكان، رێنمایی كردنی خەڵكە بۆ چوونەدەرەوە لە "ئەشكەوت"كە. ئەفلاتوون لە كۆماردا بە تەواوەتی هەر بەو هۆیەوە گرنگییەكی زۆر ئەدات بە گەلاڵەی سیستمی فێركاری. بەڕای ئەفلاتوون دەرەنجامە سیاسییەكەی ئەم پرۆسەیە، گرنگییەكی زۆری هەیە، چونكە ئەو خەڵكانەی كە فێربوونەو دەتوانن سێبەر و خودی حەقیقەت لێك جیا بكەنەوە، دەشتوانن رێگەگەلێكی سیاسی ئاقلانەش بگرنەبەر.

زۆربەی تیۆرسێنە سیاسییە گەورەكان، ئەركی گرنگی سەرشانیان، بەكەڵك وەرگرتن لە چەمكگەلێكی لەو جۆرەوە وەسف دەكەن. ئامانجی ئەوان، دژایەتی كردن لەگەڵ ئەو هێزە درۆزن و وەهمی و خەیاڵییانەیە كە لە رووی سیاسییەوە مرۆییەكانیان دیل كردووە. ئەوان لە قۆناغە هەرە گرنگەكانی بیروڕاكانیاندا جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە واقعییەتە

ڕاستەقینەکان کامانەن و وەهم و خەیاڵەکان کامانەن؟ هەروەها ئەوان هێرش دەکەنە سەر ئەو دەزگا سیاسی و تێگەیشتنانەی کە لەسەر بناغەی زانیاریگەلی هەڵەو نادروستەوە هاتوونەتە ئاراوە.

مارکس هیچ هەڵەیەك لە زانستەکەی خۆیدا، سەبارەت بە واقعییەتەکان بەدی ناکات و پێیوایە زانستێکی تەواو بێهەڵەیە. بەڕای مارکس ئایین نەك هەر تەنها یەکێکە لە وەهمەکان، بەڵکوو وەك تلیاك بۆ کۆمەلانی خەڵك وایە. هەروەها بەڕای ئەو، چینی کرێکار دوچاری شتێك بووە کە ئەو بەگاڵتەجاڕییەوە بە "شعووری سەندیکا کرێکارییەکان" ناودێری دەکات. ئەم تەعبیرە، لە بناغەوە وەسف کردنێکی نادروستی بارودۆخی ئەو چینەیە. چینی بۆرژوازی خاڵی بەرانبەری ئەو چینە کرێکارییەیە. ئەم چینە لە ناودنیای خەون و خەیاڵەکانیاندا دەژین. هزرمەندە بۆرژواکان، تاڕادەیەك بە قازانجی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانیان، بە پشتبەستن بە خەیاڵ و وەهمی "ئاکاری بۆرژوایی"یەوە و هەروەها ئەم وێنا نادروستە کە سیستمی سەرمایەداری، سیستمێکی سروشتی و نەگۆڕیشە، خەڵك فریو ئەدەن.

یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی تیۆرە سیاسییەکەی مارکس ئەوە بوو کە ئەو خەیاڵ و ئەفسانانە لەناو بەرێت. مارکس دەیویست بە هۆی "چاك کردنی شعوورەکان"ەوە، ئەو

تەلیسمە شەیتانییەی کە بەسەرزەینی خەڵکدا زاڵ بوو، لەناو بەرێت. لە کاتێکدا ئەفلاتوون بیری لە ڕێنمایی کردنی خەڵك و یارمەتی دانیان بۆ هاتنەدەرەوە لە سێبەرەکانی ئەشکەوەتەوە، دەکردەوە، مارکس هەوڵی ئەدا بە یارمەتی خوازەکان، خەڵك لە خەوەکانیان رابچڵەکێنێ و هۆشیاریان بکاتەوە. ئەو دەیەویست کە "شعووری ئەفسانەیی" جیهان (کە بەهاوتای خەونی بە ئەژماردێنا) بخاتە بەر راڤەکاری و ئەوە پیشان بدات کە جیهان سالآنێکی زۆرە لە خەونەکانیدا بیر لە ئامانجێك دەکاتەوە کە بۆشیناییەتە دی و تەنها لە کاتێکدا دێتەدی کە بەرانبەر واقعییەتەکان ئاگا بێت. ئامانجی مارکس ئەوە بوو کە جیهان لەخەو راچڵەکێنێ و واقعییەتەکان وەك خۆیان پیشان بدات.

سەرجەم چەمکی رۆشنگەریش هەر ئەم ئایدیایە دەخاتە ڕوو. رۆشنگەری، دژی سەردەمێك بوو کە تارمایی خورافات و نەزانی وجیاوازیو هەڵاواردن هەموو لایەکی گرتبووەوو تەنگی بە هەموو لایەك هەڵچنیبوو. دەتوانین "سەردەمی تاریکی" بە ئەشکەوتێك لە قەڵەم بدەین کەتاکە ڕێگەی چوونەدەرەوەی، لۆژیك و فەلسەفەیە و دەرەنجامە کۆتاییە سیاسییەکەشی ئازادییە. حوکمڕانان و خاوەن کڵێسەکان بە قازانجی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانیان، بە ئەنقەست خەڵك گومڕا دەکەن و فریویان دەدەن و دەیانخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. بەڵام هێز و توانای زانست و زانایی، ئەو تەلیسمەیان شکاند. بە

پێی بیروڕاکانی کانت "مرۆڤ ئیدی لە لایەن مرۆڤەوە کۆنترۆڵ و چاودێری ناکرێت و بە توانایییەکی تازەوە واقعییەتە ڕەهاکان، لەو خورافات و هەڵواردنانە کە حوکمڕانان بەسەریاندا سەپاندبوویان، جیا دەکاتەوەو ڕێگەچارەیەکی تازەی سیاسی دەخاتە ڕوو.

هەرچەند نموونەگەلێکی زۆری دیکەش هەن، بەڵام مەکیاڤیلی و هۆبس دواهەمین نموونەن بۆ هێزی سیاسی تەجویزی و راستەقینە لە تیۆرە سیاسییەکاندا. دەتوانین بڵێین مەکیاڤیلی بیروڕاکانی ئەفلاتوونی سەبارەت بە حەقیقەتەکان و وەهمەکان چاك کرد و وەك دەڵێن ورە و توانای پێ بەخشی. ئەفلاتوون بە شەوقێکی زۆرەوە قسەی لەسەر ئەوە دەکرد کە حەقیقەتە دروستەکان لە بەهەشت و یۆتۆپیادا دەبینرێنەوە و دەست دەکەون. هەروەها ئەیوت کارەساتە سیاسییەکان لەبەر ئەوە روو ئەدەن کە خەڵك "سێبەرەکانی" ئەم جیهانە، بە دوا حەقیقەت لە قەڵەم ئەدەن. مەکیاڤیلی بە تەواوەتی خاڵی بەرانبەری ئەفلاتوون بوو. بەڕای مەکیاڤیلی، ئەفلاتوون جگەلە وەهمی زیاتر هیچی تر نەبوو. کارەساتەکانی ژیان لەوێوە دەست پێ دەکەن کە خەڵك وەك ئەفلاتوون بەدوای "کۆمارگەلی خەیاڵی"دا بگەڕێن و هەوڵی دامەزراندنیان بدەن. لەم ڕووەوە، یەکەم یاسا بۆ رزگار بوون لەم کارەساتانە، "واقیع گەرایی"یە ئێمە نابێ خەیاڵە پووچەکان و واقعییەتە حەقیقییەکان تێکەڵ

بکەین و نەتوانین جیایان بکەینەوە. مەکیاڤیلی دەڵێ: "بەڕای من واگونجاوترە کە مرۆڤ خوێندنەوە لەسەر خودی حەقیقەت بکات، نەك وەهمەکان. کۆمار و پاشایەتیگەلێکی زۆر [واتە حکوومەتگەلی کۆماری و سەڵتەنەتی] لە جیهانی خەونەکاندا وێناکراون کە هەرگیز لە دنیای راستەقینەدا نەهاتوونەتە ئاراوەو نەبینراون. ئەو جۆرە ژیانەی کە خەڵك هەیانە لەگەڵ ئەوجۆرە ژیانەی کە دەبێ هەیانبێت فەرقێکی زۆری هەیەو هەربەم هۆیەشەوە، ئەو کەسەی کە بە ئومێدی ئەوشتانەی کە قەرارە ڕوو بدەن، واز لە شتە راستەقینەکان دێنێ، لە جیاتی رزگار کردنی خۆی، بە پێچەوانەوە بەرەو نابوودی هەنگاو هەڵدەگرێ.

هۆبس بە کەڵك وەرگرتن لە جوانترین و زیندووترین خوازە، بە باشترین شێوە گیرۆدەبوونی مرۆڤی بەدەست وەهمکانەوە پیشان داوە. بەڕای ئەو، زۆربەی کارەساتە سیاسییەکانی ئەورووپا دوو سەرچاوەیان هەیە: فەلسەفەی ئەرستۆ و کڵێسەی کاتۆلیك. هەردووکیان بە ڕادەیەکی زۆر تەنگیان بە بیرۆکەکانی خەڵك هەڵچنیبوو. بەڵام هەردووکیشیان قسەکانیان لەسەر بنەمای وەهمگەلێکی فریودەرانەوە بنیاتنرابوون. "فەلسەفە پووچە فێرکارییەکەی ئەرستۆ، جگەلە ڕستێ وشەی ناباو و سەیرو سەمەر زیاتر هیچ نین". بەمجۆرە، زۆربەی تەعالیمە چارەنووسسازەکان، کە کڵێسە دەسەڵاتی خۆی لەسەر ئەوانەوە دامەزراندبوو، تەنها وەهم بوون و هیچی تر.

بەم هۆیەوە هۆبس، فەلسەفەی ئەرستۆی بەداهۆڵێکی مەترسیدار و "پاپا"یشی بە تارماییەك لە قەڵەم ئەدا. ئامانجی تیۆرە سیاسییەکەشی ئەوە بوو کە مرۆڤایەتی لەدەست ئەو دوو تراویلکەیە رزگار بکات. هۆبس لەسەبارەت بە ئەرستۆ نووسی کە ئامانجی تیۆرە سیاسییەکەی ئەوەیە کە خەڵك ئاگادار بکاتەوە تاکوو نەهێڵن فریویان بدەن و کەڵکی خراپیان لێوەربگیردرێت. تیۆری "جیایی نەفسەکان" کە بەشێکی سەرەکی و یەکجار گرنگی فەلسەفە بێماناکەی ئەرستۆی گرتۆتەوە، بەکەڵك وەرگرتن لە وشەگەلی پووچ و بێمانا، رێ لەگوێرایەڵی خەڵك یاساکان دەگرێ و بەتەواوەتی وەك باڵندەیەك چۆن بەدیتنی داهۆڵێکی دروست کراو لە کڵاوو چێوێکی لاروگێڕ، دەترسێ و هەڵدێت، خەڵك دەترسێنێ. سەبارەت بە کڵێسەی کاتۆلیکیش وای نووسی: دەتوانین سەرجەم زنجیرە پلەو پایەکانیان، واتە پاشایەتی تاریکی، لەگەڵ پاشایەتی دیۆو پەرییەکان بەراورد بکەین و بیانشوبهێنین. هەروەها دەتوانین بە چیرۆكگەلی منداڵان سەبارەت بە دێوو پەری و رۆح و بوونەوەرە سەیرەکان، یان بەشانۆنامەی شانۆکانی بەریتانیا بیانشوبهێنین. سیستمی کڵێسەی پاپاکان، تەنها تارماییەکە کە پاش رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆما، لەسەرگۆڕەکەیەوە پاشایەتی ئەکەن.

وەك چۆن لەم راڤەکارییە کورتانەدا دەبێ ئەوەمان بۆ روون بووبێتەوە کە داوەری کردنی سەرەکی سەبارەت بەوە کەچ شتێك

واقعییەو چ شتێك گومڕاكەرە، بەشێكی زۆری تیۆرە سیاسییەكانی گرتۆتەوە" دەبێ ئەوەشمان بۆ روون بووبێتەوە كە ئەم داوەری كردنانە، دەرەنجامگەلێكی گرنگی تەجویزیشیان هەیە. سێبەر و خەیاڵ و تارماییەكان، هێندەی حەقیقەتەكان مرۆڤ ناچار بە بەرپەرچدانەوە ناكەن.

هەروەها ئەم نموونە بچووكە دەبێ ئەوەی روون كردبێتەوە ئەو شتەی كە لای كەسێك حەقیقەت بێت، رەنگە لای كەسانی‌تر تەنها وەهم و خەیاڵ بێت. ئەڵبەتە ئەم جیاوازییانە، بە هۆی مەیل و سەلیقەو ویستە تاكەكەسییەكانەوە نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵكوو گوزارشت لە جیاوازیگەلی سەرەكی باوەڕەكان دەكا سەبارەت بە فیترەتی مرۆڤ و پێكهاتەی جیهان. هەموو تیۆرسێنە گەورەكان مرۆڤانێكی لۆژیكین، بەڵام قووڵبوون و ئاڵۆزێتی لێكۆڵینەوەكانیان بەشێوەیەكە كە تەنانەت مرۆڤە ئاقڵەكانیش والی‌دەكا لەسەریان تەبا نەبن و بیروڕاگەلی جیاوازیان هەبێ. ئەم رەهەندەی تیۆرە سیاسییەكان، لە لایەكەوە مرۆڤ هانئەدات بەتاسەوە بیانخوێنێتەوە و لەلایەكی تریشەوە مرۆڤ لە خوێندنەوەیان نائومێد دەكا. لایەنی پۆزەتیڤی تیۆرە سیاسییەكان، فرەچەشن بوونیانەو، لایەنی نێگەتیڤیشیان ئەوەیە كە لێبڕاو (قاطع) نین. هەموو خوێنەرێك دەبێ بە پێی واقعییەتەكانی بەردەستی، باشترین داوەریكردن لە خۆ پیشان بدات.

## واقعییەتە کێشەسازەکان

لەو روەوە کە داوەری کردنە قورس و ئاڵۆزەکان سەبارەت بە "ئەوەی کە هەیە"، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر خەڵکەوە هەیە، رەنگە هەندێ جاریش واقعییەتە تەجروبییەکان ئامانجە سیاسییەکان تەعدیل بکەن. ئەمە هەمان ئەو مەسەلەیە بوو کە کۆمەڵناسی بەرجستەی ئەڵمانی "ماکس‌وێبر"، کاتێك سەبارەت بەو واقعییەتانەی کە بۆ قوتابخانە سیاسییەکان کێشە سازئەکەن، قسەی دەکرد، لەبەرچاوی دەگرت. رەنگە بە هۆی زیاد بوونی ژمارەی واقعییەتە کێشەسازەکانەوە، کاریگەرێتی و تەنانەت فۆرمی تیۆرە سیاسییە نۆرماتیڤەکانیش گۆڕانیان بەسەرابێت. رەنگە کەس حازر نەبێت لە رووی ئاگاییەوە دەستکاری تیۆرێکی سیاسی بکات، بەڵام هەردەبێ رۆژێك مرۆڤ ئەوە بزانێ کە ئەو تیۆرییە هێدی هێدی و بە شێوەیەکی بەردەوام، ماناو کاریگەرێتی و زۆربەی بەراییە حەقیقییە قورس و ئاڵۆزەکانی خۆی لەدەست داوە.

باشترین و گرنگترین نموونەی ئەم دیاردە چارەنووسسازە، تیۆری کلاسیکی دیمۆکراسییە لەم دەیە دواییانەدا. لەم سەردەمەدا بیروڕاگەلێکی زۆر خراونەتەڕوو کە پێوەندی نێوان "ئامانجەکان" و "بونیادە ئەزمونگەرییەکان"ی دیمۆکراسی کلاسیکیان سست و لاواز کردووە. سەرەتا" رۆبێرت میشلز"

بانگەشـەی ئـەوەی کـرد کـە گەشـەکردنی چـینی هەڵبـژاردەی دەسەڵاتدار لە کۆمەڵگاکاندا، شتێکی حـەتمی و حاشاهەڵنەگرە. ئـەم تیـۆرە بـەناوی "یاسـای ئاسـنینی ئۆلیگارشـی" ناوبـانگی دەرکرد. ماوەیەك دواتر رەفتـاری "دەنگدەران" ئەوەی دەرخست کـە رەفتارەکانیـان بـە تـەواوەتی لـە نۆرمـەکانی دیمۆکراسـی بـەدوورن [بـەکورتی و کـوردی" فریـان بەسـەر دیمۆکراسـییەوە نییـە]. ئـەوەش ئاشـکرا کـرا کـە دەنـگ دەرەکـان بەگشـتی، ئـەو هاووڵاتییە عـەقڵانییا نـەنین کە دیمۆکراسـی بانگەشـەیان دەکـاو داکۆکییان لیّدەکا. ئەوان نە پاڵێوراوەکـان (کاندیـداکان) دەناسـن و نەلەسـەر مەسـەلە سیاسـییەکانی رۆژ، ئاگاییـان هەیـەو، لەگـەڵ ئەوەشدا بیر لە لەناوبردنی نەفامی و نـەزانینیان ناکەنـەوە. ئـەوان بەتـــەواوەتی بـــەوە دڵخۆشـــن کـــە وەك دایـــك و باوکیـــان لـــە هەڵبژاردنەکانـدا بەشـداری دەکـەن و دەنگەکانیشـیان دەخەنـە سندووقەوە" چونکە بەپێی عادەت پێڕەوی لـە حیزبێکـی تایبـەت دەکەن. سەرەنجام لێکۆڵینـەوەکانی دواتـریش ئـەوەیان دەرخسـت کـە ئـەم خەڵکـە لـەڕووی سیاسـییەوە نـەزانن و جگـە لـە هەنـدیٚ دەستەبژێری ناسیاسـی [واتـە بـەدوور لـە کاروبـارە سیاسییەکان] کەس پابەندی هەندیٚ لە پرەنیسبە بنەڕەتییەکانی دیمۆکراسـی، وەك ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی هەڵبژاردن نییە.

دەرەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوانە، هەندیٚ لە توێژەرەوەکانی زانستە سیاسییەکانیان ناچار کرد بانگەشەی ئەوەبکەن کە دەبیٚ

تیۆری کلاسیکی دیمۆکراسی، چاکسازی تیابکرێت تاکوو لەم ڕێگەیەوە لەسەر بناغەی حەقیقەتەکانی ژیانی سیاسییەوە، سەقامگیرتر بێت. نووسەرانی ڕاڤەکارییەکی گرنگ سەبارەت بە ڕەفتاری "دەنگدەران" لەدەیەی ١٩٥٠ دا، کتێبێکیان نووسی کە لە دوابەشیدا، پەرەیان بەم بابەتە دا: چۆن دەتوانین شیکردنەوەو ڕاڤەکارییەکان، لەگەڵ تیۆری کلاسیکی دیمۆکراسیدا بگونجێنین؟ ئایا تیۆری دیمۆکراسی، کەم و کوڕی تێدایە؟ ئایا دەبێ بە قازانجی سۆسیۆلۆژی سیاسی تەجروبی، لە تیۆری دیمۆکراسی چاوپۆشی بکەین؟ ئایا دەبێ ناوەڕۆکە ئاکارییەکەی، بەشتێکی جیاواز لە مرۆڤی هاوچەرخ و کۆمەڵگا مرۆییە ئەمڕۆژییەکان لەقەڵەم بدەین؟ ئێمە باوەڕێکی لەو جۆرەمان نییە، بەڵکوو بەڕای ئێمە دەبێ تیۆرە سیاسییە تازەکانی سەبارەت بە دیمۆکراسی، چاکسازییان تیابکرێت، نەك سۆسیۆلۆژیای ئەزمونگەرییان لەجێ دابنێین".

بە ئاسانی دەتوانین گومان لەم دەرەنجامانە بکەین و بڵێین کە جەختکردنیان لەسەر چاككردنی تیۆری دیمۆکراسی، کارێکی تەواو هەڵەیە. چاکسازییەکی لەو جۆرە لەڕووی لۆژیکییەوە، هیچ زەرورەتێکی نییە. بەهۆی "لۆژیکی ڕەها"وە ناتوانین کەس ناچار بکەین لەبەرخاتری دەسکەوتە ئەزمونگەرییەکانی لەسەر حەقیقەتەکان، چاوپۆشی لە ئامانجە تایبەتەکەی خۆی بکات و پشت گوێی بخات، بەڵام دەسکەوتە

ئەزمونگەریەکان رەنگە ئامانجەکان ـ واتە "دەبیٚ"یەکان ـ بخەنە بەرمەترسی هەڵوەشانەوەوە. ئەگەر کەسێك ئامانجێکی هەبێت و نەتوانێت ئەو بانگەشانەی کە لەسەر بنەمای حەقیقەتەوە راوەستاون، رەت بکاتەوە، ناچارە پشت بە "دەبیٚ"یەکەوە ببەستێت کە لە دنیای راستەقینەدا هیچ بناغەو پاڵپشتێکی نییە. راستییەکەی ئەوەیە کە ئامانجە تەواو هاندەرەکان، بەو شێوەیە کارناکەن. کاتێك ناواخنی راستەقینەی ئامانجەکان ـ کە مانایان پیٚ دەبەخشیٚ ـ بە تەواوەتی لەناوببرێت، ئامانجیش هەر لەخۆوە لەناودەچێت. لەو حاڵەتەدا واتاو ناوەڕوەکیان لەدەستئەدەن و ئەگۆڕێن بە ئامانجگەلێکی وەهمی وخەیاڵی.

ئەو توێژەروانەی کە کتێبی سەبارەت بە رەفتاری دەنگدەرانیان بلاوکردۆتەوە [ئەو کتێبەی کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد] لەو باوەڕەدان کە ئەمە هەمان ئەو کێشە و نەهامەتەیە کە تیۆری کلاسیکی دیموکراسی، رووبەڕووی بوەتەوە. ئەگەر حوکمڕانی و بەدەستەوە گرتنی دەسەلات لە لایەن نوخبەکانەوە، شتێکی حەتمی و حاشاهەڵنەگر بێت، کەواتەجەخت کردن لەسەر دیموکراسی یەکسانیخواز، مەسەلەیەکی نادروست و ناواقعییە. جیا لەوەش، ئەگەر هەروەك ئەم دەرەنجامانە پیشانی ئەدەن وابێت، "ئەگەری" نەزانی و ناعەقڵانی بوونی هاووڵاتییە ئاساییەکان و هەروەها کاریگەرێتی و دەسەلاتدارێتی نوخبەکان یەکجار زۆرە. لە راستیدا رەنگە

قازانجی ئەم یەکسانییە رواڵەتییە زیاتر بێت، چونکە نوخبەکان هەم بە پرەنسیپەکانی سیاسەت ئاشنان و هەمیش پابەندن بە پرەنسیپەکانی دیموکراسییەوە. کەواتە رەنگە تێکەڵەیەك لە دەسەڵاتی نوخبەکان و کەمتەرخەمییەکانی خەڵکی رەمەکی بەرانبەر پاراستنی سیستمی دیموکراسی، گرنگییەکی زۆری هەبێت. ئەڵبەتە ئەگەر پاش پێدانەگرتنی خەڵك بۆ یەکسانیخوازی و بەشداریکردن لە سیاسەتیشدا، دیسانەوە بمانەوێ پاشماوەی ئەم چاکسازییانە بە دیموکراسی ناودێربکەین، پێویستە تاڕادەیەك پێناسکردنە کلاسیکەکەی دیموکراسی چاکتربکەینەوە. تەعدیلی پێناسکردنەکەی دیموکراسی کارێکی تەواو لۆژیکییە چونکە بە پێی دەرەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوانە، جەختکردن لەسەر یەکسانی و بەشداری کردنی خەڵك، جەختکردنێکی ناموکینە. لە لایەکی ترەوە لەم ساڵانەی دواییدا تیۆری "پیاچوونەوە بەسەر دیموکراسیدا" بەتوندی رەخنەی لێگیراوەو ئەوەش پڕبایەخترین قسەو باسەکانی ئەمڕۆی زانستی سیاسین. ئەو رەخنەگرانە دەڵێن کە "پیاچوونەوەخوازەکان" داواکارییەکانیان کەمتر بوەتەوەو لە پرۆسەی پیاچوونەوەدا هەندێك لە پرەنسیپە سەرەکییەکانی دیموکراسییان پشت گوێ خستووە. ئەم"کلاسیکە هاوچەرخانە" بۆ ئەوەی باسەکانیان قەناعەت پێکەربن، هەم جەخت لەسەر واقعییەتەکان دەکەن و هەم لەسەر

ئامانجەکان" چونکە ئەوە دەزانن کە ئەگەر پیاچوونەوەخوازەکان تەنها ئامانجە مەحاڵەکانیان خستبێتە لاوە، کەواتە ناتوانین بڵێین کە ئەوان بە کەم رازین و داواکارییەکانیان کەمتربۆتەوە.

کلاسیکە هاوچەرخەکان دەڵێن کە یاسای ئاسنینی ئۆلیگارشی، بەراستی لە ئاسن دروست نەکراوە. راستە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا ئارەزویەکی زۆر لەئارادایە بۆ زیادبوونی ژمارەی نوخبەگەلی دەسەڵاتدار، بەڵام دەتوانرێ دژایەتی ئەو ئارەوانە بکرێت و بەکەمترین ئاستی خۆیان بگەیەنرێن. لەلایەکی تریشەوە هاووڵاتییە ئاساییەکان، وەك چۆن ئەو خوێندنەوانەی باسمان کردن، بانگەشە دەکەن، ناعەقڵانی و دژە دیمۆکراسی نین. ئەوان هەروەها بانگەشەی ئەوەیان کردووەکە، راستە بەشداری هەموو لایەك لە سیاسەتدا، بە قازانجی سیستمی دیمۆکراس تەواو دەبێ، بەڵام بە مەرجێکی پێویست و حەتمی لە قەڵەم نادرێت. لە راستیدا ئەمکارە، لە ئەسڵدا بە قازانجی تاکە، بە وەك مرۆڤێك. لایەنگرێکی هاوچەرخی دیمۆکراسی، ئیدیعای ئەوە ناکات کە حکوومەتی دیمۆکراتیك لە جۆری کلاسیك، باشترین جۆری حکوومەتە، هەروەها هاوشێوەی لایەنگرە سەرەتاییەکانی، دامەزراندنی حکوومەتێکی لەوجۆرە بەزەرورەتێکی مێژوویی ناهێنێتە ئەژمار" بەڵام ئەو مۆڵەتەی پێ ئەدات کە خۆی تاقیبکاتەوە و کەڵك لە دەرفەتەکان وەربگرێت.

## بەرنامەو پلانەکان و ئەولەویەتەکان

ئەو ڕێگەچارە تەجویزییانەی کە دەرەنجامی تێگەیشتنی هەمەلایەنەی سیاسەت و تیۆرە سیاسییەکانن، لەخۆگری هەموو چارەسەرەکان نین. بەگشتی، تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان لە ڕێگەی سیاسەتەوە، دەبێتە هۆی سڕینەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەو پلانە سیاسییە پێشبینیکراوانەی کە بانگەشەی ناعەقڵانی بوونیان دەکات. ئەم لایەنە دەزفکەرو نێگەتیڤە، بەلایەنی تەجویزی تیۆرە سیاسییەکان دەژمێردرێت. تیۆرە سیاسییەکان لە ڕەهەندی ئیجابییەوە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە کام سیستمی سیاسی بۆ گەشە کردنی مرۆڤ پێویستە و کام سیستمی داواکراو لە لایەن مرۆڤەوە زەرووریيەو کامیان دەتوانرێ بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە. لە چوارچێوەی ئەم پێشنیارانەدا پێش ئەوەی بەرنامەیەکی تایبەتی سیاسی بەڕێوە ببرێت، دەبی هەندێ بڕیاری تریش دەربکرێن. گونجاوبوونی هەریەك لەو بڕیارانە، گرێدراوە بە هەندێ بەرنامەو مەسەلەی جۆراوجۆری تریشەوە. کەواتە بۆ نموونە تیۆرسێنە مارکسیستەکان و هەروەها لایەنگرانیشیان، سەرەڕای ئەوەش کە تێکڕا باوەڕیان بە دامەزراندنی کۆمەڵگای ناچینایەتی کۆمۆنیستی هەیە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەمەڕ باشترین ڕێگە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ناتەباو ناکۆکن و بیروڕای جیاوازیان هەیە.

لایەنی تەجویزی تیۆرەسیاسییەکان ناتوانێت مرۆڤ لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پێداویستی و دیاردەگەلێکی یەکسان و بەرابەردا، یارمەتی بدات بۆ هەڵبژاردنیان. ئێمە لە دنیایەکدا دەژین کە زۆربەی کات هەموو شتەکانمان لەبەردەستا نییە، کەواتە ناچار دەبین بڕیاری نابەدڵیش بدەین. هەندێ جار تەنها ڕێگەچارەی سیاسی کردەیی، سازشکردنێکە کە هیچ کەسیش لەسەداسەد پێی‌ڕازی نییە. لەوانەیە هەندێ‌جار ئەو ئامانجانەی مەبەستمانن، ناتەبابن و پێکەوە نەگونجێن. بۆ نموونە زۆربەی کات زەروورەتی لێهاتوویی (کارامەیی) سیاسی، دژە لەگەڵ ئامانجێکی هاوتای‌خۆیدا و لەوانەشە سەقامگیری سیاسی، پێویستی بەهەندێ پلان و بەرنامە هەبێت کە لە ڕێگەیانەوە بەناچار مافە کۆمەڵایەتییەکان ژێر پێ دەخرێن. تیۆرە سیاسییەکان، بە چاوپۆشی کردن لە لایەنە تەجویزییەکەیان، ناتوانن ئەم کێشە گەورە و ئاڵۆزە کە سەرچاوەی زۆربەی بابەتە سیاسییەکانیشە، چارەسەر بکەن.

ئەڵبەتە تیۆرە سیاسییەکان لەم قۆناغەشدا تاڕادەیەك ئەولەوییەتەکان دەس‌نیشان دەکەن. ئەوان بە پێی تێگەیشتنە جۆراوجۆرەکانیان لەسەر حەقیقەتەکان و ئیمکاناتەکان و زەرورەتەکان، ڕێگەچارەگەلێکی جۆراوجۆریش پێشنیاردەکەن. بۆنموونە دیارە هزرمەندێکی وەك جیمز مەدیسۆن بایەخێکی زیاتر بۆ ئازادی دادەنێ، تا هزرمەندانی وەك ئەفلاتوون، یان بی.ئێف. سکینێر. ئەم‌دوو کەسەی دوایی، زیاتر بۆ سەقامگیر سیاسی نرخ دادەنێن. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەرکام لەم

هزرمەندانە بەشێوازی تایبەتی خۆیان دەرك بە بابەتەکە دەکەن. ڕێگەچارەکانیشیان لەسەر بنەمای تێگەیشتنەکانیانەوە رائەوەستن. ئەوان وەك یەك لەبابەتەکان تێ‌ناگەن و ڕێگەچارەکانیشیان وەکوو یەك نین. بەگشتی ئەوان بە شێوەگەلی جۆراوجۆر دەبینن، کەواتە ڕێگەگەلی زۆریشیان لەبەردەمدایە بۆ بەدەستەوەدانی ڕێگەچارەکانیان.

بۆ نموونە مەدیسۆن لەو باوەڕەدا بوو کە سیستمێکی سیاسی لەبارو سەقامگرتوو، دەتوانێ لە چوارچێوەیەکی گونجاوو تاڕادەیەك دادپەروەرانەدا، ئازادی هاووڵاتییانی دابین بکات. لەلایەکی ترەوە ئەفلاتوون لەو باوەڕەدابوو کە ئازادی، یەکێتی و یەکپارچەیی و سەقامگیریی کۆمەڵگای سیاسی دەخاتە بەردەم مەترسییەوە و بەرەو نابوودی ئەیبات. ئەم دوو هزرمەندە بەدوو جۆری جیاواز بیریان ئەکردەوەو ئەولەوییەتەکانیشیان پێکەوە جیاوازییان هەیە" چونکە بیروڕاکانیان سەبارەت بە ئیمکاناتە سیاسییەکان تاڕادەیەکی زۆر جیاوازبوون. (ئەم باسە هێشتا بە ئاکام نەگەیشتووە. لەم ساڵانەی دواییدا کە ناکۆکی و کێشە دەروونییەکانی کۆمەڵگای سیاسی، بەدەرەنجامی ئازادی لەڕادەبەدەر لەقەڵەم ئەدرێن، ڕاڤەو لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنەکانی لەجۆری ئەوانە ئەفلاتوون، زیاتر بایەخیان پێ‌دەدرێ و پەرەیان سەندووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەمان لەیاد بێت کە فەلسەفە سیاسییەکەی مەدیسۆن و

دەسکەوتەکەشی ــ واتە کۆمەڵگای سیاسی راوەستاو لەسەر بنەمای یاسای ئەمریکا ــ دووسەد ساڵی خایاندووەو کاری پێکراوە).

کاتێ کە قسە لەسەر گرنگیی و زەروورەتی ئازادی تاکەکەسی و ئازادی کۆمەڵایەتی دەکرێ، ئەولەوییەتەکان لای بی.ئێف.ئسکینێر و مەدیسۆن فەرق دەکەن. دەتوانین بڵێین کە لەبنەڕەتدا ئەولەوییەت لای مەدیسۆن هیچ گرنگییەکی نییە. بەڕای ئەو "ئازادی" هەر چۆنێك بێت، لە خەیاڵ و وەهم زیاتر هیچ نییە. سەرجەم رەفتارەکانی ئێمە بە هۆی بارودۆخە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکانەوە بەسەرماندا ئەسەپێنرێن و باشتریش وایە بە شێوەیەك کۆنترۆڵ و تەعدیل بکرێن کە بەلای کەمەوە ئارامی و هێمنایەتی و ڕەزامەندیی کۆمەڵگا بپارێزرێت. بەڕای ئەو، ئەولەوییەتەکان شتانێکی رواڵەتی و رووکەشن. مەدیسۆن و سکینێر بە دوو رێگای جیاوازدا دەڕۆشتن" چونکە تێگەیشتنەکانیان لەسەر حەقیقەتەکان تەواو جیاوازبوون.

## پێشنیارەکان، وەك بیروڕاگەلی دوورئەندێش

تەجویز (پێشنیار)ەکانی تیۆرە سیاسییەکان تاڕادەیەکی زۆر لەرەچەتەی پزیشك ئەچن: ئەوانیش وەك رەچەتەی پزیشك لەخۆگری جۆرە ئیجبارکردنێکی تایبەتن. ئەوانە حوکمگەلی رەهای ئاکاری نین ("ئێوە دەبێ تەنها ئەو کارە بکەن!")، بەڵکوو

پێشنیارگەلێکن بۆ کەسانێك کە بایەخ ئەدەن بە سلامەتی خۆیان . ("ئەگەر دەتانەوێ تەندروست و سلامەت بن، دەبێ ئەم دەرمانە بخۆن!") ئەمانە بیروڕاگەلێکی دوورئەندێشانەن.

تیۆرسێنە گەورەکان بە پێی تێڕوانینیان لەسەر حەقیقەتە سیاسییەکان، بیروڕاکانیان دەخەنەڕوو. ئەگەر ئێمە تێڕوانینەکانی ئەوان پەسەند بکەین، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیك بەرانبەر رێگەچارە پێشنیارکراوەکان رەغبەت پەیدا ئەکەین، کەواتە دەچینە ناو بەشەوردترەکانی کارەکانیانەوە. ئەوان پێ لەسەر ئەوە دائەگرن کە تیۆرەکانیان بە تەنها پڕوپاگەندەکردن بۆ ویست و داخوازە تاکەکەسییەکانیان نییە، ئەوان جەخت لەسەر بابەتگەلێك دەکەنەوە کە پێیانوایە هەموو قازانجەکانی ئەو بابەتانە دەگەڕێتەوە بۆ خودی خەڵك.

## وتاری شەشەم

# ئەنجام گیری: تیٚ ڕوانین، ریٚگەچارەو باشترین زانست

ئامانجی ئەم کتێبە، خستنە ڕووی چوارچێوەیەکە بۆ تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان و بۆ ئەم مەبەستەش کەڵك لەو پرۆسەی راڤەو لێکۆڵینەوانە وەرگیراوە کە تیۆرسێنەکان بەکاریان هێناوە. هەوڵمان دا جۆری بیرکردنەوەی زەینی تیۆرسێن، هەر لە قۆناغی سەرەتایی و سەرلیٚشێواوییەوە بگرە تا قۆناغی ئەنجامگیری، بخەینەبەر راڤەو لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی لەسەر بکەین. هەوڵمان دا قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ئەم پرۆسەیە (واتە قۆناغگەلێك کە تیۆرسێنەکان وەك دەسکەوتێك بۆ داهاتووان بەجێیان هێشتوون، هەندیٚ جار و تاڕادەیەکیش تەماوی و تێکەڵپێکەڵن) بناسین و کێشە و گرفتەکانی چارەسەر بکەین. هەروەها هەوڵ دراوە ئەوە روون بکرێتەوە کە هەر قۆناغێکی لێکۆڵینەوە قۆناغێکی تازەتری بەدواوە دەبێت و بوار بۆ قۆناغی دوای خۆی دەڕەخسێنیٚ.

## توێژینەوەی تیۆری

پێداگرتن لەسەر رەوتی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی "چالاکیی" زەینی تیۆرسێن، سەبارەت بە تیۆرسازیی سیاسی، مۆدێلێکی چالاکترمان دەخاتە بەردەست.ئەم چوارچێوەیە زیاتر لە فیلمێکی راستەوخۆ دەچێ، وەك لە وێنەیەك. ئەم راڤەکردنەی تیۆرە سیاسییەکانیش وەکوو هەر فیلمێك دیمەن و سێکانس و دەورو ئەکتەرگەلێکی هەیە. تیۆرە سیاسییەکان، سەرەتایەکیان هەیە و لووتکەیەك. لە مەودای نێوان مەیلی دەسپێکردن و کۆتایی شانۆکەدا ڕستیّ کاری تەواو قورس و فرۆفێڵگەلێکی دارێژراو بوونیان هەیە. لەراستیدا رەوتی فیکری هەرتیۆرسێنیکی پڕکاری سیاسی، لەکاری کۆمیسێرێکی بەتواناو لێهاتوو دەچێت. کێشەی تیۆرسێنیش، وەك کێشەی کۆمیسێر، لە بێنەزمی و پشێوی و ئاژاوەوە دەست پێدەکا" بەو جیاوازییەوە کە کێشەی تیۆرسێن، تاوانی تاکەکەسی نییە، بەڵکوو شڵەژاوێتی و پشێوی هەموو کۆمەڵگایە بەگشتی.

تیۆرسێن سەرەتا لە بێنەزمییە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەس پێدەکاو وەك کۆمیسێرێك بەدوای "سەرەداو"دا دەگەڕێت. ئەو

دەبێ گومان لە هەموو شتێك بكات و بەدوای هۆكاری سەرەكی كێشەكاندا بگەڕێ كە زۆربەی كاتیش نادیار و تەماوین. "بۆچی كۆمەڵگا ئاژاوەی تێكەوتووە؟". "بۆچی ژیانی تاكەكان نالەبار و شلەژاوەو ئەوانیش نارەزاییدەرئەبڕن؟". ئەفلاتوون دەڵێ بۆچی دەبێ ئەسینا شەریفترین و چاكترین هاوولاتی خۆی دادگایی بكات و حوكمی لە سێدارەدانیشی بۆ دەربكات؟ ماركس دەڵێ بۆچی زۆربەی خەڵك دەبێ بە خۆنامۆبن و بچەوسێنرێنەوە؟ هۆبس دەڵێ بۆچی دەبێ بەریتانیا پڕبێ لە كێشەگەلی كۆمەلایەتی؟ خوێندنەوەی چالاكییە رەینییەكانی تیۆرسێن لە قۆناغی لێكۆڵینەوە و پۆلێنكردنی بەڵگەو نووسینەكانیدا، هێندەی شەڕی نێوان كۆمیسێری بە ناوبانگ "شێرلۆك هولمێز" و ئاژاوەچیترین پیاو "دوكتۆر موریاتی" سەرنج راكێشە.

سەرەنجام تیۆرسێن پەروەندەكەی تەواو دەكاو ئەوشتەی كەبەڕای ئەو، هۆكاری سەرەكی پشێویەكانە ئەدۆزێتەوە. بۆنموونە هۆبس كۆمەڵگای سیاسی و چالاكیی هەموو بەشەكانیشی دەخاتەبەر راڤەو لێكۆڵینەوە و سەرچاوەی پشێویەكانیش دەگەڕێنێتەوە بۆ حەزو تاسە بەردەوامەكانی مرۆڤ و، بەو دەرەنجامە دەگات كە رەفتاری مرۆڤە

دەسەڵاتخوازەکان، سەرەنجام دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕە ناوخۆییەکان، کەواتە دەوڵەت دەبێ کۆنترۆڵیان بکات. مارکسیش دوای خوێندنەوەی هەموو سەرەداوەکان، دیاردەی موڵکایەتی تاکەکەسی، بەهۆکاری سەرەکی هەموو کێشەکان لەقەڵەم ئەدات. هەروەها برێك، شێتی و توندڕەوی شۆڕشی فەرەنسە، بەدەرەنجامی خەونە ئامانجخوازانەکانی رۆشنبیرە بۆرژواکانی فەرەنسە لە قەڵەم ئەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەك ئەم نموونانە دەری دەخەن، تیۆرسێن لە بوارەکانی تریشدا پەروەندەکانی تەواو دەکات. بەو مانایە کە لە راڤە و شیکردنەوەکانیدا زۆربەیکات کەسانێکی گەورە و بەرجستە بەتاوانی بەشداربوون لەتاوانێکدا بە تاوانبار دەزانێت. کەواتەئەفلاتوون لە راڤەکارییەکانیدا سەبارەت بە مەرگی سوقرات، کۆمەڵگای ئەسینا و رێبەرە گەندەڵەکانی تاوانبار دەکات. لە لێکۆڵینەوەکانی مارکسدا، بۆرژوازی لە ژێرناوی "زانستی بوونەوە" تاوانبار دەکرێ و هەروەها مەکیاڤیلی لە کاتی راڤەکردنی بارودۆخی نالەباری دەوڵەتەشارەکانی ئیتاڵیادا، لە راستیدا رێبەرە نەفس نزم و ترسنۆکەکانی ئەو دەوڵەتەشارانە بە تاوانبار دەزانێت. هۆبس و رۆشنبیرە ئازادیخوازەکانیش هەرکام لە روانگەی خۆیانەوە

هێرش دەکەنە سەر کلێسەی کاتۆلیك و فەلسەفەی ئەرستۆ و بە توندی رەخنەیان لێ دەگرن.

دەسکەوتەکانی تیۆرسێنە سیاسییەکانیش وەك دەسکەوتەکانی کۆمیسێرێکی کارامەو لێهاتوو، هەرگیز بەتەواوەتی بەدوور لە ویست و مەبەستگەلی تاکەکەسی نین. ئەڵبەتە تیۆرسێن بە پشتبەستن بەوەی کە سەروکاری لەگەڵ سەرچاوە سەرەکییەکان و کێشەکان وپاشان رێگەچارەگەلی لۆژیکییەوە هەیە، هەوڵ ئەدات کارەکانی تەواو "عەینی" بن. بەلام بێگومان دۆزینەوەی سەرچاوەکان لە لایەن ئەم تیۆرسێنەوە، دەبێتە هۆی ئەوە کە هەندێ لە ئەندیشە و کردەوەکان بە مەشرووع و عەقلانی و هەندێکیتریان بە نادروست و بێمانا لە قەڵەم بدات.

لەبەر ئەوەشە کە تیۆرە سیاسییەکان، دەمەتەقێ و قسەو باسی زۆر ئەورووژێنن. زۆربەی کات بابەتگەلی گرنگ و هەروەها بەرژەوەندییە حەقیقییەکان دەورێکی سەرەکی دەبینن. بۆ نموونە لایەنگرێکی موتەعسیبی دیموکراسی، بەبێ موناقەشەیەکی گەورەی لۆژیکی، حازر نییە نە قسەکەی ئەفلاتوون قبووڵ بکات سەبارەت بەوەی کە خەڵکی رەمەکی مەترسیدارە و قابیلی متمانە پێکردنیش نییە، نە قسەکەی

میشلز سەبارەت بە یاسای ئاسنینی ئەلیگارشی قبووڵ دەکات. بەڕاست زانینی قسەکانی ئەوجۆرە کەسانە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ بە بیروڕا تاکەکەسییەکانی خۆیاندا بچنەوە، کە ئەوەش کارێکی سەخت و ئازاردەرە. هەر بەم پێیە مارکسیستێکی باش، رەخنە لە باوەڕەکانی فرۆید سەبارەت بە هۆکارەکانی رەفتاری مرۆڤ دەگرێت و، بەرپرسی کۆمپانییەکی گەورە، ناتوانێت پاش شیکردنەوەو راڤەکارییەکانی مارکس سەبارەت بە نامۆبوونی کۆمەڵگای سەرمایەداری، هەست بە ئارامی و هێمنایەتی بکات.

ئەو باوەڕانەی کە لە تیۆرە سیاسییەکاندا دەخرێنەڕوو، دەرەنجامگەلێکی گرنگی زۆریان بە دواوەیە. کەسانێك کە لەو دەرەنجامانە دەترسن، ئەوە مەیلە دەروونییەکانیانن کە هانیان ئەدەن دژایەتی ئەو باوەڕانە بکەن. زوربەی کات ئەو قسەو باسانە لە تیۆرە سیاسییەکاندا دەخرێنەڕوو، یەکجار توندو ئاگرینن، چونکە ئەوانە بەتەنها وەك وانەگەلی پۆلەکان و قوتابخانەکان نین. ئەگەر تیۆرێکی تایبەتی سیاسی، قبووڵ بکرێت و پاشان ناوبانگ دەربکات، زۆرێك لە خەڵك زیانیان بەر دەکەوێ و زۆرێکی تریش قازانج ئەبینن.

## مۆدێلەکان

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ڕەوشی "فیلمی ڕاستەوخۆ" لە کاتی خوێندنەوەی قۆناغە جۆراوجۆرەکانی تیۆرسازیدا ئەوەیە کە یارمەتی مرۆڤ ئەدا تا بتوانێت مەسەلە هەمیشەیی و جیهانییەکان بخاتە نێو ژیانییەوەو پیشانیان بدات. لە هەر کات و شوێنێکدا کە ئامانجی مرۆڤ، تێگەیشتنی چییەتی کێشەیەکی سیاسی بێت، هەندێ پرسیاری گرنگی لادروست دەبێ وەك ئەمانەی خوارەوە: هیوایەتە سروشتییەکانی مرۆڤ کامانەن؟ چۆن دەتوانرێ کۆمەڵگا، هەم لە دەست شەڕە ناوخۆییەکان ڕزگار بکرێت و هەمیشە ڕێك‌وپێکی پێ‌ببەخشرێت؟ ئەگەر کاری لەو جۆرە لە توانادایە، چۆن دەتوانرێ ئاشتی و سەقامگیری پێکەوە ئاشت بکرێنەوە؟ سیاسەت تا چەند دەتوانێ مرۆڤ بەختەوەربکات و لەو بوارەدا یارمەتی بدات؟ بەدەرك پێ‌کردنی جموجۆڵی تیۆرە سیاسییەکان، دەزانین کە کەی و بۆچی ئەو جۆرە پرسیارانە قوت دەبنەوە؟ هەروەها لەوەش تێ‌دەگەین کە ئەم پرسیارانە مرۆڤ بەرەو کوێ دەبەن و بۆچی وەڵامەکانیشان گرنگی زۆریان هەیە؟

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ڕەوشی "فیلمی ڕاستەوخۆ" ئەوەیە کە لایەنە مرۆییەکانی لێکۆڵینەوە سیاسییەکان باشتر ڕوون دەکاتەوە. تیۆرە سیاسییەکان

بەرهــەمی بارودۆخگــەلێکی "بابــەتی"ن، نــەك بینینیــان بــە شـێوەیەکی ئەبســتراکت و بــەهۆی کەســانێکەوە کــە بــە حــەزو تاســەیەکی زۆرەوە ســەروکاریان لەگــەڵ ئــەو مەســەلانەدا هەیــە. لەراستیدا تیۆرسێنەکان بەشێکن لە سیستەمی سیاسی، کەواتە هــەم خوێنــەرن و هــەمیش بابــەتی خوێندنــەوە. شـیکردنەوە و راڤەکارییەکانی تیۆرسێن، هەمیشە تاڕادەیەك خوێندنەوە لەسەر خودی خۆیەتی و کەواتە تیۆرەسیاییەکان لە راستیدا "ئیعتراف نامە"ن. تیۆرسێن بەخستنەڕووی تیۆرە سیاسییەکەی خۆی، لە راستیدا خودی خۆی دەخاتەڕوو. ئەو، واتای "بوون"ی خۆی بە عینوانی ئاژەڵێکی سیاسی، سەلماندووە.

هێــزە عاتیفییــەکانی مــرۆڤ، لــە دواراڤەکاریــدا، ســەرەتا تاکۆتــایی تیــۆرێکی سیاســی پێــك دێــنن. یەکــەم هانــدەری ســەرەتایی توێژینــەوە سیاســییەکان لــە کاتێکدایــە کــە مــرۆڤ گــیرۆدەی قەیرانــە ئــازاردەرە سیاســییەکان ببێــت و لــە ڕووی فیترییــەوە کــاری تــێبکــەن و وەڕەز بێــت بەدەستیانەوە. وە ئــەو ئارەزووە سروشتییانەی مرۆڤ کە ناچاری دەکەن ڕەفتارگەلێکی راســـتەقینەو سیســـتماتیك کـــە پڕبەپێیســـتی فشـــارە سیاسییەکانیشــن لــەخۆ پیشــان بــدات، پێــك هێنــەری هێــزە تەجویزییەکانی تیۆرە سیاسییەکانن. ئەگەر ئەم لایەنەی تیۆرە سیاســییەکان بسـڕدرێتەوە، رشــتەی فەلســەفەی سیاســی، وەك رووکەشێك وایە کە هێز و ماناو گرنگیی خۆی لە دەست دابێت.

تیۆرە سیاسییەکان، دەرەنجامی ئەو شتەن کە ئەرستۆ بە "ئەقڵی کردەیی" مرۆڤ ناودێری دەکا. ئەوانە زنجیرەیەك لە باوەڕگەل و تێگەیشتنە سیاسییەکانن کە بە مەبەستی زاڵ بوونی مرۆڤ بەسەر کێشە سیاسییەکاندا خراونەتەڕوو. هێنانە ئارای تیۆرە سیاسییەکان، قۆناغ گەلی دوابەدوای یەکی "گریمانە" تا "دەرەنجام" نابڕن، بەڵکوو پرۆسەیەکە کە لە خوێندنەوەی کێشەکانەوە دەس پێ دەکاو بەرەو ڕێگەچارەکان دەچێت. جموجۆڵە دەروونییەکەشی هەڵقوڵاوی گوشاری "لۆژیك"ی ئەبستراکت نییە، بەڵکوو دەرەنجامی تێڕامان و بیرکردنەوەی هزرمەندانێکە کە خۆیان بە بارودۆخە سیاسییەکانی مرۆڤەوە خەریك دەکەن و پێیانەوە ماندوو دەبن.

لە وتارەکانی پێشتردا هەوڵمان دا ڕەوتی ئەم ئەقڵە کردەییە ڕوون بکرێتەوە. هیوادارم ئەو چوارچێوانەی لەم کتێبەدا خراونەتەڕوو، بۆ ئەو کەسانەی کە حەز ئەکەن دەرك بە تیۆرسازییە سیاسییەکان بکەن، قازانج و کەڵکی زۆری هەبێ.

لە پلەی یەکەمدا هیوادارم کە چوارچێوە ئاراستەکراوەکانی ئەم کتێبە تێگەیشتنی بیرۆکە تاکەکەسییەکانی تیۆرسێنەکانی وەك ئەفلاتوون و هۆبس و ئەرستۆ ئاسانتر بکەن. خوێنەری ژیرو بە توانا دەبێ بتوانێت بە بێ هیچ کێشە و گرفتێك، لەویست و ئامانجی تیۆرسێنیك تێبگات. بە تایبەت دەبێ بتوانێت مانا بە "لۆژیك"ی توێژینەوەیی تیۆرسێن ببەخشێت. واتە ئەو دەبێ بتوانێت ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی ڕەوتی بیرکردنەوەی تیۆرسێن

و پێوەندییەکانیشیان بەیەکەوە دەرك بکات. ئەو دەبێ بتوانێت نەك تەنها لە باوەڕەکانیان تێبگات بەڵکوو هۆی خستنەڕووی ئەو باوەڕانەش بناسێت. خۆ ئەگەر ڕەهەندێکی تیۆری نادیار و تەم مژاوییە، یان نوقسانی هەیە، ئەو دەبێ بتوانێت ئەو نوقسانییە چارەسەر بکات، یان بزانێت چۆن دەبێ بەدوایدا بچێت.

ئەم ڕەوشە، دەرك پێکردنی دینامیزمی تیۆرسازی سیاسی و هەروەها هەڵسەنگاندنی تیۆرە سیاسییە جۆراوجۆرەکان ئاسانتر دەکا. لەو ڕووەوە کە تیۆرسێنەکان هەڵقولاوی فەرهەنگ و بارودۆخگەلێکی جۆراوجۆرن، کەواتە تیۆرە سیاسییەکانیشیان ناتوانن بە تەواوەتی لەیەك بچن و وەك یەك بن. ئەڵبەتە مێژووی تیۆرە سیاسییەکان، وتووێژو دیالۆگێکە کە تیایدا تیۆرسێنەکان بۆ یەکدی و لەگەڵ یەکدا قسەدەکەن هەرچەند ئەو پشێوییانەی کە هەر کام لەوانە بینیویانە جیاوازییان هەیە و لەیەك ناچن، بەڵام بایی ئەوە وێکچوونیان تێدا هەیە کە بتوانرێت قسە لەسەر "کێشەگەلی وێکچوو" بکرێت. سەرەڕای ئەوە کە لەگەڵ کێشەگەلێکی وێکچوودا ڕووبەڕوون، بەڵام هەر تیۆرسێنێك بەدەرەنجامی تایبەتی خۆی دەگا. واتە بەم پێیە دەتوانین تێڕوانینەکانی هۆبس و ڕۆسۆ لێك جیا بکەینەوە. خوێنەری لێزان دەبێ بتوانێ لایەنە ناهاوبەشەکانیان بناسێت و فەلسەفەو هۆی ئەو جیاوازییانەش دەرك بکات.

سەرەنجام ئەم چوارچێوەیە، یارمەتی خوێنەری جیدی ئەدات کە تێڕوانینە سیاسییەکەی خۆی باشتر بناسێت، هەروەها وای لێدێ بتوانێت لە "ئایدۆلۆژیای ناخودئاگا"ی خۆی تێبگات و باش بیناسێت. ئەو توانایەش بەدەس ئەهێنێ کە دەرك بەو

باوەڕە هەستیارە سیاسییانەی بکات کە باوەڕ و ڕەفتارەکانی ئەویان پێك هێناوە و لەگەڵ ئەوەشدا داوەری کردنە سەرەکی و بنەڕەتییەکانیان بناسێت و بیانخاتە بەرڕاڤە و لێکۆڵینەوەی وردەوە. بە پێی نەریتی سوقراتی "مێشوولە"، تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان ڕەنگە ئەو باوەڕانەی کە لای خوێنەران بە حەقیقەتی ڕەها لە قەڵەم ئەدرێن، بچزێنێت و گومانیان لێ بکات.

ئامانجی ئەم کتێبە تەنها خستنەڕووی ئەم چوارچێوە بوو، بەڵام هەندێ جاریش لە میانەی باسەکاندا، نموونەگەلێکێش لە تیۆرسێنە سیاسییە گەورەکان هێنرایەوە. ئەڵبەتە هێندەی بۆمان کرا، ئەو نموونانەمان کورت کردەوە. ئەگەر بمانەوێ بە تەواوەتی هەموو لایەنەکانی ئەم چوارچێوە دەرك بکەین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە سەرەکییەکان، واتە کتێبە کلاسیکیەکانی تیۆرە سیاسییەکان. هەوڵماندا وە پرۆسە و میتۆدی تیۆرەکانیان روونتر و ئاشکراتر لە ڕەوشی خودی تیۆرسێنەکان روون بکرێتەوە. بەڵام بەمەبەستی تێگەیشتنی گرنگیی و ناوەڕۆکی تیۆرە سیاسییەکان، هیچ شتێ لەوە باشتر نیە کەراستەوخۆ بەرهەمەکانی بخوێنینەوە.

خوێندنەوەی ڕاستەوخۆی دەقی تیۆرە سیاسییەکان مانا بە هەندێ بوار دەبەخشێت کە کاری ڕوونکردنەوە دەکەن (ئێمەش لێرەدا تەنها ئاماژەمان پێ‌کردوون). بۆ نموونە لە پلەی یەکەمدا دەبێ ناوەڕۆك ببەخشین بەو بانگەشەیەی کە دەڵێ تیۆرە سیاسییەکان زۆربەی کات بە "باشترین زانست" [تاجی سەری زانستەکان] ناودێرئەکرێن. دەبێ ئەوەمان بۆ ڕوون بووبێتەوە کە بۆچی تیۆرە سیاسییەکان بە جۆرە "تێڕوانین"ێکی سیاسی

لەقەڵـەم دەدرێـن. هـەروەها دەبـێ ئـەوەش روون بووبێتـەوە کـە بۆچی تیۆرە سیاسییەکان بە جۆرە چارەسەرێك لە قەڵەم دراون.

## باشترین زانست

تیـۆرە سیاسـییەکان تـەنها لەبـەر ئـەوەی کـە بایـەخیان لـە زانسـتەکانی تـر زیـاترە، یـان لەبـەر ئـەوەی کـە لـە دیقـەت و وردبینییـەکی زیـاتر بەهرەمەنـدن، بـە باشـترین زانسـت لـە قەڵـەم نـادرێن. لـە راسـتیدا هـەروەك ئامازەمـان پێکـرد، هـیچ تیـۆرێکی سیاسی بانگەشەی ئەوە ناکات کە بەدەرەنجامێکی پەسەندکراو گەیشتووە، دەرەنجامێك کە قابیلی ئیسبات کردن بێت. تیـۆرە سیاسـییەکان هەمیشـە لـە هەنـدێك لـە لایەنـەکانی ژیانـدا، پەنادەبەنە بەر حەدس و گومان. بە پێچەوانەوە، هۆی ئـەوەی کـە تیۆرە سیاسییەکان خۆیان بە باشترین زانست ئەزانن ئەوەیە کە ئەوانە لە گونجاوێتی و بەرفراوانییەك بەهەرەمەندن کە لەو رووەوە هـیچ زانسـتێکی تـر نـاتوانێ شـانلەشـانیان بـدات. تیـۆرە سیاسییەکان هەم لە توێژینەوەکانی‌تر بەرفراوان ترن و هەمیش کاریگەرییـەکی سـەرەکیتر و راستەوخۆتر لەسـەر رەفتـاری مـرۆڤ دادەنێن.

تیـۆری سیاسـی، بـە تـێروانینێکـی هەمەلایەنـە لەسـەر سیاسـەت لـە قەڵـەم ئـەدرێ و وەکـوو لووتکـەی هـەرەمێك،

لەســـەرەوەی (ر أس) هـــەرەمی ئەندیشـــەدایە. لـــە تەبەقـــەکانی خـــوارتری ئەوهەرەمـــەدا رشـــتەگەلی تایبـــەتی زانســـتی مرۆڤـــی (علـــوم انســـانـي) وەك ئـابووری و دەروونناسـی لەنگـەریان گرتـووە. ئەڵبەتـە هەنـدێ جـاریش زانسـتی سروشـتی (علـــوم طبیعـــي) توانـای ئـەوەیان دەبێـت بچـنە ئـەو خانەیـەوە. تیـۆرە سیاسـییەکان لـەو روەوە کـە وەکـوو "سـەری هـەرەم" لەسـەرەوەی چینەکانی تـرەوەن، دەشـتوانن بـە بـاڵاتر لـە زانسـتەکانی تـر لـە قەڵـــەم بـــدرێن. لایـــەنێکی تـــری مەســـەلەکە ئەوەیـــە کـــە تیـــۆرە سیاســـییەکان گرێـدراون بـە هـەموو ئـەو زانسـتانەی تـر کـە لـە تەبەقـەکانی خـوارتردان. وەك پاڵـەوانێکی "ژیمناسـتیك" کـە لـە ســـەری هـــەرەمی وەرزشـــکارەکانی تـــردا وەســـتاوە. تیـــۆرە سیاسـییەکان دەبـێ لـەوە دڵنیـابن کـە ئەنـدامانی پێـکهێنـەری هەرەمەکـە [واتـە زانسـتەکانیتـر] بـاوەڕ پێکـراو و قـابیلی متمانـە پێکـردن بـن، چـونکە ئەگـەر تەبەقـەکانی خـوارتر کـە پشـتیوانی تیـۆرێکن، کـەم و کوڕییـان تیـا هـەبێت، سەرجەم بینـای تیۆرەکـە تێك دەشکێ و دەڕووخێت.

هەنـدێ لـە تیۆرسـێنەکان بـە تـەواوەتی پشـت بـە تیـۆرە ئابوورییـــەکان دەبەســـتن. مـــارکس نموونەیـــەکی ئاشـــکرایەتی. مـارکس کتێـب گـەلێکی زۆری تـەرخان کـردووە بـۆ راڤـەکاری و

شیکردنەوەی ئابووری سەرمایەداری. لیبراڵەکانی لایەنگری ئابووری ئازادو تیۆرە کلاسیکە ئابوورییەکانیش پێوەندییەکی ئاشکرا و تەواویان بەیەکەوە هەیە. بەهەرحاڵ، کاریگەرێتی ئەم تیۆرە سیاسییانە تاڕادەیەکی زۆر گرێدراوە بە تێگەیشتنە جۆراوجۆرە ئابوورییەکانەوە.

زۆرن ئەو تیۆرە سیکۆلۆژیکییانەی کە بناغەی تیۆرە سیاسییەکان پێك دێنن، چونکە بە دەگمەن دەتوانرێت ئاوڕ لە فیترەت و پێکهاتەی مرۆڤ نەدرێتەوە و بتوانرێ وێنایەکی کامڵ لەسەر سیاسەت بەدەستەوە بدرێت. شیکردنەوەو راڤەکارییەکانی ئەفلاتوون لەسەر کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان، لەسەر بنەمای تێگەیشتنی ئەو لە رۆحی مرۆڤ بنیات نراوە. هۆبس و رۆسۆ و ئەرستۆ هەریەکەو بەشێواز و سیاقی خۆیان راڤەکارییەکی بەرفراوان لەسەر ویست و ئارەزووە مرۆییەکان ئەنجام ئەدەن. تێگەیشتنی سیاسی مارکۆزە و فرۆم لەگەڵ تێگەیشتنی رەشبینانەی فرۆیددا جیاوازییان هەیە، چونکە لێکدانەوەیان لەسەر دینامیزمی رۆحی مرۆڤ، وەك یەك نییە. نموونەی لەو جۆرە زۆرن. تەقریبەن هەموو تیۆرە سیاسییەکان پشت بەراڤەکاریگەلێکی جۆراوجۆری سیکۆلۆژیکی لەو جۆرەوە دەبەستن. جۆرەکانی فەلسەفەی مێژوو و هەروەها تیۆرە

جۆراوجۆرەکانی سەبارەت بە زانستە مرۆییەکانیش، دەتوانن ببنە بناغەی تیۆرە سیاسییەکان. بۆ نموونە هێگڵ و مەکیاڤیلی، ئەو رۆشنگەرییەی کە سەبارەت بە دینامیزمی مێژوو دەیخەنەڕوو، بەتایبەتمەندی سەرەکی تیۆرە سیاسییەکانی خۆیان لەقەڵەم ئەدەن. ئەفلاتوون و هەروەها فەیلەسوفانی سەردەمی رێنسانسیش خوێندنەوەی زۆریان سەبارەت بە تیۆرە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆییەکان و هەروەها سیستەمەکانی فێرکاری و راهێنان ئەنجام داوە. تێگەیشتنی ئەوان، لەسەر ئەم مەسەلانە، دەرەنجامگەلێکی زۆر و گرنگیان لێ کەوتەوە.

تەنانەت رەنگە تیۆرە سیاسییەکان بۆ دانانی بەردی بناغەی تیۆرەکانیان، کەڵك لە زانستی سروشتیش وەربگرن. بۆ نموونە هۆبس خوێندنەوەیەکی زۆری لەسەر کرۆکی "بزاوت" ئەنجام دا، چونکە لەو باوەڕەدابوو کە دەرك کردنی جموجۆلی کۆمەڵگای سیاسی، بە بێ‌دەرك کردنی دینامیزمی رەوتی "بزاوت" لە توانادا نابێت. هەر بەم پێیە، "داروینیزمی کۆمەلایەتی" بۆ شرۆڤەکردنی ژیانی سیاسی، کەڵك لە تیۆری "تەکامول"ی داروین وەردەگرێت. بەڕای هزرمەندانی ئەم تیۆرە، دەرك کردنی سیاسەت گرێدراوە بە دەرك کردنێکی گونجاوی هێزەکانی ژینگە ناسییەوە.

کەواتە ناتوانین بە ئاسانی پێشبینی ئەوە بکەین خوێنەرێک کە دەس ئەکا بە خوێندنەوەی کتێبەکانی تیۆرە سیاسییەکان، بە چ ئاقارێکدا دەچێ و سەرەنجامی چی دەبێت؟ ڕەنگە بکێشرێتە قەڵەمڕەوی خوێندنەوەی ستاتیک و مەعریفەناسی و ژینناسی، یان ئابوورییەوە. بەڵام ئەگەر لە شێوەی لەنگەرگرتنی تیۆرە سیاسییەکان لە هەرەمی زانستەکاندا تێبگات، پەی بەوە دەبا کە بۆ سەر سفرەیەکی ناڕێکوپێک و قەرەباڵغی فیکری بانگهێشت نەکراوە. تیۆرسێن تەنها بناغەی هەنگاوەکانی دواتر دەخاتە ڕوو.

خوێنەر نەک تەنها نابێ لەو لاڕێ فکرییانە (ڕێی چەوت و نادروست) بترسێت کە تیۆرسێن ڕووبەڕووی دەکاتەوە، بەڵکوو دەبێ هەوڵ بدات تا لە مەبەستی تیۆرسێن بۆ هەڵبژاردنی ئەو لاڕێ گەلە تێبگات. ئەو دەبێ هەوڵ بدات بزانێ بۆچی لای تیۆرسێن، هەندێ تیۆر سەبارەت بە دەروونناسی و مێژوو و فیزیک، گرنگیی زۆریان هەیە؟ تێگەیشتنی پێوەندی نێوان ڕوانینی سیاسی تیۆرسێن و ئەو زانستانەی کە تیۆرەکەی لەسەر دامەزراندوون، کلیلی ڕاستەقینەی تێگەیشتن لە تێڕوانینی ئەو لەسەر جیهانە.

## ‹ ڕوانگەی چارەسەرئامێزو › و عەقڵی کرداری

بۆ جارێکی تریش ڕووبەڕووی وشەی "تێڕوانین" دەبینەوە کە لەم کتێبەدا زۆر دووپات بۆتەوە. لە کۆتاییدا باشتروایە جارێکی تریش جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە ئەو خوازانەی بە کارهێنراون، بەهەڵکەوت و تەسادوفی نەبوە. هەروەك ئەم چوارچێوەیە دەری دەخات، تیۆرە سیاسییەکان لە پلەی دووهەمدا و بە شێوەیەکی "ئیشتقاقی" زنجیرە بابەتگەلێکی ئەبستراکتن. یان دروستتر بڵێین" تیۆرە سیاسییەکان تێگەیشتنگەلێکی سیستماتیك و زنجیرەئاسان سەبارەت بە ژیان.

سەرەنجام، ئەوانە وەك جۆرە جیهانبینییەك وان. لەبەر ئەوەش کە بینەر خۆی بەشێکە لە دنیای سیاسەت، نەك بەتەنها توخمێکی بێ لایەن" کەواتە شێوازی بینین دەبێتە ڕێگایەکیش بۆ بینینی خۆی. دەرەنجامەکەش ئەوە دەبێ کە تێڕوانینە جۆراوجۆرە سیاسییەکان، ڕەفتارگەلێکی جۆراوجۆری سیاسییان لێ دەکەوێتەوە.

پاش شیکردنەوەی تیۆرە سیاسییەکان و خوێندنەوەی هەموو بەشەکانیان ـ واتەخوێندنەوەی قۆناغی بینینی بێنەزمی، دەستنیشانکردنیهۆکارەکان، بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا و سەرەنجام قۆناغی پێشنیارەکان (تەجویزەکان) ــ لە کۆتاییشدا

دەبێ قسە لەسەر گشتێتی جیهانبینیش بکرێت. دەبێ لەدەلاقەی تێڕوانینی تیۆرسێنەوە جیهان ببینین، نەك تەنها باوەڕەکانی ببینین و هیچی‌تر. دیارە بۆ تێگەیشتنی تیۆرێکی سیاسی، پێویستە "لۆژیك"ە کەشی دەرك بکەین. هەروەها هەموو قۆناغەکانی توێژینەوەی تیۆرسێن دەرك بکەین و بزانین هەریەکە لەم قۆناغانە چ پێوەندی گەلێکیان بە یەکەوە هەیە؟ بەڵام کاتێك ئەم قۆناغە دوایی هات، مرۆڤ دەبێ لە تێگەیشتنی باوەڕەکانیش تێی بپەڕێنێت و بگاتە قۆناغی "ڕووبەڕووبوونەوەی خەیاڵی" ـ واتە بینینی جیهان لە ڕوانگەی تیۆرسێنەوە ـ و جیهان لەو ڕێگەیەوە تاقی بکاتەوە.

بێگومان هیوایەتی تیۆرسێن ئەوەیە کە هاوڕایی و تێگەیشتنی خوێنەر لە باوەڕەکانی ئەو، بە شێوەیەکی دەرسی و وانەئاسا نەبێت، [بەڵکوو قووڵتر لەوە بێت]. ئەو حەز ئەکات خوێنەر بۆ هەمیشە جیهان لە ڕوانگەی ئەوەوە ـ کە بەروانگەیەکی تەواو دروستی دەزانێت ـ ببینێ. تیۆرسێن بە تەنها بۆ ئاگاداری خوێنەرانی شت نانووسێ، بەڵکوو دەیەوێ وەرچەرخانێکی فکری تیا بێنێتەئاراوە. هەروەها دەیەوێ تێڕوانین و جیهان بینی خوێنەرەکانی، چاکسازییان تیابکرێت، تاکوە لەو ڕێگەیەوە ژیانێکی سیاسی ئاقڵانەتریان هەبێت.

بەکورتی، ئەو زانستەی کە تیۆرسێنەکان دەیخەنەڕوو، هەندێویستی مەیلەو (چارەسەرکردنیشیان) تیایە. وشەی periagoge (کە لە زمانی یۆنانیدا بەواتای وەرچەخانی فکری دێت، مانا قامووسییەکەی "گەڕانەوەو گۆڕینی ئاڕاستە"ە) کە سەرەنجام بەواتای (چارەسەر کردن) بەخشێ. بەرهەم و دەرەنجامی تیۆرشنگەرانە، ئەقڵی کردارییە، واتە جۆرە زانستێکی رزگارکردن. کەسێك زاناو ئاقڵە کە بابەتە سیاسییەکان وەکوو خۆیان دەبینێ و ئەوەش دەزانێ کە دەبێ چۆن رەفتار بکات. ئەوەش دەزانێ کە بەمەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی باش و دادپەروەر، دەبێ چۆن چالاکی بنوێنێ.

تەنانەت ئەو تیۆرسێنەی کە ناتوانێت بە تەواوەتی خوێنەرانی قەناعەت پێ بکات، رەنگە بە هۆی چاکسازی کردن لە "تێڕوانین" یاندا ژیانیان بگۆڕێت و بەلایەکی باشتریاندا بەرێت. تەنانەت ئەگەر خوێنەرانیشی، جیهان لە روانگەی ئەوەوە نەبینن، بەو حاڵەشەوە جیهانبینییەکی باشتر پەیدا دەکەن بەرانبەر حەقیقەتەکانی ژیان و بە تایبەت ئەو حەقیقەتانەی کە هەرگیز بیریان لێ نەکردوونەتەوە. خوێنەرێك کە پاش خوێندنەوەی ئەفلاتوون، مارکس، هۆبس و رۆسۆ نەتوانێت ئاگاییەکی قووڵ سەبارەت بە کێشەگەل و ئیمکاناتە سیاسییەکان بەدەس بهێنێت، بێگومان خوێنەرێکی سست و ناوردبینە.

کاتێ کەسێك پرسیار دەکا کە ئامانجی تیۆرە سیاسییەکان چییە؟ یان خوێندنەوە و خۆخەریککردن پێیانەوە، چ قازانجێکی هەیە؟ دەمخاتەوە یادی ئەو پۆسکارتانەی ساڵی تازە، کە "ئەدلی ئستیۆنسۆن" سیاسەتمەداری ئەمریکی بۆ هاوڕێکانی دەناردن و تیایاندا نووسرابوو: "لەسەرەتای ئەم ساڵە تازەیەدا حەز ئەکەم دۆعایەکتان وەبیر بێنمەوە کە لەسەرۆکی قەبیلەیەکی سوورپێستەکانەوە فێریبووم. لەو دۆعایەدا داوا لە "رۆحی گەورە" کرابوو کە رووناکی بخاتە سەر ئەو رێگە تاریك و پڕ لە بەردانەی کە لە پێشماندان.

تیۆرە سیاسییەکان، نیعمەت و نێردراوی خودایی نین. ئەڵبەتە رەنگە هەندێ جار لای خوێنەرانیان، یان هزرمەندێك، نرخ و توانای "وحی" یان هەبێت و بەو چاوە تەماشایان بکەن. لە راستیدا تیۆرە سیاسییەکان بەرهەمی فکری ئەو مرۆڤانەن کە لە پێناویاندا هەوڵ و تەقەلایەکی یەکجار زۆریان داوەو تەنانەت هەندێ تاقیکردنەوەی پڕووکێنەریشیان پشتسەرناوە. ئەو دۆعایەی سەرۆکی سوورپێستەکان کە ستیۆنسۆن باسی دەکا، لەراستیدا ئامانجی سەرەکی تیۆرە سیاسییەکانە. واتە ئامانجیان ئەوەیە کە رووناکی بخەنە سەر ئەو رێگە تاریك و پڕ لە بەردانەی کە لە پێشماندان.

## بۆ ئاگاداری زیاتر

**ئاگۆستین:** Saint Augustine قەشە ئاگۆستین. قەشەی شاری هیپۆن (٣٥٤-٤٣٠) گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە "شاری خوا" و "دا پێدانان".

**ئارمادای ئسپانیا:** ئاماژەیە بە شەڕی دەریایی ئسپانیا و بەریتانیا لە ساڵی ١٥٨٨ دا کە تیایدا هێزی دەریایی ئسپانیا بە تەواوەتی تێك شكێنرا.

**ئەرستۆ:** Aristotle فەیلەسوف یۆنانی (٣٢١-٣٨٢پ.ز)

**ئەفلاتوون:** Platon فەیلەسوف یۆنانی (٣٤٧-١٢٧پ.ز)

**ئاکویناس:** Aquinas تۆماس. فەیلەسوف ئیتاڵی (١٢٢٥-١٢٧٤)

**ئەنگلس:** Engeles فریدریش. سۆسیالیستی ئەڵمانی (١٨٢٠-١٨٩٥)

**سپینۆزا:** Spinoza باروخ. فەیلەسوف هۆڵەندی (١٦٣٢-١٦٧٧)

ستالین: Stalin جۆزیف ویسار یۆنۆڤیچ. رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێشوو (١٨٧٩-١٩٣٥)

شتراوس Leo Strauss نووسەری کتێبی "فەلسەفەی سیاسی چییە؟"

سکینێر: B.F.Skinner (١٩٠٤-.....) دەروونشیکاری رەفتارخوازی ئەمریکی.

بانگەوازی ئیلاهی: Daimon لە زمانی یۆنانیدا بە مانای بوونەوەری ئیلاهییە.

برێك: Edmund Burke (١٧٢٩-١٧٩٧) سیاسەتمەداری بەریتانی و یەکێکە لە نووسەرە سیاسییەکانی سەدەی هەژدەهەم و نەیاری سەرسەختی شۆڕشی مەزنی فەرەنسە بوو. کتێبە بەناوبانگەکەی "هەندێ تێڕامان سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسە"یە.

بەرنامەی نوێ: New Deal دەستەواژەیەکە یەکەم جار ریمۆندموولی سیاسەتمەداری ئەمریکی دەری بڕیوە، بۆ وەسف کردنی سیاسەتەکان و یاسادانانی یەکەم خولی سەرۆك کۆماری

ڕۆزڤڵت (١٩٣٣-١٩٣٧) بە کار دەهێنرێت، کە ئامانجیشی ئەوەبوو ئەمریکا لە کێشەکانی "قەیرانی گەورە" رزگار بکات.

بەهیمووس: Bahemoth یەکێکە لە کتێبەکانی تۆماس هۆبس. بەهیمووس وشەیەکی عیبرییە و بەواتای بوونەوەری زل و زەبەلاح دێت.

بیکەن: Francis Bacon فەیلەسوف و سیاسەتمەداری بەریتانی و دامەزرێنەری زانستی ئەزمونگەری.

بێنتام Jeremy Bentham (١٧٤٨-١٨٣٢) فەیلەسوفی ئاکار و تیۆری سیاسی - حقۆقی بەریتانی

پۆل تیلیش: Paul Tillich (١٨٨٦-١٩٦٥) زانایەکی خواپەرەست و فەیلەسوفێکی پرۆتستانی ئەڵمانی بوو. لە کتێبەکانی ئەمانەن" ئازایەتی "بوون"، "ئیلاهیاتی فەرهەنگ".

تاناتۆس: Thanatos لە ئەفسانەکانی یۆناندا "دەرکەوتنی مەرگ"،جمکە برای "خەو" (Hypnos). هیسیۆد دەڵێ تاناتووس بە بێباوك، لە "شەو"ەوە لە دایك بوە.

تۆماس پاین: Thomas Paine نووسەری کتێبی ماف مرۆڤ. (The Rights of Man. ١٩٧٣)

جان مینارد کینز: John Maynard Keynes (١٩٤٦-١٨٨٣)

جۆرج بێرناردشۆ: George Bermard Shaw نووسەری ئیرلەندی (١٩٥٠-١٨٥٦)

چەپی نوێ: تەوژمێکی سیاسیە کە لەدەیەی ١٩٥٠ دا ودوا بەدوای ناڕازی بوون لە چەپی کۆن سەری هەڵدا. چەپی نوێ ژمارەیەکی زۆری ڕەوتە سیاسییەکان دەگرێتەوە وەك، سۆسیالیزم، ئەنارشیزم، سەندیکالیزم، ترۆتسکیزم، مائۆییزم و کاسترۆییزم و....

دۆمستێر: De Maistre فەیلەسوف فەرەنسی و نەیاری سەرسەختی شۆڕشی فەرەنسە و دەسکەوتەکانی.

داروین: Darwin پزیشك و سروشت ناسی بەریتانی. "بنەڕەتی جۆرەکان" (اصل انواع) یەکێك لە کتێبەکانیەتی (١٨٠٢-١٧٣١)

دێکارت: Descartes رێنە. فەیلەسوف و ماتماتیك زانی فەرەنسی (١٦٥٠-١٥٩٦)

دیۆنۆسیۆس: یان "دیۆنۆسیۆسی ولات" (٤٣٠-٣٦٧ پ.ن) دیکتاتۆری شاری سیراکوز، لە بنەماڵەیەکی پلەنزم هاتە دنیاو دوایی چوە ناوسیاسەتەوەو داکۆکی لە چینی هەژار دەکرد، پاشان دەسەلاتی گرتە دەست (٤٠٠پ.ن)، ئەوە بوو هاوڕێکانی لەناوبردو بوو بە دیکتاتۆرێکی تەواو

رۆسۆ: Rousseau ژان ژاك. فەیلەسوف و نووسەری فەرەنسی (١٧١٢-١٧٧٨) "ئیمێل" لە کتێبەکانیەتی کە سەبارەت بە راهێنان و پەروەردەی منالان و مێرمنالانە.

رێکاردۆ. Ricardo دەیڤد. ئابووری زانی بەریتانی (١٧٧٢-١٨٢٣)

ریچارد هۆکد: Hooked Richard (١٥٨٦-١٦٤٧) خواپەرستی بەریتانی.

سان سیمۆن: Saint-Simon فەیلەسوف و بیرمەندی فەرەنسی (١٧٦٠-١٨٢٥) پێشەوای قوتابخانەی سیاسی و کۆمەلایەتی "سان سیمۆنییەکان"بوو.

سۆرێل: Sorel ژۆرژ. فەیلەسوفی فەرەنسی (١٨٤٧-١٩٢٢)

سەرمایە: Capital لە نووسینەکانی مارکسە و لە راستیدا گرنگترین کتێبی مارکسە.

سیملهۆڕەکە: Thirty Tyrants لە مێژووی یۆنانی کۆندا، لیژنەیەکی سی کەسی لە ئەریستۆکراتەکانی ئەسینا، لەدوای شەڕی پلۆپۆنزیدا (٤٠٤پ.ن) بە پشتیوانی ئسپارت، حکوومەتی ئەسینایان گرتە دەستکە کاریان هەڕەشەو تۆقاندن و جینایەت و مرۆڤ کوژی و داگیرکردنی سامان و دارایی خەڵك بوو.

شۆڕشگێڕە پارساکان: puritans پرۆتستانە توندڕەوەکانی ناوەوە دەرەوەی کڵێسەی بەریتانیا بوون کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ خاتوو ئەلیزابێتدا ڕێك نەدەکەوتن و خوازیاری چاکسازی کردنی زیاتر لە ناو مەزهەبدا.

شۆڕشی شکۆمەند: لە بەریتانیادا بە ساڵانی ١٦٨٨-١٦٨٩ دەڵێن کە بوە هۆی لەسەر کار لابرانی جیمزی دووهەم.

فرۆم: Erich Fromm نووسەری کتێبی "کۆمەڵگای بێخەوش" (١٩٦٧ The Sama Society).

فرۆید: Freud دەرونشیکاری ئۆتریشی، لە بنەماڵەیەکی جوولەکە لە دایك بوە (١٩٥٦-١٩٣٩). فرۆید لەوباوەڕەدابوو کە سەرچاوەی زۆربەی نەخۆشییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ناکامی سێکسی. تەوتەم و تابو گرنگترین کتێبیەتی.

فیۆرباخ: Feuerbach لودڤیك ئاندراس فەیلەسوفی ئەڵمانی (١٨٧٢-١٨٠٤)

فۆریـــە: Marie Fourier فەیلەســـوف و بیرمەنـــدی کۆمەڵایـەتی فەرەنسـی (١٨٣٧-١٧٧٢) سـاڵی ١٨٠٤ کتێبێکـی بەناوی "هاوئاهەنگی جیهانی" (Univer Harmonic) نووسـی و دەیویست ئامانجەکانی مرۆڤ بە ئاقارێکدا بەریت کە قازانجی تیابێـت. لـەو باوەڕەشـدا بـوو کـە "کـار" تـەنها ڕێگـەی بەختـەوەر بـوونی مرۆڤـە. فۆریـە بـە دامەزرێنـەری سۆسـیالیزمی خـەیاڵی (یۆتۆپیسم) لە قەڵەم ئەدرێت.

قـەیرانی ئـابووری سـاڵی ١٩٣٠: Great Depre Ssion. سـەردەمی دابـەزینی ئـابووری و بێکـاری بـەرفراوان کـە سـاڵانی نێـوان دوو شــەڕی جیهـانی بــە تایبــەت ســاڵانی ١٩٢٩-١٩٣٥ گرتبووەوە.

کارلایـل: carlyle تۆمــاس نووســەر و ئــەدیبی بــەریتانی (١٨٥١-١٧٩٥)

کاسـترۆ: Castro فیـدل. ڕێبــەری سیاسـی کووبـا (١٩٢٦-.....)

**کافکا:** Franz Kafka (١٨٨٣-١٩٢٤) ڕۆماننوسی چێك.

تـوخمی سـەرەکی ڕۆمانـەکانی کافکـا بـە تایبـەت لـە "کۆشـك و دادگاییکردن"دا، بیٚ شوناسـی و نـامۆبوون و دەستەوەسـتانی و نەهامەتییە.

**کانت:** Kant ئیمانۆئێل. فەیلەسوفی ئەڵمانی (١٧٢٤-١٨٠٤)

**کـانووت:** Canute. نـاوی شـەش کـەس لـە پاشـایانی دانیمارکـە کـە دوانیـان، پاشـای بـەریتانیاش بـوون. کـانووتی دووهـەم ناسـراوبە "مـەزن" (٩٩٤-١٠٣٥) شـای دانیماریـك و بەریتانیا بوو.

**کۆندرسـە:** Marquisde condorcet (١٧٤٣-١٧٩٤) ماتماتیـك زان و فەیلەسـوفی فەرەنسـی لـە سیاسـەتدا پێـڕەوی دیمۆکراسـی و کۆماری بـوو. کتـێبی "گەڵاڵەیـەکی مێـژوویی لـە پێشـکەوتنە ڕۆحییـەکانی مـرۆڤ"ی لـە سـاڵی ١٧٩٤دا نووسـی. پوختـەی بیروڕاکـانی لـەم کتێبـەدا بریتییـە لـە باوەڕمەنـدی بـە نەکامولی مرۆڤ و پێشکەوتنی هێدی هێدی مێژووی مرۆڤ.

**کۆنفسـیۆس:** (٥٥١-٤٧٩پ.ز) فەیلەسـوف و هزرمەنـدی چینی کـە بیروڕاکـانی، کاریگەرییـەکی زۆریـان لەسـەر سـەرجەم شارستانییەتی ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا داناوە.

کۆهن: Thomas Kuhn نووسەری کتێبی "پێکهاتەی شۆڕشەزانستییەکان" ( The structure of Scientific Revalution ١٩٧٠)

لوسەر: Luther مارتین. خێرخوازی ئەڵمانی و دەسپێکەری بزاڤی پرۆتستان (١٤٨٣-١٥٤٦)

لۆك: John Locke (١٦٣٢-١٧٠٤) فەیلەسوف بەریتانی. "لێکۆڵینەوەیەك لەسەر تێگەیشتنی مرۆڤ" بەناوبانگترین کتێبیەتی.

لویاتان: Leviathan کتێبێکە لەنووسینی تۆماس هۆبس (١٦٥١) کە نووسەر تیایدا پرەنسیپەکانی سانسوالیزم، ماتریالیزم، قازانجخوازی و دیکتاتۆرییەتی روون کردۆتەوە.

لیپمەن Walter Lippmann نووسەری کتێبی "فەلسەفەی کۆمەڵگا" (The public philosophy ١٩٥٦)

مارکس: Marx کارل هاینریش. فەیلەسوف و کۆمەڵناسی ئەڵمانی (١٨١٨-١٨٨٣)

**مارکۆزە:** Herbert Marcuse نووسەری کتێبی "مرۆڤی تاك رەهەند" لە ساڵی ١٩٤٦ دا.

**مەدیسۆن:** James Madison (١٧٥١-١٨٣٦) چوارەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا (١٨٠٩-١٨١٧) ئەندامی کۆنگرەی پەنابەران و نووسەری سەرەکی یاسای بنچینەیی ئەمریکا بوو و، بە نووسینی وتارەکانی، هەوڵی دابێتە پەسەندکردن. رۆڵێکی سەرەکی لە جێگیرکردنی فەلسەفەی سیاسی حکوومەتی ئەمریکا دابینیوە.

**بڵاوکراوەی ماف:** Bill of Rights یەکێکە لە گرنگترین بەڵگەکانی یاسای بنچینەیی بەریتانیایە کە مادەکانی دەورێکی زۆریان هەبوە لە کامڵ بوونی یاسای بنچینەیی هەردوو وڵاتی بەریتانیا و ئەمریکادا.

**میلتۆن فریدمەن:** Milton Freedman (....-١٩١٢)

**واڵتەر:** Voltaire فرانسوامارى ئارۆئە. فەیلەسوف و نووسەری فەرەنسی (١٦٩٤-١٧٧٨)

**ڤیبەر:** Weber ماکس ڤیبەر، کۆمەڵناسی ئەڵمانی (١٨٦٤-١٩٢٠)

وتارگەلی فدرالیست: The Federalist papers.
لەخۆگری ٨٥ وتاری ئەلکساندر هەمیلتۆن (١٧٥٧-١٨٠٤) جیمز مەدیسۆن (١٧٥١-١٨٣٦) و، جان جەی (١٧٤٥-١٨٢٩) کە نێوان سالأنی ١٧٨٧ تا ١٨٨٨ دا نووسراون. ئەم کتێبە یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی ئەمریکایە لە بواری تیۆرە سیاسییەکاندا.

هۆبس: Thomas Hobbes (١٥٨٨-١٦٧٩) فەیلەسوف بەریتانی "لویتان" بەناو بانگترین کتێبیەتی.

هەمیلتۆن: Alexander Hamilton (١٧٥٧-١٨٠٤) سیاسەتمەداری ئەمریکی لایەنگری داخوازەکانی نەتەوە پەرستان و هەروەها یەکێك بوو لە جەنگاوەرەکانی شۆڕشی ئەمریکا.

هێگڵ: Hegel گیۆرگ ویلهۆلم فریدریش، فەیلەسوف ئەڵمانی (١٧٧٠-١٨٣١)

هیتلەر: Hitler. ئادۆلۆف. دیکتاتۆری ئەڵمانی و دامەزرێنەرو ڕێبەری ناسیۆنال سۆسیالیزم (١٨٨٩-١٩٤٥)

هیــۆم: Hume فەیلەســوف و مێژوونووســی ئیســکاتلەندی (١٧٧٦-١٧١١)

یەکسـانیخـوازان: Levellers پێدەچێت سـاڵی ١٦٤٧ ئـەم ناوەیـان لـێنرابێـت. چونکە باوەڕیان بـە دامەزرانـدنی یەکسانی و بەرابەری کۆمەڵایەتی هەبوو. ڕێبـەری ئەم بزاڤە. ج.لیـبرێن بـوو و ئامـانجی سەرەکیشـی یەکسـانی تـەواوی ئـاینی و سیاسـی بـوو. ساڵی ١٦٤٩ لە لایەن کرامولەوە سەرکوتکران.

# واژەنامە

| کوردی | فارسي | ئینگلیزی |
| --- | --- | --- |
| ئابووری پیشەسازی | اقتصاد صنعتي | Industrialeconomy |
| ئاستی کۆمەڵایەتی | سطح اجتماعي | Social level |
| ئاکار | اخلاق | Moral - ethics |
| ئامانجخوازی . ئایدیالیزم | آرمانگرايي | Idealism |
| ئایدیال، ئامانج | آرمان | Ideal |
| ئەرزش، بەها | ارزش | Value |
| بەهای رەها | ارزش | Absolute Value |
| ئەرستۆکرات | اعيان- اشراف | Gentry |
| ئیستدلال | استدلال | Reasoning |
| ئیرادە | اراده | Will |
| مرۆڤی سیاسی | انسان سياسي | Homo-politicus |
| بارودۆخی ژیان | شرايط زندگي | Life conditions |
| باردۆخی کۆمەڵایەتی | اوضاع اجتماعي | Social condition |
| پشێوی | آشفتگي، نابساماني | Chaos |
| بزاڤ، جوڵانەوە | نهضت | Movement |
| باڵا | عالي ــ متعالي | Archetype |
| بالقوە | بالقوّه | Potential |
| بگۆڕ- گۆڕاو | متغّير | Variable |
| بەرژەوەندییە چینایەتییەکان | منافع طبقه اي | Class interests |
| بەرهەم هێنان | توليد | Productiom |
| بەخۆ نامۆبوون | بيگانگي با خود | Alienation from |

| | | |
|---|---|---|
| بەدیهاتن | تحقق یافتن | self Actualization |
| بەدەزگاییکردن | نهادي كردن | Institutionalazation |
| بەشداری کردن | مشاركت | Participation |
| بەکۆمەڵایەتی بوون | اجتماعي شدن | Socialization |
| بەهای کۆمەڵایەتی | ارزش اجتماعي | Cocialvalue |
| پاساو هێنانەوە | توجيه | Justification |
| سیکۆلۆژی- دەرونناسی | روانكاوي | Psychologism |
| پاشایەتی مەشرووتە، پاشایەتی دەستوری | سلطنت مشروطه | Parliamentary monarchy |
| پاشایەتی تاکەکەسی | سلطنت فردي | Autocracy |
| پەرچەکرداری | كنش متقابل | Inter-action |
| پێشکەوتن | ترقي - پيشرفت | Progress |
| پیرۆز | مقدس | Sacred |
| پێکهاتەی ئابووری | ساخت اقتصادي | Economic Structure |
| پێکەوە ژیان | همزيستي | Symbiosis |
| پێگەی کۆمەڵایەتی | پايگاه اجتماعي | Social –status |
| پێوەندی کۆمەڵایەتی | ارتباط اجتماعي | Social communication |
| پێشگویی کردن | پيشگويي | Prophecy |
| توند و تیژی | خشونت | Violence |
| تەبایی | انطباق | Adaptation |
| تەجروبی، ئەزمونگەریی | تجربي | Empirical |
| تەکامولّ | تكوين - تكامل | Evolution |
| تەمسیل (لەلۆژیکدا) | تمثيل (در منطق) | Analogy |
| تێکەڵ بوونی رەگەز | اختلاط نژاد | Amalgamation |

| | | |
|---|---|---|
| هەڵاواردن،جیاوازی قایل بوون | تبعيض | Discrimination |
| جیاواز | متمايز – متفاوت | Differentiated – |
| چڕبوونەوە، چەقێتی | تمركز | Centralization |
| کەڵەکەبوون | تراكم | Concentration |
| چەمکی ئەبستراکت | مفهوم انتزاعي | Abstract concept |
| چەوساندنەوە | استثمار | exploit |
| توێژی کۆمەڵایەتی | قشر اجتماعي | Social Stratum |
| چییەتی | ماهيت | Essence |
| حاشا هەڵنەگر. حەتمی | اجتناب ناپذير | Inevitable |
| حەقیقەتی رەها | حقيقت مطلق | Absolute |
| حکوومەتی دیکتاتۆری | حكومت استبدادي | Absolulism |
| خراپکاری. ئاژاوەنانەوە | خرابكاري – ويرانگري | Sabotage - criminality |
| خورافات | خرافات | Prejudices |
| خود | خود | ego |
| خەڵکی رەمەکی | عامة مردم | Plebs |
| خەڵکی رەمەکی، رەشۆك | عوام – تودة مردم | rabble |
| خەیاڵی | خيالي – رؤيايي | dreamer |
| خێڵ | قبيله | Tribe |
| داب و نەریت | آداب و رسوم | Mores |
| داگەران | گرايش | Tendency |
| دادوەر | داور – قاضي | Dicastes |
| داهێنان | آفرينش | Creation |
| داهێنەر | خلاق – آفريننده | creative |
| دۆزینەوە | اختراع | Invention |

| | | |
|---|---|---|
| دژایەتی | تضاد | Contras |
| دژوازی | تناقض | Contradiction |
| دژە کۆمەڵایەتی | ضد اجتماعي | Antisocial |
| دەروون شیکاری | روانکاوي | Psychologism |
| دەزگا، دامەزراوە | نهاد | Institution |
| دەسەڵات | اقتدار | Authority |
| دەسەڵاتداریتی، فەرمانڕەوایی | حاکمیت | Sovereignty |
| دەستێوەردان | مداخله | Intervention |
| دەسەڵاتیرەها | قدرت مطلق | Absolute power |
| دەسەڵات خواز، داگیرگەر | تسلط طلب – سلطه‌جو | Authoritarian |
| دەستنیشان کردن | تشخیص | diagnosis |
| دیاردە | پدیده | Phenomenon |
| دەسنیشان کردن | تشخیص | diagnosis |
| ڕاوەستان - وەستان | رکود | Stagnation |
| ڕای گشتی | افکار عمومي | Publicopinion |
| ڕەوایی | مشروعیت | Legitimite |
| ڕێژەیی بوون | نسبیت | Relativity |
| ڕۆشنبیران | روشنفکران | Intelligentsia |
| ڕۆشنبیر | روشنفکر | intellectual |
| ڕەفتاری باو | رفتار رایج | Usage |
| ڕێکخستن | سازماندهي | Structuration |
| ڕەفتاری کۆمەڵایەتی | رفتار اجتماعي | Social communication |
| ریفۆرم خوازی | اصلاح طلبي | Reformism |
| ڕەگەز | نژاد | Race |
| ڕێژەیی | نسبي | Proportional |
| ڕێگر - لەمپەر | مانع | restraint |
| ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی | سازمان اجتماعي | Social |

| | | |
|---|---|---|
| زەنجیرەی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی | سلسلە مراتب اجتماعي | organization Socialhierarchy |
| زاوزێ | زاد و ولد | Natality |
| زەرورەت | ضرورت ـ لزوم | Necessity |
| زەرورەتی مێژوویی | ضرورت تاريخي | Historical |
| زەرورەتی عەینی، بابەتی | ضرورت عيني | objective |
| ژێرخان | زيرساخت ـ شالوده | İnfra-structure |
| جوانناسی، ئیستاتیکا | زيبايي شناسي | Aesthetics |
| سیاسەتمەدار | ديپلمات | Diplomat |
| سستی، کەموکوڕی | ضعف ـ سستي | flop |
| سەلماندن | اثبات كردن | Demostration |
| سەقامگیرکردن | تثبيت | Stabilization |
| سەرمەشق | الگو | Pattern |
| سەندیکا | صنف | Syndicate |
| سەرکوت کردن | سركوب | Repression |
| شۆڕشی پیشەسازی | انقلاب صنعتي | Industrial revolution |
| شایستەیی . لێهاتوویی | شايستگي ـ لياقت | Abequacy |
| شاراوە | مضمر | |
| شەڕاشۆیی . شەڕەنگێزی | پرخاشگري | Aggressiveness |
| شەڕاشۆ | پرخاشگر | Aggressive |
| شەڕخوازی | جنگ طلبي | Comba ativeness |
| شارستانییەت | تمدن ـ مدنيت | Civilization |

| English | عربي / فارسي | کوردی |
|---|---|---|
| Affective | عاطفي | عاتیفی، سۆزاوی |
| rational | مجردانه - عاقلانه | ئەقلانی |
| Abondance | وفور - فراواني | فراوانی |
| pluralism | كثرت - كثرت گرايي | فرەیی |
| virtus | برتري - اولويت | فەزیلەت ـ لە سەروو بوون |
| Absolute philosophy | فلسفة مطلق | فەلسەفەی ڕەها |
| Crisis | بحران | قەیران |
| Cocial crisis | بحران اجتماعي | قەیرانی کۆمەڵایەتی |
| Economic crisis | بحران اقتصادي | قەیرانی ئابووری |
| Sociology | سوسيولوژي | کۆمەڵناسی . سۆسیۆلۆژی |
| Conflict | كشمكش | کێشمەکێش ـ ناکۆکی |
| Crowd | انبوه خلق، توده مردم | کۆمەڵانی خەڵك |
| tautologe | زبان بازي | کایەی زمانی، زمانبازی |
| Functionalist | كاركردگرا | کارکردخواز |
| Class-less-society | جامعه بيطبقه | کۆمەڵگای ناچینایەتی |
| Action | عمل | کردە |
| Conservatis | محافظه كار | کۆنەپارێز |
| Slavery | برده داري | کوێلەداری |
| Social pressure | فشار اجتماعي | گوشاری کۆمەڵایەتی |
| Development | توسعه | گەشەسەندن |
| Corps | دسته | گرووپ |
| Dependenc | وابسته | گرێدراو |

| | | |
|---|---|---|
| گریمانە | فرضیە ـ مفروض | Assu mption |
| گواستنەوە | انتقال | Transfer |
| گوشار، جەبر | اجبار | Compulsion |
| گۆشەگیری | انزوا | Isolation |
| گشتێتی | کلیت | Totality |
| گۆڕان | تبدیل شدن | Transformation |
| لاڕێ، کوێرەڕێ | بیراهە ـ کورەراە | |
| لادانی کۆمەڵایەتی | انحراف اجتماعي | Social deviation |
| لیژنە | هیأت - انجمن | Configuration |
| مانەوە | بقاء | Survie |
| ململانێی چینایەتی | مبارزة طبقاتي | Class struggle |
| ملهوڕ ـ زۆردار | جبّار ـ ظالم | Authoritative |
| مەیل | انگیزە | Affection |
| مەحافیزەکاری | محافظە کاري | concervatism |
| میتۆد | روش | Method |
| ناهاوچەشنی | ناهمگوني | Heterogeneity |
| نامۆبوون | بیگانە شدن | Alienation |
| نامومکین- مەحاڵ | ناممکن | Hon-pussumus |
| نوخبە- دەستەبژێر | سرآمد، برگزیدە | Elite |
| نەتەوە | ملّت | nation |
| نەزمی کۆمەڵایەتی | نظم اجتماعي | Social order |
| نۆرم - نۆرماتیڤ | هنجار ـ هنجاري | Norm – Normative |
| وابەستەیی | وابستگي | Dependency |
| واقعییەتی ڕەها | واقعیّت مطلق | Absolute reality |
| واقیع گەرا- ریالیستی | واقعگرا | realist |

| | | |
|---|---|---|
| هۆشیاری چینایەتی | آگاهي طبقاتي | Class consciousneess |
| وەرگۆڕان | دگرگوني، تحول | change |
| وەرچەرخان | چرخش | Rotation |
| وێکچوون | شباهت | affinity |
| هاوچەشنی | همگوني | Homogeneity |
| هاندەر–بزوێنەر | محرك | Mover |
| هەست پێکراو | ملموس | Tangible |
| هاووڵاتی | شهروند | Citizen |
| هۆکار | علّت | Cause |
| هەڵوەشانەوە | از هم پاشيدگي | Decomposition |
| هەڵکشان و داکشانی ئابووری | نوسان اقتصادي | Economic fluctualion |
| هەیەجان | هيجان | Emotion |
| ناچالاك | آرامش طلب | Pasifist |
| هێزە کۆمەڵایەتییەکان | نيروهاي اجتماعي | Social-forces |
| هێزە سیاسییەکان | نيروهاي سياسي | Political - forces |
| هەڵێنجانی بەراوردکارانە | استنتاج قياسي | Extrapolation |
| هۆکار– فاکتەر | عامل | Factor |
| هاوسەنگی کۆمەڵایەتی | تعادل اجتماعي | Social eguilibrium |
| هەڵکەوت– ڕێکەوت | تصادفي ـ اتفاقي | Aleatory |
| هاوڕایی | همفكري | Syncretism |
| یاسادانان | قانونگذاري | Legislation |
| یاسای ئەساسی– دەستور | قانون اساسي | Constitution |
| یۆتۆپیا | آرمان شهر – مدينه فاضله | utopia |

## سەرچاوەکان:


١. Scheldon S.Wolin, political Theroy as a vocation, American political science١٩٦٩

٢. Eric vogelim, the new science of political (chicago ١٩٢٥)

٣. William T.Bluhm Theory of political system, (Englewood, califfs.N.J.prentice Hill, ١٩٦٥)

٤. Thomas Hobbes, leviathan, (N.Y:E.P.dutton ١٩٥٠)

٥. Michael oakeshott, introduction to the leviathan (oxford, Basil Blak well, ١٩٧٤)

٦. Herbert Marcuse One Dimensional Man, (Boston ١٩٦٤)

٧. Glenn Tinder political Thinking, the perennail Questions, ٢nd ed. (Boston ١٩٧٤)

٨. Leo Strauss. Wath is political philosophy? (N.Y. free press, ١٩٥٩)

٩. Abraham caplan The conduct of Inqiry (San Froncisco, chandler ١٩٦٤)

١٠. Thomas Kuhn The struture of scientific Revolution, ٢nd ed. (chicago, ١٩٧٠)

١١. Charles Tayloy, "Neutrality in political science" in laslette and runciman, eds, philosophy, politics and society (N,Y, ١٩٦٧)

١٢. Stephen Toulmin, Human understanding, (primceton, N,J,١٩٧٢)

١٣. David Easton, The political system, (N,Y. knopf ١٩٧١)

١٤. سەبارەت بەدەستنیشان کردنی "ئایدۆلۆژیای نادیار" بڕوانە
Robert E. political Ideology (N.Y. ١٩٦٢)

١٥. Quote by Daniel Boorstin Genius Americon politics, (chicago ١٩٥٣)

١٦. Louis Hartz, The liberal Tradition in America (N.Y. harcourt Brace, ١٩٥٥)

١٧. Lillian Smith Killers of the Dream (N.Y. ١٩٦٣)

١٨. Leo Strauss, persecution and the Art of writing (N.Y. The free press ١٩٥٢)

١٩. Edmund cahn, The Sense of Injustice (Lndiana ١٩٤٥)

٢٠. Walter Lippmann The public philosophy (N.Y. ١٩٥٦)

٢١. Susanne K. Langer philosophy in a New Key (N.Y. ١٩٥١)

٢٢. George Sabine, A History of political Theory (N.Y. ١٩٥٠)

٢٣. Thomas Hobbes, Behemoth, (N.Y. ١٩٦٣)

٢٤. John loke, Second Trealise of civil government true origin Extent and End of civil Government.

٢٥. Edmund Burke Reflections on the Revolution in Frence (N.Y. ١٩٥٥)

٢٦. Robert Tucker, Marx-Engles Reader (N.Y. ١٩٧٢)

٢٧. Kar Marx, Economic and philosophical of ١٨٤٤.

٢٨. Jeam-Jacques Rousseau, The social contract (N.Y. ١٩٥٠).

٢٩. " بڕوانە بۆ: Apologyبۆ خوێندنەوەی راڤەکارییەکی "
Plato, Apology tran by F.J. church (indianapolis, ١٩٥٨)

٣٠. Erich Fromm, The Sana Society (N.Y. ١٩٦٧)

٣١. Robert Tucker, philosophy and Myth in karl Marx (carnbridge, England, ١٩٨٤).

٣٢. Peter Berger "Between System and Horde" in Berger and Neuhaus Movement and revolution (١٩٧٠)

٣٣. Richard Neuhaus "The Thorough Revolutionary".

٣٤. Herbert Marcuse, Eros and civilization (N.Y.١٩٥٦).

٣٥. Mechael P.lerner, The New socialist Revolution (N.Y. ١٩٧٣).

٣٦. Thomas paine, The Rights of Man (N.Y. ١٩٧٣)

٣٧. Marin Luther "Secular Authority: To what Extent Should b obeyed?" in wiliam Ebenstein, great political Thinker (N.Y.١٩٦٠)

٣٨. Hobbes English works, ed wiliam Moles worth (london ١٨٣٩).

٣٩. Sigmund Freud civilization and Its Discontents, Trans. James Strachey (N.Y. ١٩٦٢).

٤٠. Aristotle physice

٤١. Aristotle Ethics

٤٢. Aristotle politics

٤٣. Jean-jacques Rousseau, Discourse/on the origin ofinequality (N.Y. ١٩٥٠).

٤٤. Cited Fred H.Willhoite jr. "Ethology and the Tradition of political Thought," journal of politics (١٩٧١)

٤٥. Edward banefield The unheavenly city (boston ١٩٦٣)

٤٦. Henri de Simon, The Reorganization. Of the European community, The Science of Mam and other writing, Felix Markham (N.Y. ١٩٦٤).

٤٧. Shelon Wolin, politcs and Experience (cambrige, ١٩٦٨)

٤٨. Paul Tilich, utopia and utopian Thought (boston, ١٩٦٦)

٤٩. Michael Polany, The Tacit Dimension (N.Y. ١٩٦٦)

٥٠. Konrod Lorens, on Aggression, Trans. Morjorie Kerr (N.Y. ١٩٦٦)

٥١. Robertjay Lifton Revolutionary innorTality (N.Y. ١٩٦٨)

٥٢. Theodore Rozak, The Making of a counter-culture (N.Y. ١٩٦٩)

٥٣. Edmund Stillman and william pfaff, The politics of Hysteria (N.Y. ١٩٦٤)

٥٤. Michael Oakeshott, Rationalism in politics (N.Y. ١٩٦٢)

٥٥. James Madison "The Federalist ١٠", in the Federalist paper٨ (N.Y. ١٩٦١)

٥٦. Korl Marx, The German idiology, in the Marx Engles Reader, Robert Tueker (N.Y. ١٩٧٣)

٥٧. R.G.Colling wood, The New leviathan (oxford ١٩٤٢)

٥٨. David Hume Atrealise of Human Nature. Book٣, pare١.

٥٩. Karl Marx in Robert Tucker The Marx-Engels Reader (N.Y. ١٩٧٢).

٦٠. Bernard Berelson. Paul lazarsfeld wiliam mc phee voting (chicago, ١٩٥٠)

٦١. بـــۆ خوێندنـــەوەی زیـــاتر ســـەبارەت بـــە "کەمتەرخـــەمی بەرانبـــەر زانســـتی سیاسی"بڕوانە:

Peter lastett, W.G. Runciman, philosophy, politics and society (N.Y. ١٩٧٦)

٦٢. J.W.N. Watkins, Hobbes system of ideals (london, ١٩٦٥=

## بەرهەمەکانی تری وەرگێڕ:

١ . هەشت نامە ـ گۆنتەرگراس، کینزابۆرۆئە ـ لەگەڵ شۆڕش جوانرۆیی ـ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ـ ٢٠٠٢

٢ . فێربین چۆن بەسەر ترس و دڵەڕاوکێی خۆماندا زاڵ بین ـ جۆرج باربارن ـ لەگەڵ شۆڕش جوانڕۆیی ـ بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ ـ ٢٠٠٢

٣ . نامەیەك دەربارەی لێکبووردن ـ جۆن لۆك ـ لەگەڵ شۆڕش جوانڕۆیی ـ خانەی وەگێڕان ـ ٢٠٠٤

٤ . دامەزرێنەران و سەرهەڵدانی کۆمەڵناسی ـ د.بوتول ـ (چاپ نەکراوە)

٥ . جیهانی راستەقینەی دیمۆکراسی (چاپ نەکراوە)

٦ . فەرهەنگی زاراوەکانی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان ـ ئینگلیزی ـ فارسی ـ کوردی (چاپ نەکراوە)

## زنجیرەی بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان لە ساڵی ٢٠٠٤

| ناوی کتێب | زمان | نووسەر | بابەت | ساڵی دەرچوون | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|---|
| بیرەوەرییەکانی هەڵەبجە | کوردی | بەکر حەمە صدیق | مێژووی | ٢٠٠٤ | بەکرحمە صدیق/ کورد<br>دلێرمیراز/ فارسی<br>م. حسن عبدالکریم/ عەرەبی<br>فوئاد تاهیر/ ئینگلیز |
| رەهەندەکانی ناسیۆنالیزم | فارسی | کۆمەڵێ نووسەر | نەتەوەیی | ٢٠٠٤ | ئارام جمال |
| ریفراندۆم باشترین شێوازی خەباتە | سویدییەوە | تۆم گولبێری | سیاسی | ٢٠٠٤ | ئیدریس ئیبراهیم |
| شانۆی پانتۆمایم | عەرەبی | بورهان قەرەداخی | شانۆی | ٢٠٠٤ | بورهان قەرەداخی |
| گوڵەزەر | عەرەبی | جەنگیز ئیمتاتۆف | رۆمان | ٢٠٠٤ | جەوهەر کرماج |
| پاژنەی ئاسنین | عەرەبی | جاك لەندەن | رۆمان | ٢٠٠٤ | کەمال غەمبار |
| خەناوکەیەك بۆ سەر میناز | فارسی | ئەحمەدخان ئەبوبەکر | رۆمان | ٢٠٠٤ | ئەبوبەکر خۆشناو |
| ئەندامێکی میت | تورکی | محەمەد ئەیمور | سیاسی | ٢٠٠٤ | ئارام عەلی عەزیز |
| کورتترین رێگەی سەرکەوتن | فارسی | رۆبێرت ئۆریلی | دەروونناسی | ٢٠٠٤ | سالار عەبدلرەحمان |
| کۆماری مهاباد | کوردی | عەبدوڵڵا ئەحمەد رەسول | مێژوویی | ٢٠٠٤ | سەلمان عەلی |
| چوار وتاری شیشرۆن | فارسی | رحمەت الله مقدم مراغەی | فەلسەفی | ٢٠٠٤ | شۆرش جوانرۆی- کامل ئەحمەد بەگ |
| جوغزە گەچینە | عەرەبی | بریخت | شانۆ | ٢٠٠٤ | عومەر عەلی ئەمین |
| نیوەکەی تری جیهان | عەرەبی | چەند نووسەرێکی بیانی | چیرۆك | ٢٠٠٤ | نوری سەعید قادر |
| مافەکانی ژن لەدەتێیکەوە | فارسی | نای بن سەعدون | رۆشنبیری | ٢٠٠٤ | کارزان محەمەد |
| بەناو ئیسلامەکان | عەرەبی | د.رەفعت ئەلسەعید | فیکرییە | ٢٠٠٤ | حەسەن عبدالکریم |
| سەرچاوەکانی زانی و نەزانی | فارسی | کارل پۆپەر | فیکرییە | ٢٠٠٤ | ناسر سەلاحی |
| دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی | فارسی | ئەنتۆنیۆ گرامشی | فیکرییە | ٢٠٠٤ | مامەند |
| کاریگەریی هەڵچوون | عەرەبی | هیمداد مەجید عەلی | یاساییە | ٢٠٠٤ | دلێر میرزا |
| خاکەکە ماچ کە | ئینگلیزی | ئەلیزابێث لایارد | رۆمان | ٢٠٠٤ | عەزیز گەردی |
| ئازارەکانی هونەرمەندێك | عەرەبی | یوسف رانسیس | هونەرییە | ٢٠٠٤ | ئاری بابان |

| جینۆساید لە عێراقدا | ئینگلیزییەوە | میدڵ ئیست ووچ | سیاسییە | ٢٠٠٤ | محەمەد حەمەسالح تۆفیق |
|---|---|---|---|---|---|
| لۆکاچ | فارسییەوە | ئیمری جورج | فیکرییە | ٢٠٠٤ | مەنسوری تەیفووری |
| ئەلف و بێ کوانتەم | ئینگلیزی | ف. ریدنیک | فیزیایی | ٢٠٠٤ | د. بایەزید حسن عبدالله |
| قبور غیر هادئە | ئینگلیزی | هیومان رایتس | دمافی مرۆڤ | ٢٠٠٤ | محمد حمە صالح توفیق |
| هونەری جەنگ | عەرەبی | سون- تزو | عەسکەریی | ٢٠٠٤ | رئووف حەسەن |
| لەنێو دڵی شانۆدا | | | شانۆیی | ٢٠٠٤ | مەحمود زامدار |
| یەکبوونی قەومی کوردو ماد | فارسی | حەبیبوڵلای تابانی | فارسی | ٢٠٠٤ | جەلیل گادانی |
| گۆڕینی رژێم | ئینگلیزی | کریستۆفەر هیچنس | مافی مرۆڤ | ٢٠٠٤ | محمد حمە سالح |
| ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی | ئینگلیزی | نادر ئینتیسار | نەتەوایەتی | ٢٠٠٤ | عەتا قەرەداخی |
| ئەخلاقی رۆژنامەگەریی | عەرەبی | د. حسن عماد مکاوی | لێکۆڵینەوە | ٢٠٠٤ | مەم بورهان قانع |
| کۆمۆنیزمی ئەوروپایی | ئەڵمانی | ڤۆلگانگ لیۆنهارد | سیاسی | ٢٠٠٤ | د. کوردۆ عەلی |
| رێنیسانس | عەرەبی | د.کمال مەزهەر | لێکۆڵینەوە | ٢٠٠٤ | فوئاد مجید میسری |
| ژنانە یاری بکەو پیاوانە بیبەرەوە | فارسی | گیل ئیڤانس | دەروونناسی | ٢٠٠٤ | شەیدا سەلاح |
| عیراق و بەردەوامی قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست | ئینگلیزی | د. ئەوان و. ئەندرسن د. خەلیل. ه. رەشیدیان | سیاسی | ٢٠٠٤ | فوئادی تاهیر سادق |
| ئاسیا لەبەرامبەر خۆرئاوادا | فارسی | داریوشی شایگان | فکری | ٢٠٠٤ | شۆرش جوانرۆیی- مامەند رۆژە |
| بەفر | فارسی | ماکینس فێرمین | رۆمان | ٢٠٠٤ | ئازاد بەرزنجی |
| شانۆگەری تارماییەکان | ئینگلیزی | هێنریک ئبسن | شانۆگەری | ٢٠٠٤ | عەتا قەرەداخی |
| مشێل ئێرانییەکان چۆن بیر ئەکەنەوە؟ | فارسی | میشیل فۆکۆ | وتار | ٢٠٠٥ | هەژار جوانرۆیی |